# فەرهەنگی شیکارانەی زاراوەی ئەدەبی

## ئەدەب، ڕەخنەی ئەدەبی، تیۆری ئەدەبی

**کوردی - ئینگلیزی**

بەرگی یەکەم
پیتی (ئـ) تا کۆتایی (جێ)

بەختیار سەجادی     محەمەد مەحموودی



ناوی کتێب: فەرهەنگی شیکارانەی زاراوەی ئەدەبی – ئەدەب، ڕەخنەی ئەدەبی، تیۆری ئەدەبی
بەرگی یەکەم: پیتی (ئـ) تا کۆتایی (جێ)
دانانی: بەختیار سەجادی و محەمەد مەحموودی
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٣٢٩
دەرهێنانی هونەریی ناوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: دلشاد مستەفا + هندرێن شێرزاد
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم: هەولێر- ٢٠٠٤
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٤٣٦)ی ساڵی ٢٠٠٤ی دراوەتێ

# پێشەکی

دوو ساڵ لەمەوبەر کتێبێکمان بەناوی فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی بڵاوکردەوە کە تێیدا هاووتای زۆرتر لە سێ هەزار زاراوەی ئەدەبی و پێوەندیدار بەرەخنە و تیۆری ئەدەبییەوە دانرابوو. لە پێشەکیی هەمان کتێبدا باسێکمان لەسەر پێویستی وەها هەوڵگەلێک و تەنگ و چەڵەمەگەلی سەر ڕێگای بەئەنجام گەیاندنی وەها بەرهەمگەلێک وروژاندبوو، پەنجەشمان خستبووە سەر هەندێ تایبەتمەندی و گرفت و پۆلێنکاری و ئاماژەی پێویست. کتێبی ناوبراو لەلایەکەوە بەهەوڵێکی باش لە قەڵەم دەدرا و، لەلایەکی تریشەوە دوو خاڵی لاوازی لەخۆ گرتبوو. هەوڵێکی باش بوو لەبەرئەوەی یەکەم جار بوو لە زمانی کوردیدا قامووسێکی تایبەت بەزانستە ئەدەبییەکان و بەتایبەت ڕەخنە و تیۆری ئەدەبی بەدوو زمانی کوردی – ئینگلیزی بڵاو وئەکرایەوە و، قامووسێکی بڕواپێکراویش بوو لەبەرئەوەی کە ئێمە بۆ خۆمان بەشێوەیەکی پسپۆڕانە خەریکی کاری ڕەخنە و تیۆری ئەدەبین. بەڵام دوو خاڵە لاوازەکەی ئەو کتێبە بریتی بوون لەمەی کە یەکەم ئەو فەرهەنگە شیکارانە نەبوو؛ واتە زاراوەکان پێناسە و شیکاری نەکرابوون و، دووەم ئەوەی کە هاووتای کوردیی هەندێ لە زاراوەکان بەشێوەیەکی تەواو ڕاستەقینە دانەندرابوون. لەم بەرهەمەی بەردەستدا کە پێنج پیتی (ئـ) تا کۆتایی (جێ)ی لەخۆ گرتووە و هەوڵ دراوە هەردوو خاڵە لاوازەکە چارەسەر بکرێ. لە پاڵ ئەمەشدا، پێویستە قامک بخەینە سەر ئەو ڕاستییەش کە کاریکی لەم چەشنە لە بنەڕەتدا کار و پرۆژەی بەکۆمەڵی گروپێکی پسپۆڕە کە ژمارەیان لەوانەیە لە سەد پسپۆڕ تێپەڕێ و، ئەو خوێنەرانەی بەشێوەیەکی جیددی خەریکی توێژینەوەی زانستە ئەدەبی و تیۆریکەکانن لە ڕێگەی خوێندنەوەی قامووسە جیاجیاکانەوە بەتەواوی لەم خاڵە تێ گەیشتوون. ئێمەش، پاش دوو ساڵ توانیمان پێنج پیت لەم پرۆژەگەلە گرنگە تەواو بکەین؛ هەڵبەت ئەوەش بڵێین کە ئەم کارە زۆری ماوە و بێگومان لە دوا قۆناخی خۆیدا و کاتێ هەموو بەرگەکانی بڵاوبوونەوە، بەشێوەیەکی دی و بەفۆرم و ڕووخسارێکی ترەوە و بەو جۆرەی لە فەرهەنگەکانی ئێستای جیهاندا باوە بڵاو دەکرێتەوە. لە ماوەی ئەو دوو ساڵەشدا هەندێ بەرهەمی لەم چەشنە کەوتوونەتە نێو



بازاڕەوە کە زۆربەی هەرە زۆر یان لێواولێون لە هەڵەی جۆراوجۆری زانستی و زماننناسانە و لەلایەن کەسی ناشارەزا و بەپەلەوە چاپ کراون و زیاتر تیشکیان خستۆتە سەر بەکارهێنانی زاراوە عەرەبی و ئینگلیزی و فارسییەکان و یاخود لە سەرچاوە عەرەبییەکان سوودیان وەرگرتووە. بەو هیوایەین هەوڵەکان قووڵتر و درێژخایەنتر بینەوە و لە ئەنجامدا بتوانین ببین بەخاوەنی زمانێکی زانستیی یەکگرتوو و پاراو.

بەختیار سەجادی و محەمەد مەحموودی

سنە، زستانی ١٣٨٢ی هەتاوی – ٢٠٠٤ی زایینی

# ئـ

**ئاپۆریا** — **aporia**

ئاپۆریا لە بنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانییە و لە زانستی کەلام -ەوە هاتۆتە ناو ڕەخنەی ئەدەبییەوە. ئەم هونەرە، کە لە کەلامی سوقراتیدا ڕواڵەتی دژایەتیەکی وشک لەخۆ ئەگرێ، لە یۆنانی کۆندا ئەو هونەرە بوو کە بێژەر یان کەسێتییەکی شانۆیی لە لێدوان و قسەکانیدا پرسیارێکی دژوار و دوولایەنەی ئاراستەی بینەران و بیسەران دەکرد.

لە کۆتایی سەدەی هەژدەم بەم لاوە کە ڕەخنەی ئەدبی هۆراسی بایەخی نەما، ئاپۆریاش ئەو گرنگایەتییەی پێشووی لە کیس دا. بەڵام لە سەدەی بیستەمدا زاراوەی ئاپۆریا دیسانەوە لە باسە ڕەخنەییەکاندا سەری هەڵدایەوە و بەگشتی بەیەکێ لە هونەرە شیعرییەکانی ئەدەبی پۆست مۆدێرنیستی دادەنرێ. لە ئاپۆریادا، بەپێچەوانەی شاراوەیی، لە هەردوو ماناکە، یان هیچکامیان ڕاست نین یان هەردوو ماناکە ڕاستن و کاتی واش هەیە هەردووکیان هەڵەن. لە سەردەمی زاڵیەتی ئەدەبی پۆست مۆدێرنیستیدا پرسیارە بێ وەڵامەکان پتر لە ڕواڵەتی ئاپۆریادا ئاراستە دەکرێن.

هونەری ئاپۆریا بۆتە هۆی پارچە پارچەبوونی گوتار و لەناوچوونی یەکێتی. هەر بەم بۆنەیەشەوە، ڕەخنەگرە پاش بنەماخوازەکان کەڵکی زۆریان لە ئاپۆریا وەرگرتووە. لەلایەکی دیکەشەوە، لایەنگرانی تیۆری وەرگرتن و ڕەخنەگرانی قوتابخانەی هەڵوەشاندنەوە و قوتابخانەی هەڵوێستی خوێنەر لە ڕێگەی ئاپۆریاوە ئەو خاڵەیان دەستنیشان کردووە کە خوێنەری هاوچەرخ بەتایبەت لە ڕەوتی خوێندنەوەی دەقە مۆدێرنیستی و پتر پۆست مۆدێرنیستیەکاندا ناتوانێ یەک مانای ڕاستەقینە و دیاریکراو هەڵبژێرێ. لەوەها کاتێکدا لە نێوان ئەو شتەی دەقەکە ئەیەوێ بڵێت و ئەو شتەی ناتوانێ بیدرکێنێ چەشنە بۆشایی و بەتاڵاییەک دێتە دی کە پڕکردنەوەی لە ئەستۆی خوێنەردایە. ڕەخنەگری بنەما شکێن لە ڕەوتی ڕەخنەکاریی دەقەدا بەدوای هەندێ هونەری وەکو ئاپۆریادا دەگەڕێ چونکە بوونی ئەم جۆرە هونەرانە دژایەتی ناو دەقەکە دووپات دەکەنەوە و ئەو خاڵەش دەستنیشان



دەکەنەوە کە مانا قەت لەناو دەقەکاندا وەستاو و نەگۆڕ نییە و بەردەوام لە گۆڕانکاری دان. ئەو ڕەخنەگرانەی لە سیاسەت و ئایدیۆلۆژیا ئەکۆڵنەوە و ڕەخنەگرانی قوتابخانەی فیمینیزم و تەنانەت نیئۆ مارکسیستەکانیش سەرنجی زۆریان داوەتە ئاپۆریا.

**ئاپۆکالیپتیک ◄—— ئەدەبی بەهەشتی**

**ئاخاوتە؛ گوتە؛ بێژ** — **speech**

**ئاخاوتەی دوور و درێژ** — **bombastic speech**

**ئاخاوتەی درێژی دەستکرد** — **pompous speech**

**ئاخاوتەی دەستکردی هونەری** — **inflated speech**

ئاخاوتەی دەستکردی هونەری بریتییە لەو چەشنە ئاخاوتە و دەقانە کە بەلێشاو هونەرە جیاجیا ئەدەبییەکانیان تێدا بەکارهێنراوە و هەست بەزەقبوونیان دەکا. ئەم جۆرە وشەکارییە زۆرتر لە ئەدەبی کلاسیستی و نیئۆ کلاسیکدا بایەخی پێ دراوە و بەهاتنە ئارای قوتابخانەی ڕۆمانتیسیزم جێگەی خۆی بەساکاریی دەق و سادەیی هونەر ئەدەبییەکان دا.

**ئاخاوتەی ڕازێنەرەوە (یی)** — **ornamented speech**

**ئاخاوتەی ڕەوانبێژانە** — **eloquent speech**

**ئاخاوتەی شاعیرانە** — **poetical speech**

**ئاخاوتەی لێدوان؛ گوتەی لێدوان** — **set speech**

**ئاراستە گشتییەکان** — **general directions**

**ئارکادیا** — **Arcadia**

ئارکادیا لە بنەڕەتدا ناوی ناوچەیەکە لە یۆنانی کۆن کە باکوری شاخاوی بووە و پێدەشتێکی بەرین لە داوێنیدا بووە و چەند گوندێک لەو ناوچەیەدا هەبووە و تا ڕادەیەک بەتەواوی لە سیاسەتی ناوەندی یۆنان بەدوور بووە. لە زۆربەی دەقە ئەدەبییەکاندا ئارکادیا بەمانای شوێنی خۆش و ئایدیال بەکاردێت کە دانیشتووانەکەی زۆرتر کوڕ و کچی گەنجی شوان بوون. تەمەنیان خوار نۆزدەساڵان بووە و هەمووشیان بەهۆی سەڵتێتییەوە ئەزموونی ژیانی هاوسەرێتییان نەبووە و هەر بۆیە خاوەن بیروڕایەکی زۆر پاک و خاوێن بەرامبەر بەعەشق و چەمکە پەیوەندیدارەکانی بوون.

**normalisation** — **ئاسایی کردنەوە**

**speech level** — **ئاستی ئاخاوتە**

**pre - speech level** — **ئاستی پێش ئاخاوتە؛ توێی بەر لە گوتە**

ئاست یان توێیەکی سیستەمی زماننناسانەیە و لە هەندێ بەشی بچووکی تر پێکدێ، وەک ئاستی وشە، ئاستی دەستەواژە و تەنانەت ئاستی ڕستە. لە نێوان ئەم ئاستە جیاجیایانەدا جۆرە زنجیرە قۆناغ و بەر و دواییەک لە ئارادایە کە لە یەکەی بچووکەوە دەست پێ دەکات و ئەگاتە یەکەیەکی گەورەتر.

**horizon** — **ئاسۆ**

**psychic relief** — **ئاسوودەیی دەروونی؛ ئۆقرەی دەروونی**

**horizon of expectations** — **ئاسۆی چاوەڕوانی**

ئەم زاراوەیە پتر لە ڕەخنەی ئەدەبی هەڵوێستی خوێنەردا بەکار ئەبرێ و، یەکێک لە دامەزرێنەران و پەرەپێدەرانی ئەم قوتابخانەیە، واتە هانس ڕۆبێرت یاس، پێی وایە کە پاڵپشتی خوێندنەوەی هەموو دەقێک کۆمەڵێک چاوەڕوانیی کولتوورییە کە لە درێژەی زماندا دەگۆڕێ. «ئاسۆی چاوەڕوانی» ئەو چوارچێوە کولتووری و مەبەستناسانەیەیە کە مانای لێ بەرهەم دێت.

**horizon of text** — **ئاسۆی دەق**

**horizontal** — **ئاسۆیی**

**explicit** — **ئاشکرا؛ ڕاستەوخۆ**

**revelation** — **ئاشکراکردن**

**baring the device** — **ئاشکراکردنی تەکنیک**

**dafamiliarisation** — **ئاشنایی سڕینەوە، نامۆکردن**

ئەم زاراوەیە لە بنەڕەتدا لە وشەیەکی ڕوسییەوە وەرگیراوە کە بەمانای نامۆکردن بەکاردێ. سەرەتا لە بەرهەمی فۆرمالیستە ڕوسیەکاندا بایەخی پێ دراوە بەتایبەت ڤیکتۆر شکلۆڤسکی[1] لە وتاری (هونەر وەکو تەکنیک)[2]دا ئەم زاراوەیەی شی

1- Victor Shklovsky (1893 - 1980).

2- Art as Technique.



کردەوە. بەپێی نووسینەکەی شکلۆڤسکی، ئەگەر تێگەیینی مرۆڤ تووشی دووبارە و چەند بارە بوونەوە ببێ و ببێتە خوو، ئەوا ئەبێتە شتێکی ئۆتۆماتیکی و، کارکردنی هونەر ئەوەیە کە دژی شتە عادەتییەکان بوەستێ و تەنانەت لەم پێناوەشدا دواڵەتێکی نائاشنا و نامۆ بداتە شتە ئاشنا و ئاساییەکان. بەبڕوای شکلۆڤسکی هونەر تێگەیینە هەستاوییەکی ئێمە سەرلەنوێ ڕێک ئەخاتەوە و لەم ڕەوتەشدا یاسا و ڕێسا ئاشناکان و بنەما بەڕواڵەت هەمیشەییەکانی واقیع تووشی گۆڕانکاری ئەکات. هونەر خووەکانی ئێمە ئەگۆڕێ و ئەوەی ئاشنا دێتە بەرچاومان نامۆی ئەکاتەوە. هونەر مەودایەک دەخاتە نێوان ئێمە و ئەو شتانەی خوومان پێ گرتوون و چشتەکان بەو چەشنەی (بۆ خۆیان هەن) ئەنوێنێتەوە. وا پێ دەچێ ئەم بیرۆکەیەی شکلۆڤسکی لەژێر کاریگەرێتی دیاردەناسیی هۆسێرل[1]دا بێ.

ئەوڕۆکە دوو زاراوەی ئاشنایی سڕینەوە و بەرجەستەکردنەوە لە بری یەک زۆربەی کات دێنە بەکارهێنان.

**aristocratic** — **ئاغـاواتی**

**ئاکام** ⟵ **ئەنجام**

**deduction** — **ئاکامگیری؛ ئەنجامگیری**

**ئاکامگیریی بەرزایی** ⟵ **ئەنجامگیری بەرزایی** **transcendental deduction**

**(بڕوانە بۆ بەرزایی)**

**ئاکامناسی** ⟵ **ئەنجامناسی**

**Altusserianism** — **ئاڵتووسێرخوازی**

ئاڵتووسێرخوازی بریتییە لە ڕەچاوکردن و وەدواکەوتنی بیروڕا فەلسەفی و کۆمەڵناسانەکانی لویی ئاڵتووسێر[2]، فەیلەسووفی مارکسیستی فەرەنسی. کاریگەرێتی ئاڵتووسێر لە ئاقاری ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبیدا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو باسانەی لەسەر چەمکی ئایدیۆلۆژیا کردوونی. بەبڕوای ئەو، ئایدیۆلۆژیا پیشاندەر و دەربڕی وێنایەکی خەیاڵیی بارودۆخی ڕاستەقینەی کۆمەڵایەتیی جەماوەرە. بەپێی وتەکانی ئاڵتووسێر، ئەم کارکردەی ئایدیۆلۆژیا مانەوەی دەسەڵات لە چینی زاڵی کۆمەڵگادا مسۆگەر ئەکات. لەلایەکی ترەوە، بەبڕوای ئەو، ئایدیۆلۆژیا هەڵگری تایبەتمەندییەکی دوو لایەنەیە، واتە،

1- Edmund Husserl (1859-1938).

2- Louis Althusser (1918-1990)

بەدیهێنانی وەهم و لەهەمان کاتیشدا تیلنیشانێکە بۆ واقیع. یەکێ لە تیۆرە سەرنجڕاکێشەکانی ئاڵتوسێر جیاوازی دانانە لە نێوان تاکەکەس و سووژەدا. پێداگری ئاڵتووسێر لەسەر چەمکی ئایدیۆلۆژیا هێندێ ئاکامی بەربڵاوی لە بەستێنی ئەدەبدا بەدواوە بووە. بەگوێرەی قسەکانی ئاڵتووسێر، ئەدەب جۆرێک لە ڕوانین و تێگەیشتن و هەست پێ کردنی ئەو ئایدیۆلۆژیایەیە کە لە ناخیدا لەدایک بووە و تیایدا نوقم بووە و، تێگەیینی مرۆیی لە باشترین شێوەی خۆیدا وەکو بەرهەمی ئەدەبی، خۆی لە ئایدیۆلۆژیا جیا ئەکاتەوە و لەهەر بارێکیدا و بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ و لاوەکیش بووە ئاماژەی بۆ ئەکات.

بەپێچەوانەی فەیلەسووفە مارکسیستەکانی پێشوو ئاڵتووسێر پێی وایە کە بەرهەمگەلی هونەری خاوەن سەربەخۆیییەکی ڕێژەیین و بۆ خۆیان بەرهەمی چەندین هۆکاری دیکەن. ئەو لە نێوان (هونەری ڕەسەن) و (بەرهەمی ئاسایی)دا جیاوازی دائەنێ. هونەری ڕەسەن، بەپێی بۆچوونی ئاڵتووسیر، خاوەن کارکردی دوولایەنەیە: لەلایەکەوە بەدیهێنەر و نوێکەرەوەی ئایدیۆلۆژیایە و، لەلایەکی دیکەشەوە بەجۆرێک ڕەخنەی لێ دەگرێ و بەم شێوەیە لەو ئایدیۆلۆژیایە کە لە باری مێژووییەوە پێوەی بەندە دوور ئەکەوێتەوە (وا پێ دەچێ مەبەستی ئاڵتووسێر لە بەرهەمی ئاسایی هەمان دامودەزگا ئایدیۆلۆژیکەکانی حکوومەتە و لە وتارێکدا ئەو بیرۆکەیەشی دەستنیشان کردەوە کە دامودەزگا ئایدیۆلۆژیکەکانی حکوومەت بۆ خۆیان سەرچاوە و بەدیهێنەری دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی حکوومەتن). ئەم کارکردە دوولایەنەی بەرهەمە هونەرییەکان ئەتوانێ دەوری سەرەکی لە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکاندا بگێڕێ.

لە مۆدێلەکەی ئاڵتووسێردا، ئەو خاڵە پێشنیارکراوە کە ڕەخنەی ئەدەبی پێویستە بەمیتۆدی زانستییەوە ڕەوتە ئایدیۆلۆژیکە شاراوەکانی بەرهەمگەلی ئەدەبی وەدەرخات و، ئەم بیرۆکەیەشی لەو نموونەیە وەرگرتووە کە دەڵێ زانیاریی زانستیانە بەردەوام ئەو واقیعەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان کە بەهۆی ئایدیۆلۆژیاوە شاردراوەتەوە لە ڕێگەی شیکاریی تیۆریکەوە ئاشکرا ئەکاتەوە.

بەواتایەکی دیکە، ڕەخنە ئەبێ زانیاریی تەواو دەربارەی ئەو ڕەوتانەی کە بەرهەمی جوانیناسانە بەدی دەهێنن ئاراستە بکات. هەر زمانێک، لەم ڕوانگەیەوە، خۆی لەخۆیدا ئایدیۆلۆژیکە و زۆربەی کات زمانی بەرهەمێکی ئەدەبی بەشێوەیەکی ناهۆشیارانە بەندە بەو ئایدیۆلۆژیایەوە؛ کەواتە تەنیا ڕەوتی ڕەخنەکاری ئەتوانێ دەمامک لەسەر ئەو وەهم و



بڕوایانە لابدات کە بەرهەمی ئەدەبی لەسەریان دامەزراوە. هەروەهاش ئەتوانێ یەکانگیریی بەرهەمی ئەدەبی و ئایدیۆلۆژیا لەناو ببات یاخود دەستنیشانی بکات. بەپێی ئەو پێوەرەی باسی لێ کرا ڕەخنەی ئەدەبی ئەبێتە خاوەن پێگەیەکی هاوشانی زانست.

| | |
|---|---|
| **ئاڵۆز (1)** | **complex** |
| **ئاڵۆزاو؛ شێواو** | **chaotic** |
| **ئاڵۆزاوی** | **complicated** |
| **ئامادەبوون؛ ئامادەیی** | **presence** |
| **ئاماژە؛ ئاماژەکردن** | **citation** |
| **ئاماژەیی** | **heraldic** |
| **ئامراز** | **means** |
| **ئامرازە ئەدەبییەکان** | **literary devices** |
| **ئامرازی دەربڕین** | **medium** |
| **ئامرازی گەڕانەوە** | **device of reference** |
| **ئامرازی لێکچوون؛ کەرەسەی شوبهاندن** | **medium of comparison** |
| **ئامێر(١)** | **instrument** |
| **ئامێر(٢)** | **tool** |
| **ئاناپێستیک** | **anapestic** |

ئەوە یەکەی کێشناسییە لە سێ بڕگە پێکدێ، بڕگەی یەکەم و دووەم بێ گوشارن و بڕگەی سێیەم بەگوشارەوە دەردەبڕدرێ.

| | |
|---|---|
| **ئاناگۆژی؛ واتای گشتی** | **anagogy** |
| **ئاوات(١)؛ خۆزگە؛ خۆزگە خواستن** | **wish** |
| **ئاوات(٢) خواست** | **desire** |

ئەم زاراوەیە لە دەروونشیکاریی لاکانی[1]دا بەکار ئەبرێ. (ئاوات) ئەو خواستەیە کە منداڵ لە کاتی تێپەڕین لە قۆناغی بابەتی خەیاڵیدا هەیەتی و بەو پێیە بەشێوەیەکی ناهۆشیارانە ئەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ ئەو یەکگرتوویی و یەکێتی و ئەمئەوێتییەی کە پێش

1- Jacques Lacan (1901-1981)

ئەو قۆناغە لەگەڵ دایکیدا هەیبوو. بەپێی تیۆرەکانی ژاک لاکان پاش قۆناغی بابەتی خەیاڵی منداڵ زمان ئەگرێ و ئەمەش ئەبێتە هۆی دابڕان لە دایکی و، هەر بەم هۆیەش پەل بۆ هەندێ چەمکی نێو زمانەکەی ئەهاوێژێ تاکو بەشێوەیەکی ناهۆشیارانە دیسانەوە ئەو یەکگرتوویی و یەکێتی و ئەمئەوێتیە بەدەست بێنێتەوە. بەڵام لەبەرئەوەی ئەم ئاواتە نایەتەدی، لەلایەکەوە منداڵ هەوڵ ئەدا لەگەڵ چەمکەکانی نێو زمانەکەیدا خۆی ئەمئەو بکاتەوە و، لەلایەکی تریشەوە بەدی نەهاتنی ئەو ئاواتەی پێشوو ئەبێتەوە هۆی بیچمگرتنی گرێیەکی ناهۆشیارانە لە زەینی ناهۆشیاری منداڵدا.

ئەم ئاواتە لە هیچ کەسدا نایێتەدی و لەناوچوونی قۆناغی خەیاڵی لە هەموو کەسێکدا سەرئەگرێ. کاتی دابڕان لەم قۆناغە و پاشان بەدی نەهاتنی ئاواتەکانی سەرکوتبوونی ئەم ئاواتەیە کە چووەتە زەینی ناهۆشیاری مرۆڤەوە. کاتێ ئەم ئاواتە سەرکوت ئەکرێ کردەی سەرکوتکاری ئەبێتە هۆی بەدیهاتنی ناخود ئاگا لە مرۆڤدا.

**illusion** — **ئاوات(٣)؛ وەهم**

**illusionism** — **ئاواتخوازی**

**ئاوەز ← ئەقڵ**

**ئاوازیانە ← ئەقڵانی**

**ئاوەڵا ← کراوە**

**amalgam** — **ئاوێتە؛ تێکەڵاو(١)**

**combined** — **ئاوێتە؛ تێکەڵاو(٢)**

**melange** — **ئاوێتە؛ تێکەڵاو(٣)**

**ئاوێتەکردن ← تێکەڵکاری**

**liturgy** — **ئاهەنگی ئایینی**

**iambic** — **ئایامبیک**

ئایامبیک ئەو یەکەیەی کێشناسییە کە لە دوو بڕگە پێکدێ و بڕگەی یەکەم بەگوشارەوە دەردەبڕێ و بڕگەی دووهەمیش بێ گوشارە.



**idealism** — **ئایدیالیزم ← ئامانج خوازی**

**ideology** — **ئایدیۆلۆژیا**

وشە یان زاراوەی ئایدیۆلۆژیا بەگشتی بەم شێوەیە پێناسە ئەکرێ: کۆمەڵە بیروڕایەکە پێداویستی و خواستە کۆمەڵایەتییەکانی تاکە کەس، تاقم، چین یان کولتوورێک ئەنوێنێتەوە، ئایدیۆلۆژیا، وەکو زاراوەیەکی پیشەیی و تایبەت، بەو کۆمەڵە باوەڕ و بیرۆکە دەرهەستانە ئەگوترێت کە لە گوتاری سیاسیدا بەتایبەت بەکار ئەبردرێ. لە ڕەخنەی کولتووریدا زاراوەی ئایدیۆلۆژیا زۆرتر بۆ دەستنیشان کردنی ئەو سیستەمەی تێگەیشتن بەکار ئەبرێ کە کار لە تاکەکەس و تاقمەکان ئەکات بۆ ئەوەی خۆیان لەگەڵ ڕوانگەیەکی بەرهەمهێنراو لە واقیع و هەقیقەت ڕێک بخەن. بۆ بیرداڕێژە مارکسیستەکان ئایدیۆلۆژیا لەلایەکەوە بریتییە لەو کۆمەڵە وێنە و شێوەیەی کە ململانێی چینایەتی لەناو ئەبات و لەلایەکی دیکەشەوە ئەو سیستەمە بیروباوەڕەیە کە بەهۆی هەمان وێنە و شێوەوە سەریان هەڵداوە.

**ideologic** — **ئایدیۆلۆژیک**

**ideological** — **ئایدیۆلۆژیکی**

**ideologeme** — **ئایدیۆلۆژیم**

بەپێی نووسینەکانی فرێدریک جەیمسۆن[1] ئایدیۆلۆژیم بریتییە لە (بچووکترین یەکەی ماناداری گوتارە کۆ و لە بنەڕەتدا دژەکانی چینە کۆمەڵایەتییەکان». ئەم زاراوەیە لە ڕێکەوەندی هەندێ وشەی وەک گرافیم و فۆنیم و میتیم -ەوە داڕێژراوە.

**ideologue** — **ئایدیۆلۆگ؛ هزروان (ی سەر بەمەرامێکی تایبەت)**

**conversion** — **ئایین هێنان؛ ئایین گۆڕین**

**object** — **ئۆبژە؛ بابەت بەرناس؛ چشت**

ئەم زاراوەیە کە لە بوارگەلی جیاجیای فەلسەفە، ڕێزمان و فیزیکدا بەکار ئەبرێ هەندێ واتای جۆراوجۆری لەخۆ گرتووە. ئەکرێ بۆ هەرسێ زاراوەی کوردیی (بابەت)، (بەرناس) و (چشت) لە زاراوەی (ئۆبژە) سوود وەربگرین، بەڵام لێرەدا ئەکرێ هەندێ جیاوازی لە نێوانیاندا دابنرێ.

لێرەدا مەبەست لە (بابەت) هەمان (عەین)ی زمانی فەلسەفییە کە لە هەندێ

1- Fredric Jameson (1934 - )

قوتابخانەی فەلسەفیدا لەگەڵ (زەین) ئەمئەوە و، بەگوێرەی چەند قوتابخانەیەکی تر لەگەڵ (زەین)دا نائەمئەوە. (بەرناس) ئەو چەمکە دەرهەست یاخود بەرهەستەیە کە لەلایەن زەینی ناسکاری مرۆڤەوە ئەکەوێتە بەر ناسین و، لە شێوە ئەقڵانیەکەیدا و بەپێی فەلسەفەی دیکارت و ئاکامەکانی لە زەینی ناسکاری مرۆڤ بەتەواوی جیاوازە. بەڵام لە هەندێ شێوە ڕوانینی فەلسەفیدا کە زۆرتر ئاوێتەی عیرفان و ئیشراقن و بەلێشاو لە بەرهەمە ئەدەبیە ڕۆمانتیسیستیەکاندا دەبیندرێ ئاکامی ئەم ناسینەوەیە دەبێتە یەکێتی زەین و بابەت، یان بەوتەی هێگڵ ئەم بابەتە هەمان زەینە (واتە، ئەمئەوێتی زەین – بابەت یان ناسکار – بەرناس). بەر لە هێگڵ-یش ئەم ڕوانگەیە زۆرتر لە فەلسەفەی شێلینگ[1]دا دەبیندرێ. مانای سێیەمی ئەم زاراوەیە (چشت)ە، کە واتای (شت) ناگرێتەوە[2].

**ئۆپۆزیسیۆن ⟵ بەرهەڵستکار**

**orthodox** — **ئۆرتۆدۆکس؛ ڕاستبڕوا**

**orthodoxy** — **ئۆرتۆدوکسی؛ ڕاستبڕوایی**

**organic** — **ئۆرگانیک؛ ئەندامەوار**

**ئۆقرەی دەروونی ⟵ ئاسوودەیی دەروونی**

**mytheme** — **ئوستوورۆچکە**

(ئوستووره) وەکو کۆیەک لە هەندێ پاژ پێک هاتووە و بچووکترین یەکە و پاژی ماناداری هەر ئوستوورەیەک ئوستوورۆچکەیە. بۆ نموونە لە ئوستوورەکانی ئێرانی کۆندا چاوی ئەسفەندیار و پاژنەی ئاشیل[3] لە ئوستوورەکانی یۆنانی کۆندا بەهۆی ئەوەوە کە ئاوی پیرۆز و ڕۆحانییان بەر نەکەوتووە لە وەزەند بەدوور نین و تیری ڕۆستەم و هێکتۆر[4] ئەیانبڕێ. ئەم دوو بەشە بچووکەی ئوستوورەکانی ئێران و یۆنانی کۆن ئەکرێ وەکو دوو ئوستوورۆچکە دابندرێن.

1- Friedricl Schelling (1775-1854)

(٢) ئەگەرچی (چشت) لە دوو زاراوەی کرمانجی باکور و کوردی ئیلامی دەقاودەق بەمانای (شت) بەکار ئەبرێ، بەڵام لێرەدا لە یەکدی جیاکراونەتەوە. واتە، (چشت) بۆ واژەی (شيء) و (شت) بۆ (چیز)ی فارسی یان (Thing) بەکار ئەبرێ.

3- Achilles.

4- Heckor.



**myth** — **ئوستووره**

ئوستووره ئەو چیرۆکەیە کە دانەرەکەی یان ڕەگەزەکەی شاراوەیە و هەوڵ ئەدات ڕەوتەکانی سروشت، بەدیهاتنی جیهان و مرۆڤ، یان خوە نەریتییەکان، دامەزراوە سیاسییەکان و ئاهەنگە ئاینییەکان دەربڕێ. ئوستوورەکان ئەو بابەتانەی سەرەوە لە ڕێگەی هەندێ گێڕانەوەوە دەرئەبڕن کە چالاکی و مەبەستی ڕۆح و خواوەندەکان پیشان ئەدەن. بەو پێیەی کە سەرجەمی ئەم ڕێ و ڕەسمانە بەهۆ و لەلایەن ئەو ڕۆح و خواوەندانەوە سەریان هەڵداوە. زاراوەی ئوستووره هەندێ جار لەگەڵ زاراوەی (ئەفسانە)دا وەک یەک بەکار ئەبرێن، بەڵام ئەفسانە زۆرتر لەسەر کەسایەتی و واقیعە مێژووییەکان دامەزراوە و، وەکو ئوستووره خاوەن یەکێتی گەڵاڵە نییە، چونکە ئوستووره لە بنەڕەتدا وەکو سیستەمێک بۆ ڕاڤەی جیهان یان بەرپەرچدانەوەی مرۆڤی بەرایی لە هەمبەر هێزە سروشتییە نەناسراوەکاندا داڕێژراوە.

ئەمڕۆکە پێناسە و واتای ئوستووره زۆرتر لەژێر کاریگەرێتی دوو بیرمەندی هاوچەرخ، واتە کلۆدلێڤی شترۆس[1] و ڕۆلان بارت[2]، دایە. باسەکەی شترۆس سەبارەت بەئوستووره لە کتێبی مێشکی بەرایی[3]دا بۆتە هۆی ئەوەی کە بیروڕای ئێمە دەربارەی ئوستووره زۆرتر بەلای جۆرێک بیرکردنەوەدا داشکێ. ئەم پێناسەیەی شترۆس زۆر لەو ڕوانگە نەریتیانەی سەبارەت بەئوستووره دوورە، کە ئوستووره وەکو گەڵاڵەیەکی نەریتی دەربڕاو پێناسە ئەکەن. گۆڕینی پێناسەی ئوستووره لە گەڵاڵەی نەریتییەوە بۆ جۆرێک بیرکردنەوە لە کتێبە بەناوبانگەکەی ڕۆلان بارتدا بەناوی ئوستووره ناسییەکان[4] دیسانەوە دووپات کراوەتەوە. پێناسەکەی ڕۆڵان بارت بەم چەشنەیە کە ئوستوورەکان بهێنێتەوە بۆ ناو ژیانی ڕۆژانەی خەڵک و خوێنەرە ئەوروپییەکانی هەنووکە لەو خاڵە ئاگادار بکاتەوە کە ئوستوورەکانی تەنیا هی خەڵکانی تر و سەردەمانی دوورەدەستی مێژوو نین، بەڵکو ئەتوانن بەشێک لە ژیانی مۆدێرنی ڕۆژانەی ڕۆژئاوا پێک بهێنن. ئوستووره لای ڕۆڵان بارت، بەپێچەوانەی شترۆس، چەشنێک گوتەیە و ئەتوانێ دەوری ڕەوتێکی تایبەت بگێڕێ کە بەو پێیە دۆخە مێژووییەکان بکاتە شتێکی ئاسایی.

1- claude Levi - Strauss (1908-1988).

2- Roland Barthes (1915-1980).

3- The Primitive Mind.

4- Mythologies.

لەم سالآنەی دواییدا دوو چەمکی ئوستووره و ئایدیۆلۆژیا زۆر پێکەوە گرێدراون. بەواتایەکی دیکە ئوستوورەکان ئەتوانن کارکردێکی ئایدیۆلۆژیک ئاراستە بکەن لەکاتێکدا ئایدیۆلۆژیاکانیش لە ڕێگەی ئوستوورەوە ئەکەونە کار.

**ئوستووره سازانه** **mythopoeic**

**ئوستوورەسازی** **mythopoesis**

**ئوستووره ناسانه** **mythological**

**ئوستووره ناسەکی؛ لۆژیکی ئوستووره** **mythologic**

**ئوستوورەناسی** **mythology**

**ئوستوورەنووس** **mythographer**

**ئوستوورەیی** **mythical**

**ئەتککاری؛ خراپ ئاراستەکردن** **defacement**

**ئەخلاق؛ زانستی ئەخلاق** **ethics**

**ئەخلاقخواز** **moralist**

**ئەخلاقی(١)** **ethical**

**ئەخلاقی(٢)؛ پەیامی ئەخلاق** **moral**

**ئەدەب(١)** **belleslettres**

**ئەدەب(٢)؛ ئەدەبیات** **literature**

**ئەدەبناسی** **literaturology**

مەبەست لە ئەدەبناسی ناسین و پۆلێنبەندی کردن و لێکۆڵینەوەی سێ لقی جیاجیای ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبی و تیۆری ئەدەبییە کە هەرچەندە ئەوڕۆکە هەر کامە وەکو لقێکی سەربەخۆی زانستی لێ هاتووە و بەڵام خوێندنەوەی هەرسێکیان بەتێکڕایی ئەدەبناسی ئەگرێتەوە. پێویستە بگوترێ لە ئەدەبی ڕۆژهەڵاتدا ئەدەبناسی زیاتر ئەدەب ئەگرێتەوە و کەمتر ئاوڕ لە ڕەخنەی ئەدەبی و بەتایبەت تیۆری ئەدەبی ئەدرێتەوە. لەبەر ئەوەش کە چەندین قوتابخانەی جیاجیای تیۆری ئەدەبی لە ئارادایە و هەر کامەیان لە گۆشەنیگایەکی تایبەتەوە و بەبۆچوونێکی جیاوازەوە ئەدەب ئەخوێننەوە، کەواتە ئەکرێ بگوترێ بەهۆی ئەم خەسڵەتە نێوان بوارییەوە ئەدەب جارێکی دیکە و لە سەردەمی هاوچەرخدا بووەتەوە



بەخاوەنی ئەو تایبەتمەندییەی پێشووی، واتە ئەو پێناسەیەی ئەدەب کە وەکو دایکی زانستە مرۆییەکان دائەنرێ.

لە قۆناغی یەکەمی زانستی ئەدەبناسیدا کە ئەدەبە تەنیا ئاوڕ لە پێناسە و تایبەتمەندییەکان و پۆلێنکارییەکان ئەدرێتەوە. لە قۆناغی دووەمدا کە ڕەخنەی ئەدەبیە باس لە جیاوازیی هونەرەکان و بایەخی جیاوازی دەقە جۆراوجۆرەکان دەکرێ. لە دوا قۆناغدا کە تیۆری ئەدەبیە پەنجە ئەخرێتە سەر هۆی جیاوازبوونی هونەرە ئەدەبییەکان و هەروەهاش هۆی سەرهەڵدانی بایەخە جیاجیا ئەدەبییەکان و سەرجەم پرسە پەیوەندیدارەکان بەبنەڕەت و سروشت و چۆنیەتی هونەرە ئەدەبییەکان و چەشنە ئەدەبییەکانەوە.

بەمەبەستی زیاتر دەرخستنی ئەو وتارانەی سەرەوە ناچارین نموونەیەک بهێنینەوە. ئەگەر سەیری دوو تەکنیکی ئەدەبی وێکچوون و خوازە بکەین، ئەوا لە قۆناغی یەکەمدا واتە ئەدەب هەردووکیان پێناسە ئەکرێ و بۆ هەر کامەشیان نموونەیەک ئەهێنرێتەوە و باس لە جۆرە جیاجیاکانی هەرکامەیان ئەکرێ، لە قۆناغی دووەمدا کە ڕەخنەی ئەدەبییە هەردوو هونەرەکە لەناو دوو دەقی ئەدەبی جیاوازدا ئەدۆزرێتەوە و باس لە جیاوازییەکانی ئەو دوو دەقە ئەکرێ و لە ئەنجامدا بەپێی ئەم دوو هونەرە بایەخی ئەم دوو دەقەش هەڵئەسەنگێنری. لە قۆناغی سێیەمدا بەڵام ئەو باسە دێتە گۆڕێ کە کام یەک لەو دوو هونەرە، واتەخوازە و وێکچوون هەڵگری بەهایەکی بەرزتری شاعیرانەن و بۆچی بەواتایەکی دیکە لە تیۆری ئەدەبیدا وەڵامی (بۆچی)یەکان ئەدرێتەوە. تیۆری ئەدەبی بۆخۆی جۆرێک بوونناسی هونەر و دەقی ئەدەبییە.

**ئەدەبی** **literary**

**ئەدەبی بانگەشەیی** ⟵ **ئەدەبی پرۆپاگەندە**

**ئەدەبی بورژوایی** **bourgeois literature**

ئەم چەشنە ئەدەبە کە وەک پێچەوانەی ئەدەبی پرۆلیتاریایی ناوبردە ئەکرێ زۆرتر باسی گرفتە کۆمەڵایەتییەکانی چینی ناوەڕاستی کۆمەڵگا ئەکات. ئەم زاراوەیە زۆرتر لەسەر دەستی بیرمەندە مارکسیستەکانی سەرەتا و ناوەڕاستی سەدەی بیستەم هاتە نێو ڕەخنەی ئەدەبی مارکسیستییەوە و، پاشانیش بەهۆی هەندێ ڕەخنەوە کە ئاراستەی ڕەخنەی وشک و پەتیی مارکسیستی کرا، ئەم جۆرە ڕەخنەیە واتایەکی سووکی لەخۆ گرت.

### ئەدەبی بەراوردکارانە — comparative literature

ئەدەبی بەراوردکارانە بریتییە لە بەراوردکردنی لێکچوونی ئەدەبی دوو زمان یان دوو نەتەوە کە تیایدا تیشک خرابێتە سەر ئاڵوگۆڕیی چەشنە ئەدەبییەکان، هونەرەکان، بابەتەکان، ئوستوورەکان، کەسایەتییەکان و لە ئاکامدا کاریگەرێتی ئەدەبی و مەعریفی یاخود شێوازی نووسین و چەشنی جیهانبینیی ئەو دوو زمان و نەتەوەیە لەسەر یەکدی، بەو شێوەیەی کە لە بەرهەمە ئەدەبیە ناسراو و بەناوبانگەکانی ئەو دوو زمانەدا دەرکەوتبن. ئەدەبی بەراوردکارانە بۆ خۆی چەند لقێکی لێ جیا بووەتەوە کە گرینگترینیان ئەمانەی خوارەوەن: هۆ و هۆکارەکانی گواستنەوەی ئەدەب لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە، کارتێکردنی نووسەرێک لەسەر ئەدەبی نەتەوەیەکی تر، لێکۆڵینەوە لە سەرچاوەکانی نووسەر و لێکۆڵینەوە دەربارەی وڵاتان لە ڕێگەی ئەدەبی وڵاتێکی دیکەوە.

### ئەدەبی بەرپرسیار؛ ئەدەبی دەروەست(١) — engaged literature

### ئەدەبی بەرپرسیار؛ ئەدەبی دەروەست(٢) — committed literature

ئەدەبی بەرپرسیار یان دەروەست ئەو ئەدەبەیە کە بەتەواوەتی لایەنگریی لە هەندێ بیروڕای دیاریکراو و بەرنامەی تایبەت ئەکات و زۆرتر ئەدەبێکی سیاسی و ئایدیۆلۆژیکە. ئەم زاراوەیە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا و بەهۆی بڵاوبوونەوەی بیرۆکەی نووسەری سەربەخۆ و یان ئەو نووسەرەی هۆگری بڕوایەکی تایبەت، لە نووسینەکانی ئەوسادا بەگشتی دەهاتە بەرچاو. ئەوڕۆکە ئەم زاراوەیە پتر بۆ ئەو چەشنە ئەدەبە بەکارئەبرێ کە زۆرتر لەسەر دەستی ئەدیبە مارکسیستەکانی ڕۆژهەڵات بەرهەم هاتووە. ئەم چەشنە ئەدەبە توانی نزیکایەتی و هاوڕێیەتییەکی زۆر لە نێوان خۆی و ڕۆشنبیری (ی گشتی)دا بەدی بهێنێ. ژان پۆل سارتر[1] یەکێ لەو نووسەرە بەناوبانگانە بوو کە دەوری سەرەکی لەباو و بەربڵاوبوونەوەی ئەم چەشنە ئەدەبە گێڕا.

### ئەدەبی بەهەشتی — appocalyptic literature

مەبەست لە ئەدەبی بەهەشتی یا ئەدەبی ئاپۆکالیپتیک ئەو بەرهەمانەیە کە باسی داهاتوو و ئاشکراکردن و دەرخستنی لایەنەکانی هاوپێوەند لەگەڵ ژیانی ماکی و مینۆکی داهاتوو ئەکەن. بۆ نموونە دوابەشی کتێبی ئینجیلی پیرۆز، بەڵێنی نوێ، کە باسی داهاتووی جیهان ئەکات، نموونەی کلاسیکی ئەم چەشنە ئەدەبەیە.

1- Jean Paul Sarte (1905-1980).



### ئەدەبی پرۆپاگەندە؛ ئەدەبی بانگەشەیی(١) — propagandist literature

### ئەدەبی پرۆپاگەندە؛ ئەدەبی بانگەشەیی(٢) — Thesis Literature

ئەم چەشنە ئەدەبە لقێکە لە ئەدەبی فێرکارانە کە مەبەستی هەڵخڕاندنی خوێنەرە بۆ ئەوەی هەڵوێستێک لە خۆی بنوێنێ یان پێگەی فیکریی خۆی دیاری بکا و پێیدا بچێتەوە. بابەتی ئەدەبی بانگەشەیی زۆرتر پرسە ئەخلاقی و سیاسییەکان ئەگرێتەوە. مەبەستی بێژەر یان دانەری ئەم بەرهەمە لە بنەڕەتدا فێرکاری و ڕاهێنانە.

### ئەدەبی پووچ — literature of the Absurd

(بڕوانە تیاتری پووچی)

### ئەدەبی جەماوەری؛ ئەدەبی ڕەشۆکی — folk literature

ئەدەبی جەماوەری کۆی ئەو سروود و چیرۆک و ئوستوورە و مەتەڵانە ئەگرێتەوە کە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر بەشێوەیەکی زارەکی گوازراونەتەوە و بابەتەکانیشی فرەتر لە کولتووری جەماوەری وەرگیراوە. ئەم جۆرە ئەدەبە لەنێو ئەو کۆمەڵانەدا باوە کە زۆربەی خەڵکەکانیان نەخوێندەوارن.

### ئەدەبی چیرۆک — fiction

ئەم زاراوەیە بەگشتی بۆ ئەو چەشنە ئەدەبیانە بەکارئەبرێ کە ئەگەرچی بابەتەکانیان لە واقیع وەرگرتووە، بەڵام ئاوێتەی خەیاڵی دانەر بووە و لەجیاتی دەربڕینی واقیعە مێژووییەکان بابەتەکان بەشێوەیەکی خەیاڵ کرد ئەنوێنێتەوە. ئەم ئەدەبە لە پێنج بەشی سەرەکی پێکهاتووە کە بریتین لە: چیرۆک بەگشتی، کورتە چیرۆک، نۆڤڵێت یان کورتە ڕۆمان و کورتیلە چیرۆک یان چیرۆکی مینیماڵ.

### ئەدەبی دانپیانان — confessional literature

ئەدەبی دانپیانان کە گێڕانەوە و ڕۆمان و شعری دانپیانان ئەگرێتەوە لقێکی ئەدەبە کە بەجۆرێ ژیاننامەی نووسەر یان شاعیر بەشێوەیەکی ئاشکرا دەرئەبڕێ. دانپیانانەکان[1]ـی سەینت ئاگۆستین[2] و ژان ژاک ڕۆسۆ[3] دوو نموونەی کلاسیکی ئەم ئەدەبەن. لە سەدەی بیستەمدا، ئەدەبی دانپیانان هاوکات جیهانبینی دانەرەکەشی بەشێوەیەکی

1- confession.

2- St. Angstine (354-430).

3- jean Jacqnes Ronssean (1712-1778).

ئەندامـوار دەرئەخا. بۆ نموونە، شیعـرەکانی دوا قـۆناغی ژیانی ژنە شـاعـیری بەنـاوبانگی ئەمریکایی، سیلڤیـا پلات، لەلایەکەوە بەنموونـەی بەرچاوی ئەدەبی دانپیـانان دائەندرێ و لەلایەکی تریشەوە سیستەمی فیکری و ڕوانینی ئوستوورە ناسانەوە و دەروونناسانەی ئەو شاعیرە پیشان ئەدات.

**ئەدەبی دوور لە واقیع ⟵ ئەدەبی واقیع بێز**

**ئەدەبی دیستۆپیایی** — **Dystopia literature**

وشەی دیسـتۆپیا دژ و پێچەوانەی وشەی یۆتۆپیایە. واتە ئەگەر یۆتـۆپیا بەمانای شاری ئاوات دائەنرێ مەبەست لە دیستوپیا ئەو کۆمەڵگایانەیە کە بەپێچەوانەی یۆتۆپیا لەباری ئەخلاقی و هەڵسوکەوت و ڕوانگە مرۆیی و سیاسییەکانەوە بەتەواوەتی خەریکن لەناو ئەچن. ئەدەبی دیستۆپیایی ئەو ئەدەبەیە کە چاکە مرۆییەکان و پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەشێوەیەکی لەناوچوو ئاراستە ئەکات. ڕۆمانی ١٩٨٤-ی جۆرج ئۆرۆیل[١] و جیهانی نوێی بەختـەوەری[٢] نووسینی ئالدۆنس هاکسلی[٣] دوو نموونەی کلاسیکی ئەم جۆرە ئەدەبەن.

**ئەدەبی ڕەشۆکی ⟵ ئەدەبی جەماوەری**

**ئەدەبی سەیروسەمەرە (١)** — **Fantastic literature**

**ئەدەبی (بابەتی) سەیروسەمەرە (٢)** — **literature of the fantastique**

ئەم زاراوەیە لەلایەن ڕەخنەگری بولغاری دانیشتووی فەرەنسا تیزڤیتان تۆدۆرۆڤ[٤]، لە کتێبی پێشەکییەک لەسەر ئەدەبی سەیروسەمەرە[٥] ئاراستەی تیۆری ئەدەبی کراوە. پێناسەکەی تۆدۆرۆڤ ژمارەیەکی زۆری چیرۆکی هاوچەرخ لەخۆ ئەگرێ. یەکێ لەو تایبەتمەندییانەی تۆدۆرۆڤ بۆ ئەم چەشنە ئەدەبە دایەنێ هۆکاری ڕاستنوێنییە. واتە، خاڵی گرنگ بۆ نووسەر ئەوەیە کە بتوانێ خوێنەرەکەی لە ڕێگەی ئاراستەکردنی نواندنەوەیەک لە واقیع لەگەڵ جیهانی ڕۆمانەکەدا تووشی کێشە بکات. پێویستە بگوترێ کە ئەو وێنە و

1- George Orwell (1903-1950).
2- Barve New World (1932).
3- Aldons Hnxley (1894-1963).
4- Tzvefan Todorev (1939- ).
5- Introduction a la Literature Eantastique.



نواندنەوەیەی واقیع خۆی لەخۆیدا دەوری واقیع ئەگێڕێ. ئەمەش ئەبێتە هۆی ئەوەی کە خوێنەر بەتەواوی خۆی لە ناخی چیرۆکەکەدا ببینێتەوە. بەبڕوای تۆدۆرۆڤ وتەزای ڕاستنوێنی لە دوو هۆکاری جیاواز پێکهاتووە کە بریتین لە واقیع و خەون، چیرۆک لەم چەشنە ئەدەبەدا نابێ هەر تەنیا ڕوونووسی واقیع بێت، بەڵکو نووسەر ئەتوانێ بەکەڵک وەرگرتن لەو دوو هۆکارە، هەستی واقیع نوێنی بدا بەخوێنەر و هەر بەم بۆنەوە، ڕووبەڕووی گومان و پرسیاری بکاتەوە.

**ئەدەبی سێلتی** — **Celtic literature**

(سێلتەکان) کە هەندێ جار (کێلت)یشیان پێ ئەگوترێ ئەو هۆزە بوون کە دەوروبەری ساڵی ٦٠٠ بەر لە زایین کۆچیان کرد بۆ ئینگلتەرا و ئیرلەند. پاش هێرشی سوپای ڕۆمی کۆن بۆ ئەم وڵاتانە لە نیو سەدەی پێش زاییندا سێلتەکان بڵاوەیان پێکرا. ئێستا کە مەبەست لە ئەدەب و کولتووری سێلتی زۆرتر کولتووری ئیرلەند یان کولتووری ئینگلیزی پێش ئەنگلۆساکسۆن و هێرشی ڕۆمی کۆنە. ئەم ئەدەبە، واتە ئەدەبی بەلای زۆرەوە ئیرلەندی، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەدا چەشنە گەشە و پێشکەوتێکی بەخۆوە بینی و چەندین بەرهەمی نەمر و کەسایەتی ئەدەبی بەناوبانگی بەرهەم هێنا. تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ئەم ئەدەبە بریتین لە گەڕانەوە بۆ بیروبڕوا بەراییەکانی مرۆڤی ئیرلەندی، باسکردنی ڕۆح و سێحر و ئەفسانە و بەگشتی نواندنەوەی ژیار و شارستانییەتی جەماوەری ئیرلەند بەتایبەت خەڵکی گوند و لادێکان کە باوەڕی زۆریان بەو توخمانەی سەرەوە هەیە.

**ئەدەبی شوانی** — **bucolics**

ئەم ئەدەبە، کە زۆرتر ڕواڵەتێکی زارەکی هەیە بەشێکی گرنگی کولتووری جەماوەری لە گوند و لادێکاندا پێکدێنێ. ئەم ئەدەبە بەلای زۆرەوە شیعرە و تا ڕادەیەکیش چیرۆک و حەکایەتی کۆنی ئەو ناوچەیەی تێدایە. کێشی شیعری شوانی لە هەر کولتوورێکدا پێڕەوی لە کێشی خۆماڵی و بڕگەیی دەکا کە بەگشتی کێشێکی سادە و خۆش ئاهەنگە. ئەم جۆرە ئەدەبە لە زۆربەی نەتەوەکاندا بەشێوەیەکی ڕەسەن ماوەتەوە و کولتووری بیانی و تەنانەت ئایین و سیاسەتیش زۆر کەم کاری تێ کردووە. لە نەریتی ئەدەبی ئینگلیزی بەتایبەت و نەریتی شیعری ئەورووپا بەگشتی ئەم ئەدەبە لە ڕواڵەتی وتووێژی نێوان کوڕ و شوانێکدا ئەبینێتەوە کە سروودەکانیان هێمای پاکی و دڵدارین. ئەدەبی شوانی بەگشتی

بارودۆخێکی ئایدیال ئەنوێنێتەوە کە تیایدا مرۆڤەکان لە سیاسەتی کۆمەڵگای مەدەنی و تایبەتمەندییە سنووردارەکانی دیکەی بەدوورن و، ڕەنگە تەنیا دوژمنی وەها بارودۆخێک هەوای ساردی زستان بێت کە ئەویش هەندێ جار بەشێوەیەکی جوان و دڵنشین ئاماژەی بۆ ئەکرێ. بەواتایەکی تری ئەدەبی شوانی دەربڕینی هەستی خاوێن و مێشکی بێ گەردی گەنجی لادێیە، کە تیایدا زۆربەی کات بانگەشە بۆ ئەوینێکی سەرانسەر مینۆکی ئەکات. لە تاقمێ لەم شیعرانەدا لە ڕوانگەیەکی تیزاویەوە باسی شار و ژیانی شارنشینی ئەکرێ. ئەم ئەدەبە، جگە لەوەی چەشنێکی ئەدەبیی سەربەخۆیە، هەندێ جار لە چەشنە ئەدەبییەکانی دیکەشدا بەکار ئەبرێ. بۆ نموونە لە ئەدەبی ڕۆژئاواییدا، لە کۆمیدی و بەتایبەت کۆمیدی ڕۆمانتیکدا زۆر لە ئەدەبی شوانی وەردەگیردرێ. شکسپیر لە کۆمدییە بەناوبانگەکانیدا وەک شەوی دوازدەهەم[1]، خەونی شەوی نیوەی هاوین[2] و بەو چەشنەی ئێوە پێتان خۆشە[3] هەندێ ستران و سرودی لە ڕواڵەتی ئەدەبی شوانیدا بەکارهێناوە.

**ئەدەبی فێرکارانە** **didactic literature**

هەر بەرهەمێکی ئەدەبی کە مەبەستی فێرکاری و پەروەردە بێت بەبەشێک لە ئەدەبی فێرکارانە ئەژمێردرێت. بابەتی فێرکاری و ڕاهێنان لەم ئەدەبەدا لایەنگەلێک وەک بابەتی ئەخلاقی، پرسە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان و فێرکاری هەندێ هونەری تایبەت ئەگرێتەوە. ئەدەبی فێرکارانە سەرەتا لە شیعردا پەرەی پێ دەدرا و ئێستاکە زۆرتر هەندێ ڕۆمان و کورتەچیرۆک ئەگرێتەوە کە لە قۆناغێکی مێژوویی دیاریکراو و بەپێی مەرامێکی تایبەتی دانەر بەرهەم هاتووە.

لە ئەدەبی ڕۆژئاوادا یەکەمین نموونەگەلی ئەدەبی فێرکارانە لە سەردەمی یۆنانی کۆندا و لەسەر دەستی هیزیۆد[4] خولقێندراوەکە، بۆ وێنە، لە بەرهەمی شاعیرانەی کارەکان و ڕۆژەکان[5]دا هەوڵی فێرکاریی بابەتە پەیوەندیدارەکان بەکشتوکاڵەوە دەدا. ئێستاکە، بەڵام، لە ڕەخنەی ئەدەبیدا مەبەست لە ئەدەبی فێرکارانە ئەو ئەدەبەیە کە تیایدا

---

1- Twelvtl Night.

2- A Midsnmmer’s Night Dream.

3- As You Like It.

4- Hesiod (8 th cent. B. C).

5- Works and Days.



بیرۆکەیەکی تایبەت و تا ڕادەیەک ئایدیۆلۆژیک ئاراستە کراوە. لە چەرخەکانی ناوەڕاستدا لەم ئەدەبە فرەتر بۆ فێرکاریی بابەتە ئایینی و ئەخلاقییەکان کەڵک وەرئەگیرا. بەڵام ئەوڕۆکە ئەدەبی فێرکارانە پتر بۆ ئەو چەشنە ئەدەبە بەکارئەبرێ کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا بەپێڕەوی لە بیرۆکە مارکسیستەکان داهێنرا. ئەم ئەدەبە ئەکرێ بەسەر دوو بەشی گەورەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆدا دابەش بکرێ و لەکاتی بەکارهێنانی زاراوەی ئەدەبی فێرکارانەدا زیاتر مەبەست ئەدەبی فێرکارانەی ڕاستەوخۆیە، چونکە لەلایەکەوە ئەم چەشنە ئەدەبە سەردەمێک لە سۆڤیەتی جاراندا بەرەچاوکردنی بیرۆکە ڕەخنەییەکانی ئەفلاتوون و تۆلستۆی و نووسەران و بیرداڕێژانی ڕیالیزمی سوسیالیستی بەلێشاو بەرهەم ئەهێنرا و، لەلایەکی دیکەشەوە، ئەکرێ بوترێ کە ئەدەب بەگشتی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هەندێ توخمی فێرکارانەی لەخۆ گرتووە. ئەمڕۆکە زاراوەی ئەدەبی فێرکارانە وەبیرهێنەرەوەی ئەدەبێکی یەکسەر سیاسی و ئەخلاقی و ئایینییە و، هەر بەم بۆنەشەوە ئەم زاراوەیە لە بابەتە ڕەخنەییەکاندا ئەو بایەخەی پێشووی نەماوە.

**ئەدەبی فێرکارانەی ڕاستەوخۆ** **direct didatic literatur**

**ئەدەبی فێرکارانەی ناڕاستەوخۆ** **indirect didactic literature**

**ئەدەبی کاربردی** **applied literature**

**ئەدەبی کرێکاری** **proletarian literature**

ئەم زاراوەیە کە هەروەک بەناوەکەیدا دیارە زۆرتر لە ڕەخنەی ئەدەبیی مارکسیستی ئۆرتۆدوکسدا بەکارئەبرێ و مەبەست ئەو ئەدەبەیە کە لە دۆخی چینی کرێکاری کۆمەڵگا و باری ژیانیان ئەکۆڵێتەوە. لەم ئەدەبەدا بانگەشە بۆ خراپیی باری ژیانی چینی کرێکاری لە کۆمەڵگای مۆدێرندا ئەکرێ و پێشاندەری نزمبوونی ئاستی ئابووریی ئەو چینەیە و، هەندێ جار لە ڕوانگەیەکی دەروونناسانەشەوە دۆخی دەروونی و زەینی کەسایەتییەکانی ئەم کۆمەڵگایە ئەخاتە ڕوو. لە هەندێ بەرهەمی سەر بەم چەشنە ئەدەبەدا کێشەی گرنگ ڕووبەڕووبوونەوەی کرێکارانی مۆدێرن، واتە پرۆلیتاریا لەگەڵ دەسەڵاتی چینی بورژوادایە.

لەم ئەدەبەدا ناوەڕۆک گرنگی پێ دەدرێ و زۆربەی کات فۆرمی بەرهەمەکە ئەخلاقیە و هیچ چەشنە نوێکاریەکی فۆرمیکی تیا بەدی ناکرێ و زۆرتر هۆکاری کۆمەڵایەتی بایەخی پێ دەدرێ و نکۆڵی لە هۆکاری تاکە کەسی ئەکرێ. ئەم ئەدەبە ئەوڕۆکە و بەتایبەت لە

ڕوانگەی تیۆرە پاش بنەماخوازەکانەوە بەبەرهەمێکی ئایدیۆلۆژیکی تایبەت بەسەردەمێکی دیاریکراو (واتە سۆڤیەتی جاران) دادەنرێ.

**ئەدەبی ناچیرۆکی** **nonfiction**

ئەدەبی ناچیرۆکی زۆرتر شیعر و شانۆنامە ئەگرێتەوە کە هەر کام لەم دوو لقە بۆ خۆیان بەسەر چەند بەشی بچووکتردا دابەش ئەکرێن. هەڵبەت چەند بەشێکی شیعر وەک شیعری گێڕانەوەیی و هەندێ بەشی شانۆنامە وەک شانۆنامەی مێژوویی ناچنە ناو خانەی ئەدەبی ناچیرۆکییەوە چونکە بۆ خۆیان چیرۆکێک ئەگێڕنەوە. کەواتە ئەدەبی ناچیرۆکی زۆرتر شیعری غینایی و تا ڕادەیەک شیعری دراماتیک و شانۆنامەی دەروونناسانە و کۆمێدی ئەگرێتەوە.

**ئەدەبی ناوچەیی** **vernacular literature**

ئەدەبی ناوچەیی کە بۆ خۆی بەشێکە لە ئەدەبی چیرۆکی، نواندنەوەی وردی شوێنکات، زاراوە، بن زاراوە، جلوبەرگ، ئاکار و شێوەی بیرکردنەوە و هەستە جیاجیاکانی ناوچەیەکی دیاریکراو و لەخۆ ئەگرێ. هەندێ جار سەرجەم بەرهەمەکانی تاقە نووسەرێک سەبارەت بەناوچەیەک و نموونەی ئاوەها بەتایبەت لە ئەدەبی ئەمریکیدا وەبەرچاو ئەکەوێت. بۆ وێنە، لە بەرهەمەکانی مارک تواین[١]دا تایبەتمەندییە تاکەکەسی و کۆمەڵایەتییەکانی ناوچەی میسیسیپی[٢] و شێوە ژیانی خەڵکی ئەوێ بەوردی باس کراوە. لە ئەدەبی ناوچەییدا زۆربەی کات تایبەتمەندییەکی بەرچاوی ئەو ناوچەیە و لایەنی جیاکەرەوەی لە ناوچەکانی تر زەق ئەکرێتەوە.

**ئەدەبی واقیع بێز، ئەدەبی دوور لە واقیع** **escapist literature**

ئەم ئەدەبە هەروەک بەناوەکەیدا دیارە، خۆی لە قەرەی واقیع و بابەتەکانی واقیع نادات و هەر بۆیە ناتوانێ ڕوانگەکانی خوێنەر دەربارەی ژیان و لایەنە جیاجیاکانی بەربڵاوتر و قووڵتر بکاتەوە. ئەم ئەدەبە بەگشتی ناچێتە ناو خانەی ئەدەبی جیددی و ڕەسەنەوە و چەند بابەتێکی خەیاڵی و دوورە واقیع (واقیعی ناوەکی و دەروونناسانە یان واقیعی دەرەکی و کۆمەڵناسانە) لەخۆ ئەگرێ.

جیا لەم پێناسەیەی سەرەوە، ئەم زاراوەیە بەمانای چیرۆکە خەیاڵیی و پۆلیسییەکانی

---

1- Mark Twain (1835-1910).

2- Mississippi.



نێو گۆڤارە جەماوەرییەکانیش بەکارئەبرێ. نووسەرانی ئەم چەشنە ئەدەبە ناتوانن پێگەیەکی ئەدەبی و مەعریفی لەو زمانەدا بۆ خۆیان دەستەبەر بکەن.

هەندێ جاریش لەم زاراوەیە بۆ دەستنیشانکردنی ئەو جۆرە ئەدەبە کەڵک وەردەگیرێ کە یەکەم مەبەست و دوا مەبەستی بەخشینی چێژ بەخوێنەرەکانیەتی. ئەم ئەدەبە کار لە هەست و مێشکی خوێنەر ناکات و خوێنەرە ساکار و مام ناوەندییەکان پتر بەمەبەستی پڕکردنەوەی کات ئەیخوێننەوە و زۆرتر بابەتی ڕووداو و کارەسات تیایدا بەرجەستەیە.

**ئەدەبی یۆتۆپیایی** **utopian literature**

یوتۆپیا وشەیەکی بەڕەگەز یۆنانییە و بەمانای (هیچستان)ە. زاراوەی ئەدەبی یوتۆپیایی بۆ ئەو تاقمە بەرهەمە بەکارئەبرێ کە باسی کۆمەڵگایەکی ئارمانی تیایاندا ئاراستە کراوە. یەکەم بەرهەمی ئەدەبی یۆتۆپیایی لەسەر دەستی ئەفلاتوون هاتە ئاراوە و پاشان لە سەردەمە جیاجیا مێژووییەکاندا ئەدەبی یۆتۆپیایی بەپێی پێوەر و بیرۆکە مەعریفییەکانی ئەو سەردەمە سەری هەڵداوە. ئەم زاراوەیە بەگشتی بۆ دەستنیشان کردنی ئەو جۆرە ئەدەبە بەکارئەبری کە باسی حکوومەتێکی سیاسی ئایدیال یان شێوە ژیانێکی ئایدیال ئەکا، نموونە بەرچاوەکانی ئەم چەشنە ئەدەبە بریتین لە کۆمار[١]ی ئەفلاتوون[٢]، یۆتۆپیا[٣]ی سێرتامس مۆر[٤] و زانستی نوێ[٥] بەرهەمی فرانسیس بیکەن[٦].

**ئەدەبییەت** **literariness**

ئەم زاراوەیە ڕۆنراوەی ڕۆمەن یاکۆبسن-ە و لە وتارێکدا بەناونیشانی (شیعری ڕوسیی هاوچەرخ) لە ساڵی ١٩٢١-دا ئاماژەی بۆ کردووە. ئەو دەڵێ: «بابەتی لێکۆڵینەوە لە زانستی ئەدەبیدا ئەدەب نییە بەڵکو "ئەدەبییەت"ە، واتە، ئەوەی کە بەرهەمێکی ئاسایی ئەکاتە بەرهەمێکی ئەدەبی). یاکوبسن لە درێژەی ئەو گوتانەی سەرەوەدا پێ لەسەر ئەو خاڵەش دادەگرێ کە مێژوونووسگەلی ئەدەبی لەبری سەرنجدان بەخودی زانستی ئەدەبی و ئەدەبییەتی ئامادە لە بەرهەمی ئەدەبیدا زۆرتر لە هەندێ بواری دیکەی وەک دەروونناسی،

---

1- Republic.

2- Plato (427-347 B. C.).

3- Uto pia.

4- sir Thomas More (1477-1532).

5- New Atlantis.

6- Francis Bacon (1561-1626).

مرۆڤناسی، سیاسەت و فەلسەفە کەڵکیان وەرگرتووە و، دیارە لێرەدا یاکوبسن وای بۆ دەچێ کە ئەو بابەتانەی ئاماژەیان بۆ کرا پێوەندییان بەئەدەبەوە نییە و ئەم جۆرە بەرهەمانە بەئەدەبی نازانێ.

پاش یاکوبسن، بوریس ئایخنباوم لە وتاری (ژینگەی ئەدەبی)دا زۆر لەسەر ئەم بابەتە ئەچێ و دەنووسێ: «واقیعی مێژوویی – ئەدەبی بیانایەکی ئاڵۆزە کە تیایدا دەوری بنچینەیی و سەرەکی ئەدەبییەت ئەیگێڕێ». ئەم شێوە ڕووبەڕووبوونەوە پسپۆڕانەیە لەگەڵ ئەدەب و ئەم جۆرە لێکۆڵینەوە بەتایبەتمەندیی سەرەکی فۆرمالیزمی ڕوسی دێتە ئەژمار. لەم ڕوانگەیەوە لێکۆڵینەوە لە ئەدەب نەک هەر لە بوارە جیاجیاکانی تر جودا ئەکرێتەوە بەڵکو هەوڵیش دەدرێ تاکو لێکۆڵینەوە لە ئەدەب تەنانەت لە شێوە هونەرییەکانی تر جیا بکرێتەوە. ئەوان لەسەر (پسپۆڕێتی)ی ئەدەب پێداگری دەکەن و پێیان وایە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی ئەدەب، واتە لێکدانەوەی ئەدەبیەتی ئامادە لە بەرهەمە ئەدەبییەکاندا، ئەبێ بەشێوەیەکی تەواو پسپۆڕانە و لە ڕێگەی هەندێ زاراوەی تایبەتەوە سەربگرێ.

**ئەدیبان (١)** **literati**

**ئەدیبان (٢)** **men of letters**

**ئەرشیڤ** **archive**

**ئەرێیانە ⟵ پۆزیتیڤ**

**ئەزموون؛ تاقیکاری** **experiment**

**ئەزموونخوازی** **empiricismt**

**ئەزموونی؛ تاقیکارانە** **expenmental**

**ئەزموونی مرۆیی** **human experience**

**ئەشقی ئەفلاتوونی ⟵ ئەوینی ئەفلاتوونی**

**ئەشقی دەرباری ⟵ ئەوینی دەرباری**

**ئەفسانە** **legend**

**ئەفسانەگەلی نەتەوەیی** **folktales**

**ئەفسانەیی** **legendary**

**ئەقڵ؛ ئاوەز** **reson (2)**



**ئەقلانی؛ ئاوەزیانە** **rational**

**ئەقلانی کردنەوە؛ ئاوەزی کردنەوە** **rationalization**

**ئەقلانیەتی ئامرازی؛ ئەقڵیەتی ئامرازی** **instrumental rationality**

ئەم زاراوەیە زۆرتر لەسەر دەستی ڕەخنەگرانی فەلسەفەی مۆدێرنیتەوە هاتە ئاراوە و بەهۆی کاریگەرێتی بیرمەندانی قوتابخانەی فرانکفۆرتەوە، کە ڕەخنەیان لە ئەقلانییەتی وشکی فەلسەفەی پاش دیکارتی ئەگرت، لە دەقە فەلسەفییەکانی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم بەم لاوە بەلێشاو ئاماژەی بۆ دەکرێ.

بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە خۆی لە خۆیدا تیشک ئەخاتە سەر یەکێ لە ئاکامە خراپەکانی فەلسەفەی مۆدێرنیتە کە زۆرتر فەلسەفەی نێوان دیکارت و نیچە ئەگرێتەوە و بەشێک لە فەلسەفەی سەرەتای سەدەی بیستەمیش لەخۆ ئەگرێ. ئەقلانییەتی ئامرازی واتە ئەو پێگە فیکرییەی کە بڕوای تەواوی بەجیاکاری سووژە و ئۆبژە هەیە و هەر بەم بۆنەشەوە دەرفەتی ئەنجامدانی هەر چەشنە کار و کردەوەیەک بەسووژەی ئەقلانی دەدات. ئەم ڕوانگەیە لە بەرزترین ئاستی خۆیدا دەسەڵاتی سووژە بەسەر ئۆبژەدا دەگۆڕێ و دەیکاتە دەسەڵاتی سووژە بەسەر سووژەدا. لە ڕوانگەی فەلسەفەکارانی قوتابخانەی فرانکفۆرتەوە ئەم چەشنە ئەقڵییەتە ئاکامی نامرۆڤانەی زۆری بەدواوەیە و کۆمەڵکوژیە جیاجیاکانی سەدەی بیستەم و کارەساتە جەرگبڕەکانی هەردوو جەنگی جیهانی بەئاکامی بەکارهێنانی وەها ئەقڵیەتێک دادەندرێ. بەواتایەکی دیکە ئەقڵییەتی ئامرازی مرۆڤ دەکاتە ئامرازێک لەپێناو ئەقڵی خۆیدا، ئەو ئەقڵەی کە جێگەی گومان و لێ پرسین نییە؛ ئەمەشی لە خوێندنەوە یان چەوت خوێندنەوەی بەرهەمی فەلسەفەکارانی سەردەمی مۆدێرنیتەوە فێر بووە. ئەگەرچی ئەقڵییەتی ئامرازی وەکو ڕوانگەیەک لە فەلسەفەی پۆزیتیڤیزم جیایە، بەڵام هەردووکیان تا ڕادەیەک لە هەندێ خاڵدا هاوبەشن.

**ئەقلانییەتی مەبەستدار** **purposive rationality**

**ئەقڵبێزی ⟵ دژە ئەقڵخوازی (٢)**

**ئەقڵی هاوبەش ⟵ تێگەیینی گشتی**

**ئەقڵی هێژ مۆنیک؛ ئەقڵی زاڵ** **hegemonic reason**

**ئەقڵییەتی ئامرازی ⟵ ئەقلانییەتی ئامرازی**

## ئەکسپریسیۆنیزم؛ قوتابخانەی دەربڕینخوازی Expressionism

ئەکسپریسیۆنیزم بزووتنەوەیەک بوو لە ئەڵمانیا لە نێوان ساڵەکانی ١٩١٠ و ١٩٢٥دا کە لە ئەدەب و پتر هونەرەکاندا و بەتایبەت لە هونەرە دیدارییەکاندا سەری هەڵدا. لایەنگرە سەرەکییەکانی ئەم قوتابخانەیە لە هەندێ نووسەر و هونەرمەند پێک هاتبوو کە بەشێوەگەلی جیاجیا لە وێناکردنی ڕیالیستیکی جیهان و ژیان خۆیان دوور خستبووەوە و لە هونەرەکەیاندا هەوڵیان دەدا هەلومەرجی هەستیارانەی بەهێز و دیتەنی مێشک و زەینی خۆیان دەربڕن. لە نیگارکێشیدا ڤین سێنت ڤان گۆک[1] و ئیدڤاردمونش[2] و پۆل گۆگن[3] بەپێشەنگ و لایەنگری ئەم قوتابخانەیە دادەنرێن. هەڵبەت ئەکرێ بگوترێ ڕەگوڕیشەی ئەم قوتابخانەیە پێشتر لە نێو هەندێ نووسەری سەدەی نۆزدەهەمدا وک شارڵ بودلێر[4]، فیدۆر داستایۆڤسکی، فریدریش نیچە و شانۆنامەنووسی سویدی ئۆگۆست ستریند بێرگ[5]دا کوترابوو.

ئەکسپریسیۆنیزم هیچ کات ڕواڵەتی بزووتنەوەیەکی یەکگرتوو و یەکدەستی نەبووە. بەڵام ئەکرێ بگوترێ کە تایبەتمەندیی ناوەندیی ئەم قوتابخانەیە سەرکێشییە لەدەست نەریتی ئەدەبی و هونەریی ڕیالیزم، هەم لە بابەتدا و هەم لە شێوازدا. هونەرمەندی ئەکسپیریسیۆنیست ڕوانینی تاکەکەسیی خۆی دەربارەی ژیانی مرۆیی و کۆمەڵگای مرۆیی دەردەبڕێ. ئەم ڕوانینە زۆربەی کات کاردانەوەیەکی هەستیارانەیان پڕ گیروگرفتی زەینی هونەرمەندەکەیە و وەها دەربڕینێک لە ڕێگەی گەورەکردنەوە یان گۆڕینی شێوەی ئەو فۆرمانەی ڕیالیزمی هونەریەوە سەرئەگرێ کە بانگەشە بۆ بابەتیبوونی جیهانی دەرەوە دەکات. بەرهەمی ئەکسپرسیۆنیست بەشێوەیەک بابەتەکان ئەنوێنێتەوە کە ئەزموونی مرۆڤێکی تاک یان تاکێکی تەنیای پێوەدیارە کە لە کۆمەڵگای شارستانی و تەکنۆلۆژیک و پیشەسازانەی هاوچەرخدا بەتەواوەتی تەنیایە و تووشی مەترسی هاتووە. لە ڕوانگەی ئەم نووسەر و هونەرمەندانەوە ئەم کۆمەڵگایە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پتر لە ئاژاوە و پشێوی نزیک ئەبێتەوە.

1- Vincent Van Gogh.

2- Edvard Munch.

3- Panl Ganguin.

4- Charles Bandlaie.

5- August Strindberg.



ئەکسپریسیۆنیزم لە ئەدەبدا فرەتر خۆی لە چەشنی ئەدەبیی شانۆدا بینییەوە و جۆرج کەیزر[1]، ئێرنێست تۆلێر و[2] بێرتۆڵت برێشت[3] (بەتایبەت لە یەکەمین بەرهەمەکانیدا) بەشانۆکار و شانۆنامە نووسەر کاریگەرەکانی ئەم قوتابخانەیە لە قەڵەم دەدرێن. شانۆنامە نووسگەلی ئەکسپریسیۆنیست لەبری کەسایەتییە ئاسایی و تاکەکان زۆرتر هەندێ تیپ و چەشنی مرۆیی بێ ناونیشان ئەنوێننەوە لە جیاتی گەلاڵەیەکی یەکگرتوو چەند بەشێکی خێرا و بچووکی نواندنەوەی دۆخی هەستیارانەی زەینی ئەو کەسایەتیانە ئەخەنە ڕوو. گوتەی کەسایەتییەکان لەم چەشنە شانۆیەدا پارچە پارچەیە و تووێژەکان فرەتر بۆ هەندێ دەستەواژە و ڕستەی کورت و نایەکگرتوو کورت ئەکرێنەوە. لە چەند نموونەیەکی شانۆی ئەکسپرسیۆنیستیدا کەسایەتییەکان بەدەمامکەوە یان بەهەندێ ناوی دەرهەستەوە دێنە سەر سەکۆی شانۆ. ئەو نوێکاریانەی سەرەوە، بۆ نموونە، ئەکرێ لە بەرهەمەکانی ماکس ڕاینهارت[4] دا ببینرێ کە ئەرکی دەرهێنانی هەندێ شانۆنامەی ستریندبێرگ و چەند شانۆنامەنووسێکی ئەکسپرسیۆنیستی ئەڵمانی لە ئەستۆ گرت کە لەو نواندنانەدا کەڵکی تازە و زۆری لە ڕەنگە جیاجیاکان و سەکۆ نوێکان وەردەگرێت. ئەم شێوازەی شانۆی ئەڵمانی شوێنی زۆری لەسەر شانۆی ئەمریکی دانا و شانۆی ئیمپراتۆر جۆنس[5] (١٩٢٠) نووسینی یوجین ئۆنیل[6] و شانۆی ماشێن حیساب[7] (١٩٢٣) بەرهەمی ئێلمێر ڕایس[8] بەنموونە سەرەکییەکانی شانۆی ئەکسپرسیۆنیستی لە ئەدەبی ئەمریکیدا دادەنرێ. ئەم قوتابخانەیە لە دەوروبەری ساڵی ١٩٢٥دا ڕووی لە کزی کرد و لە ئاکامدا بەهۆی هاتنە سەر دەوری نازییەکان لە سەرەتای سییەکاندا بەتەواوی هەرەسی هێنا، بەڵام تەنانەت ئەمڕۆکەش بەسەر ئەدەب و هونەری ئەورووپی و ئەمریکی و بەم دواییانەش ئەدەبی ڕۆژهەڵاتەوە شوێنی دیارە.

1- Georg Kaiser.

2- Ernst Tocler.

3- Bertolt Brecht.

4- Max Reinhardt.

5- The Emperor Jones.

6- Engene O'Neil.

7- The Ading Machine.

8- Elmer Rice.

**ئەگنۆستیسیزم** **agnosticism**

ئەگنۆستیسیزم بریتییە لەو ڕوانگەیەی کە بڕوای بەتوانای مرۆڤ بۆ ناسینی خواوەند نییە. ئەم ڕوانگەیە پێی وایە مرۆڤ جگە لە ناسینی شتە مادی و بەرهەستەکان قەت لە ناسینی بابەتە دەرهەستەکان و میتافیزیکدا ناتوانێ سەر بکەوێ. بیری ماتریالیستی و زەوینی و ئاکاری سکۆلاریستی دوو ئاکامی بیرۆکە ئەگنۆستیکەکانن. لە هەندێ لە سەردەمەکانی مێژووی مرۆڤایەتیدا ئەم شێوە ڕوانینە بەتوندی خراوەتە بەر ڕەخنە و بەرەوبڕ کراوە. بۆ نموونە، لە چەرخەکانی ناوەڕاستدا و بەبڕوای فەیلەسووفە ئایینییەکانی سەردەمە مێژووییە جیاجیاکان ئەم ڕوانگەیە بەتوندی مەحکووم کراوە و تەنانەت لایەنگرانی ئەم ڕوانگەیەش بەکافر و دژ بەخوا ناویان لێ براوە.

**ئەگەر** **possibility**

**ئەگەر (دار)** **possible**

گرنگایەتی دوو زاراوەی ئەگەر و ئەگەر (دار)، لەوەدایە کە لەگەڵ دوو زاراوەی دیکەی شیمانە و شیاو لە وەرگێڕانی ئینگلیزیی کتێبی بووتیقای ئەرەستوودا لە یەکتر جیا کراونەتەوە. ئەرەستوو لە وەڵامی ڕەخنەی ئەفلاتوون دژی ئەدەب باسی (شیمانەی بێ ئەگەر "نائەگەردار") و (ئەگەری نەشیاو) ئەکات.

بەبڕوای ئەرەستوو ئەرکی شاعیر تەنیا لاسایی کردنەوەی توخمە ئامادەکانی سروشت نییە و بەڵکو ناچارە بابەتەکە بەشێوەیەک بنوێنێتەوە کە خاڵە سەرەکییەکانی و حەقیقەتە گەردوونییە شاراوەکانی ئەو توخمانە وەدەرکەون، کەواتە ڕوانگەیەکی بەربڵاوتر سەبارەت بەو بابەتە بەدی دێ. ئەو جیهانەی شاعیر ئەیخولقێنێ جیهانێکی بێ ئەگەرە و لە جیهانی واقیع جیایە. جیهانی واقیع خاوەن یاساگەلی تایبەت بەخۆیە و لەوێ ڕووداوە جیاجیاکان شیاون. لەلایەکی ترەوە مێژوونووس لەم خاڵەدا لە شاعیر جیاوازە کە ڕووداوەکان بەهەمان شێوە کە هەن یان پێی وایە کە بەو شێوە ڕوویان داوە ئەنووسێتەوە. کەواتە، لە ڕوانگەی ئەرەستووەوە بایەخی شیمانەی بێ ئەگەر (واتە ئەدەب) لە ئەگەری نەشیاو (واتە مێژوو) زۆرترە.

**ئەمئەو؛ وەک یەک؛ چونیەک (١)** **identical**

**ئەمئەوێتی؛ چونیەکێتی (١)** **identity (1)**

ئەمئەوێتی زاراوەیەکی فرە پاتی فەلسەفەیە کە لە فەلسەفەی ئیسلامیدا پتر لەلایەن



ئیبنی سینا و فارابییەوە و، لە فەلسەفەی ڕۆژئاوادا زۆرتر لەسەر دەستی لایبنیتس[١]، شێلینگ و هێگڵ-ەوە ئاراستە کراوە. لە تیۆری ئەدەبیی هاوچەرخیشدا، بەتایبەت لە بۆچوونی دەروون شیکارانەی لاکانیدا و تیۆری ئەدەبیی زمانناسانەدا بەکار ئەبرێ. ئەمئەوێتی یەکێ لە وێنا بنەڕەتییەکانی فیکرە. ئەم چەمکە بۆ بەراوردکاریی گشتی دوو چشتی لیک جیا بەکار ئەبرێ. بەواتەی ئیبنی سینا «ئەمئەوێتی بریتییە لە یەکیەتی بارودۆخی دوو چشت، بەچەشنێ کە ئەم دۆخە یەکێک لە جۆرەکانی یەکیەتی نێوان ئەو دوو چشتە پێک دەهێنێ». جۆرەکانی یەکیەتی لە ڕوانگەی ئیبنی سیناوە بریتین لە: یەکیەتی لە چۆنایەتیدا، یەکیەتی لە وێکچووندا، یەکیەتی لە شێوەدا، یەکیەتی لە چەشندا و یەکیەتی لە دۆخی پاژەکاندا. بەڵام فارابی پێی وایە ئەمئەوێتی هەمان یەکیەتی و بوونە. ئەگەرچی ئەمئەوێتی هەڵگری هەندێ مانای جیاوازە، بەڵام ڕەنگە گرنگترین واتای ئەم زاراوەیە بریتی بێ لە پێوەندی و هاوکێشی نێوان دوو بابەت، دوو چەمک یان دوو چشت کە سەرەڕای جیاوازییە ئامادەکانی هەردووکیان خاوەن چەند تایبەتمەندییەکی هاوبەشن. بەڵام بەبڕوای لایبنیتس دوو چەشت ناتوانن بەتەواوی چونیەک و دەقاودەقی یەکتر بن، چونکە ئەگەر لە نێوان دوو چشتدا لە هەر بارێکەوە یەکیەتی و یەکبوون لە ئارادابێ کەواتە ئیتر ئەوانە یەک چشتن نەک دوو چشت.

ئەگەرچی لە بیری ڕەخنەیی و تیۆریکی قوتابخانەی بنەماخوازیی ئەدەب و هونەر و کۆمەڵناسیدا زاراوەی ئەمئەوێتی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بایەخی دراوەتێ و بەشێوەیەکی بەرهەست ئاماژەی بۆ نەکراوە، بەڵام لە قوتابخانەی پاش بنەماخوازیدا کە ئەم زاراوەیە بەلێشاو و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ گرنگایەتی پێ ئەدرێ، ڕەخنە و تیۆری ئەدەبی پاش بنەماخوازانە کە لەژێر کاریگەرێتی دەروونشیکاریی لاکانی و نیئۆمارکسیزمی ئاڵتوسێری دایە، لەم زاراوەیە بەمەبەستی نواندنی یەکیەتی نێوان دوو چەمک یان بوونەوەر کەڵک وەردەگرن؛ بۆ نموونە، ئەمئەوێتی نێوان منداڵی پێش فێربوونی زمانی و دایکی، ئەمئەوێتی نێوان منداڵ و سروشت (لە قوتابخانەی ڕۆمانتیسیزمدا)، ئەمئەوێتی نێوان زەین و بابەت (لە فەلسەفەی یەکیەتی بوون و فەلسەفەی هێگڵدا)، ئەمئەوێتی نێوان مرۆڤ و ئایدیۆلۆژیا (لە بیری ڕەخنەی نیئۆ مارکسیستیدا)، ئەمئەوێتی نێوان مرۆڤ و خوا (لە تەشقی عیرفانی ڕۆژهەڵاتیدا)، ئەمئەوێتی نێوان خوا و عیسا پێغەمبەر و ڕۆحی

1- Gottfried Wilhelm Leipniz (1646 - 1716)

پیـرۆز، واتە جوبرەئیل (لە ئاییینی مەسـیحی ترینیتـی[1]دا) و ئەمـئـەویێتی نێـوان ڕۆحی مرۆڤ پێش لەدایکبوون و پاش مردن لەگەڵ خوادا (لە قوتابخانەی نێئۆ ئەفلاتوونیزمدا). ڕەنگە گرینگترین نموونەی ئەمئەویێتی و زمان بێت.

**ئەمئەویێتی زەینیەتی مرۆیی، شوناسی زەینیەتی مرۆیی** — **identity of human subjectivity**

**ئەمپرێسیۆنیزم** — **impressionism**

ئەمپرێسیۆنیزم زاراوەیەکی بەربڵاوە کە زۆربەی کات بۆ شێوازی زەینی و کەسانەی تا ڕادەیەکی زۆر دەسـتنیشـان ئەکرێت. ئەم زاراوەیە لە هونەری شـێـوەکـارییـەوە هاتۆتە ناو ئەدەبەوە و ئەو قوتابخانە شێوەکارییە ئەگرێتەوە کە لە نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەیەویست تەنیـا کـاریگەرێتی کـەس، چشت، دەشت و دیمەن لەسـەر هونەرمـەند یان ڕوانگەی تاکـەکـەسی هونەرمـەند بۆ ئەوانە دەسـتـەبەر بکات و نەک بەو شـێـوەیەی لە قوتابخانەی ڕیالیزمدا باوە هەموو شتێک بەشێوەیەکی واقیعخوازانە و بەبێ ڕەچاوکردنی بیروڕا تاکەکەسی و کەسانییەکانی هونەرمەند بنوێنێتەوە. شێوەکارانی دامەزرێنەری ئەم قـوتابخـانەیە بریتی بوون لە: کلۆدمـۆنە[2]، پییـێـررێنوار و بێـرت مـۆریسـۆ، کـە لە بەرهەمەکانیاندا بەشێوەیەکی زەینی ڕوانگەی خۆیانیان سەبارەت بەدارستان و گوڵزار و تەنانەت کلیـسـاکـان دەرئەخست، هەروەهاش کـاریگەرێتی ئەو دیمەنانە لەسەر هەسـتی دیداری و هەستی لێ خشانی مرۆڤ پێشان ئەدەن و بەلایانەوە گرنگە. لەم قوتابخانەیەدا گـرنگی ئەدرێتـە کـارتێکردنی تیـشـکی ڕووناکی و دابەشبـوون و شکانەوەی ڕەنگەکـان، هەروەهاش خاڵی ڕوانینی نەگۆڕ لە ساتە جیاجیاکانی شەو و ڕۆژدا و بەهۆی کاریگەرێتی تیشکی خۆرەتاوەوە ئەکێشرێ، هەر بۆیە سروشت لە هونەری ئەمپرسیۆنیستیدا تێکەڵێکە لە ساتە جیاجیاکانی شەو و ڕۆژ.

لە کـۆتایی سـەدەی نۆزدەهەم و سـەرەتـای سـەدەی بیـسـتـەمـدا کـۆمـەڵێ ڕۆمـاننووسی فەرەنسی و ئینگلیزی هەوڵیان دا ئەم شێوازە ئەمپرسیۆنیستیە لە ئەدەبیشدا بەکار بهێنن. مارسل پرووست-ی فەرەنسی، جەیمز جۆیس-ی ئیرلەندی و بەتایبەت ڤیرجینیاوولف-ی ئینگلیزی هەوڵیان داوە شێوازێکی تەواو زەینی بۆ وەسفکردن و گێڕانەوە بەکاربهێنن و لە بری پێ داگرتن لەسەر واقیعەکانی دەوروبەری ژیانی کەسێتییەکان پتر هەوڵی ئەوە ئەدەن

1- Trinity.

2- Clande Monet (1840-1926).



کە قـورسایی بخەنە سـەر لایەنی ژیانی زەینـی و کەسـانی کەسـێـتـییـەکان، کـە زۆرتر لە ڕواڵەتی گـێـڕانەوە و وتنەوەی بیـرەوەرییـەکـان و واتاکـێشـەکـییـەکـانی ڕوانگە عـاتیـفی و ناوەکیەکانی کەسێتییەکان وەدەردەکەوێ. دوو نموونەی سەرەکی بەکارهێنانی بنەواشەکانی قـوتابخانـەی ئەمپـرێسیـۆنیـزم لە ئەدەبی مۆدێرنیـسـتـیدا بریتین لە ڕۆمانی بەرەو فـانۆسی دەریایی[1]، نووسیـنی ڤیـرجـینیـاوولف و، ڕۆمـانی وێنەی هونەرمـەند وەکو گـەنجێک[2] بەرهەمی جـەیمز جـۆیس[3]، کـە لە هەردووکـیـانـدا لە بری بایەخـدان بەدەوروبەر و ژینگەی کـەسـێـتـیـیـەکـان و خـسـتنـەڕووی واقیـعـی دەرەکی ژیـان و کـۆمـەڵگا زۆرتر دۆخی ناوەکی کەسێتـیـیـەکان و واقیـعی زەینی ئەوان نوێندراوە. لە ڕۆمـانی وێنەی هونەرمەندەوە وەکو گەنجێک، بۆ نموونە، جۆیس لەباتی نواندنەوەی ژینگە و واقیعی دەرەکی شاری دووبلین لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا پتر کەڵکەڵە ناوەکی و عـاتیـفیـیەکانی کەسێتی سەرەکی ئەو ڕۆمانەمان بۆ وێنا دەکات کە ئیـستیفان دێدالوس[4]-ە و، لەم ڕێگەیەشەوە کێشە ناوەکی و فیـکرییـەکانی کەسێتی سەرەکی ڕۆمـانەکە لە جیـاتی نواندنەوەی ساکـار و بابەتیـانەی واقیعی دەرەکی بۆ خوێنەر بەرجەستە ئەبێتەوە.

**ئەمێتی** — **thisness**

**ئەنجام، ئاکام (١)** — **conclusion**

**ئەنجام، ئاکام (٢)؛ پاشکۆ** — **epilogue**

زاراوەی (ئێـپـیلۆگ) کە لە کوردیدا بەمانای ئەنجام و ئاکـامـە، لە پێـشگری (ئێـپی) بەمـانای پاش و پاشکۆ و ناوی (لۆگ) بەمـانای کەلام یان لۆژیکی زارەکی پێکهـاتووە. کەواتە لە کـوردیدا ئەکـرێ بەشـێـوەی (پاشگوتن)یش بێـتـە بەکـارهێنان. جـیـا لەمـەش دوابەشی شـانۆنامـە کـلاسیـکەکـانی سـەردەمی یۆنان و ڕۆمی کـۆن بە(ئێپیلۆگ) ناوبردە کراون کە لە ڕاستـیدا ئەنجـامی شانۆنامەکـەیە و چەند ئامـۆژگـاری ئەخلاقـیشی تێدایە. ئەوڕۆکـە زاراوەی (ئێـپـیلۆگ) بەمـانای پاشکۆ یان بەشی زیادەی کـتـێب و نامـیلکە فەلسەفی و ڕەخنەییەکان بەکار ئەبرێ.

1- To the Lighthouse.

2- The Portrait of the Artist As a Young Man.

3- James Joyce (1882-1941).

4- Stephan Pedalus.

**ئەنجامگیری ← ئاکامگیری**

**ئەنجامگیریی بەرزایی ← ئاکامگیریی بەرزایی**

**ئەنجامنامی، ئاکامناسی** **teleology**

**ئەندامەوار ← ئۆرگانیک**

**ئەنسایکلۆپیدیا؛ فەرهەنگی زانیاری** **encyclopedia**

**ئەوپەڕ دەق** **para text**

**ئەوپەڕ زماننناسانە** **para linguistic**

**ئەوپەڕ زماننناسی** **para linguistics**

زانستی ئەوپەڕ زماننناسی بریتییە لە خوێندنەوە و بەکارهێنان و توێژینەوەی ئەو کردەوە نازماننناسانانەی وەک، گۆڕینی شێوەی ڕوخسار و بزواندنی دەست و پێ بەمەبەستی ڕاگەیاندنی واتا و پەیامێک، کە زۆربەی کات ئەکرێ لە گواستنەوەی پەیام لە بێژەرەوە بۆ بەردەنگ سوود بەخش بێت. ئەو کردەوانە بە(تایبەتمەندی ئەوپەڕ زماننناسانە) ناودێر کراون.

تایبەتمەندیگەلی ئەوپەڕ زماننناسانە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر و بەتایبەت لە کولتورێکەوە بۆ کولتوریکی تر جیاوازن. هەندێ جاریش هەوای قسەکردن بەبەشێک لە تایبەتمەندیی ئەوپەڕ زماننناسانە دادەندرێ، چونکە لەم بەستینە تایبەتەدا هەوای قسەکردن شێوە ڕوانینی بێژەر بۆ بابەتەکە چاکتر دەرئەخا. ئەمەش یاریدەدەری تێگەیینە لە گوتەی بێژەر لەلایەن بیسەر یان بەردەنگەوە.

**ئەوێتی ← شوناس**

**ئەوی دی؛ ئەوی دیکە** **Other, the**

**ئەوی دیکەیی** **Otherness**

(ئەوی دیکە) و تایبەتمەندییەکەی کە بە(ئەوی دیکەیی) ناسراوە لە ڕاستیدا پاش کاریگەریتی فەلسەفەی دیکارت هاتە نێو باسە فەلسەفیەکانەوە و ئەورۆکە تەنانەت لە باسە سیاسییەکانیشدا بەکارئەبرێ و بەم دواییانەش لە دەروون شیکاریدا پەرەی زۆری پێ دراوە. دیکارت لە بیرکردنەوەکانیدا ئاماژە بۆ جیاوازی نێوان جەستە و ڕۆح ئەکات کە هەرکامیان تایبەتمەندی و تەنانەت شوناسی سەربەخۆیان هەیە. ئەم پێناسەیە لە ئەقڵخوازی سەدەی حەڤدەمدا و پاشان لە ڕوانگەی لایبنیتس-ەوە کە شوێنی زۆری لەسەر



فەلسەفەکارانی چاخی مۆدێرنیتە دانابوو بەجیاوازی نێوان مرۆڤ و سروشت. بەواتایەکی دیکە ڕۆح ئەوی دیکەی جەستەیە و سروشت ئەوی دیکەی مرۆڤە. پێشکەوتنی ڕۆژئاوا لە باری پیشەسازانە و فیکری و ئەقڵانییەوە بوو بەهۆی ئەوەی کە ئەورۆکە لە باسە سیاسییەکانی ڕۆژهەڵاتدا وەکو ئەوی دیکە سەیری ڕۆژئاوا ئەکرێ. بەوردی، (ئەویدیکەیی) لە نێوان دوو چشت یان دیاردە و خوددا دێتە ئاراوە کە نەک هەر لێکتر جیان بەڵکو تایبەتمەندی و شوناسیشیان لێکدی جیایە. لەلایەکی ترەوە هەندێ جار لە وتارە فەلسەفی و سیاسییەکاندا ئەوی دیکە لایەنی بەرامبەری خودە، هەر بۆیە جگە لە خودناسی بەم دواییانە بایەخ دراوە بەئەوی دیناسی. ئەوەی کە ئەگوترێ ڕۆژئاوا ئەویدیکەی ڕۆژهەڵاتەوە بیر ئەو بیرۆکەیەمان ئەخاتەوە کە ڕۆژئاوا لە پێگەی ناسکاری دەسەڵاتدار ڕۆژهەڵات وەکو بەرناسی سەرکوتکراو ببینن. لەلایەکی ترەوە، لە دەروون شیکاری قوتابخانەی لاکاندا کەڵکی تەواو لە چەمکی ئەوی دیکە وەرگیراوە. لێرەدا ئەوی دیکە بۆ دەستنیشانکردنی جیایی نێوان منداڵ و وێنەکەی لە ئاوێنەدا یان جیایی نێوان منداڵ و دایک بەکار براوە. هەندێ جار ئەوی دیکە بەگشتی دەسەڵاتی خۆی بەسەرخوددا دادەسەپێنێ. خود چ لە باری سیاسییەوە و چ لە ڕووی دەروون شیکارانەوە سەرلەبەر لەناو ئەوی دیکەدا ئەتوێتەوە. بەواتایەکی تر لەم دۆخە تایبەتەدا خود شوناسەکەی خۆی ئەدۆڕێنی و بەندە بەشوناسی ئەوی دیکەوە.

**ئەوینی ئەفلاتوونی؛ ئەشقی ئەفلاتوونی** **Platonic love**

ئەفلاتوون لە کتێبی میوانی[1]-دا (دێڕی ٢١٢-٢١) ئەو باسەی سوکرات دێنێتە بەرەوە کە لە پیرەژنێکی زاناوە بەناوی دیوتیما[2] بیرۆکەی ئەشق یان ئیرۆس-ی وەرگتووە. بەپێی قسەی دیوتیما ئێمە نابێ لە چوارچێوەی جوانیی جەستەدا خۆمان ببەستینەوە بەڵکو ئەبێ لەو جەستەیە وەکو پەیژەیەک کەڵک وەربگرین و لە جوانیەکەوە بۆ جوانیەکی تر بچینە سەر تاکو لە ئاکامدا لە جوانی جەستەوە ئەگەینە جوانیی زەین. لە کۆتاییدا ئەگەین بەئایدیای (جوانی ڕەها و ساکار و هەتاهەتایی). جەستەی مرۆڤ لەم جوانیە بێ بەش و دوور خراوەتەوە و، جوانی جەستە و جوانی هاماوی جیهان تەنیا ڕەنگدانەوە و نواندنەوەی دەست تێبراوی ئەو جوانیە ڕەهایەیە. پاشان لە سەدەگەلی سێیەم تا پێنجەمی زایینیدا کە فەلسەفەی نیئۆ ئەفلاتوونی زاڵ بوو ئەو تیۆرە بەشێوەیەکی

1- Symposium.

2- Diotima.

رێکوپێکتر دارێژرا کە سەرجەم چاکی و ڕاستی و جوانی لە جیهانی هەست پێکراودا هەر تەنیا تیشکی جوانیەکی ترن کە بەجوانی ڕەها ناوبردە دەکرێ. لە کۆتایی چەرخەکانی ناوەڕاستدا بیرمەندانی مەسیحی سەرەتای ڕۆنێسانس بەهۆی کاریگەرێتی فەلسەفەی نێئۆ ئەفلاتوونی و سیستەمی فەلسەفی پلۆتینۆس بەو ئەنجامە گەییشتن کە جوانی ڕاستەقینەی جەستەی مرۆڤ هەر تەنیا دەرکەوتەی دەرەکی جوانی ئەخلاقی و مینۆکیی مرۆڤە، کە ئەم جوانیەش بۆ خۆی دیسانەوە تیشکی هەمان جوانیی ڕەها یان خواوەندە.

ئاشقی ئەفلاتوونی، واتە ئەو ئاشقەی بڕوای بەئەشقی ئەفلاتوونی هەیە، جوانیی خۆشەویستەکەی بەتایبەت جوانیی فیزیکی دلّدار تەنیا بەنیشانەی ئەو جوانیە مینۆکیە دادەنێ کە دلّدارەکەی لەگەلّ سەرجەم ئافرەتە جوانەکانی تردا هەیانە، هەموویان دەوری پلەی یەکەمی پەیژەیەک ئەگێڕن کە لە حەزی سێکسییەوە دەست پێدەکات و لە کۆتاییدا ئەگاتە بیرکردنەوەی خاوێن و پەتی دەربارەی جوانیی ئاسمانی و پیرۆز لە زاتی خواوەنددا.

ڕەنگدانەوە و کاریگەرێتی ئەم شێوە ڕوانینە ئەفلاتوونیە بۆ ئەشق لە بەرهەمەکانی دانتە و پێترارکدا دەبینرێ و جگە لە چەند نووسەرێکی تری ئیتالّیایی لە شیعری شاعیرە ئینگلیزی و فەرەنسیەکانیشدا، وەک سپێنسێر[1] و تەنانەت شیللی[2]دا بەڕوونی دیارە.

**ئەوینی دەربارەی** **courtly love**

ئەوینی دەربارەی چەشنێکی تایبەتی ئەشقە لە نێوان ئاشقە ئاغاواتەکاندا و زۆرتر لە چەرخەکانی ناوەڕاستدا لە گۆڕێدا بووە و لە شیعرە لیریکەکانی ئەو سەردەمە و ڕۆمانسە شۆڤالیەکاندا بەگشتی نوێندراوەتەوە و (لە کۆتایی سەدەی یازدەهەمەوە تا سەرەتای سەدەی سێزدەهەمی زایینی). لێرەدا ئەشق وەکو نەجیبترین هەستی ئەم جیهانە لە قەلّەم دراوە و ئاشقی دەرباری دلّدارەکەی بەتەواوەتی ئەپەرستێ و تەنانەت لایەنە چاکەکانی ئەو ئەشقە گەورە هەروا ئەکاتەوە و بەگشتی دەبێتە دیلی دەستی دلّدارەکەی. ئەم ئەشقە زۆر لە نێوان شۆڤالیەیەکی سەلّت و ژنێکی مێرددااردا پێکدێ (بۆ نموونە ئەشقی تریستان و ئیزۆلّد[3] یان ئەشقی لانسلێت و گینیڤێر[4]).

1- Edmund spenser (1552-1992).

2- percy Bisshe Shelly (1792-1822).

3- Tristan and I solde.

4- Lancelot Gainevere.



پێویستە بوترێ هاوسەرێتی لەناو ئەندامانی چینی سەروو و ئاغاواتی چاخەکانی ناوەڕاستدا زۆرتر ڕوالّەتی پێوەندییەکی بازرگانی هەبووە بەمەبەستگەلی سیاسی و سوودەدر پێک ئەهات. هەر بۆیە ئاشقی دەرباری کە ناتوانێ بەئاواتی خۆی بگات. جیا لەوەش کە ئەشقەکەی ئەشقێکی قەدەغەیە تووشی نەخۆشی و لاوازی ئەبێت، بەلاّم لە هەمان کاتدا هەر ئەویندارێکی بەسۆزە و هەولّ دەدا ئەم ئەشقەی لە شەڕ و پالّەوانێتیدا بنوێنێ و لە هەلّسوکەوتی نێو دەربارد‌ا، لە ڕێوڕەسم و ئاهەنگە تایبەتەکاندا گەورەیی ئەشقەکەی و وەفادارییەکەی خۆی دەربخا. تەنانەت لێرەدا ئاشق هەولّی ئەوەش ئەدا کە لە قسەکانیدا لە زانستی ڕەوانبێژی و ڕوونبێژی و کەلام کەلّک وەربگرێ و شێوازێکی هونەرمەندانەی ئەدەبی بەکار بێنێ. نموونەی بەرچاوی وەهای ئەشقێک لە ئەدەبی ئینگلیزیدا و لە ڕۆمانسی گاوائین و شوڤالیەی سەوز[1] یان لە ترۆیلوس و کریسید[2] بەرهەمی چاسێر[3] وەبەرچاو ئەکەوێ.

**ئیپیستیم؛ پۆلینکاریی مەعریفە** **episteme**

ئەم زاراوەیە ڕۆنراوی فۆکۆیە و بەشێوەیێکی بەربلاوتر لەلایەن ژاک دێریداوە بەکار هاتووە. مەبەست لە ئیپیستیم لێرەدا سەرلەبەری ئەو پەیوەندی و یاسایانەی گۆڕانە کە هەموو کردەوە گەتارییەکان کۆ ئەکاتەوە. هەروەهاش ئەکرێ لەم زاراوەیە بۆ دەستنیشانکردنی سەردەمێکی مێژوویی تایبەت کەلّک وەربگیردرێ کە تیایدا ئەو پەیوەندی و یاسایانەی گۆڕان کە لە سەرەوە ئاماژەیان بۆ کرا تیایدا بەردەوام و باوبن. کەواتە ئیپیستیم تا ڕادەیەک نزیکایەتی بە(بیرورا زالّەکان)ی مارکس-ەوە هەیە و هەروەهاش پەیوەندی بەپێناسەی تایبەتی ئایدیۆلۆژیا، لە مارکسیزمدا هەیە. بەلاّم ئەورۆکە واتایەکی گشتگیرتر و بەربلاوتری وەدەست هێناوە. واتە، ئیپیستیم هیچ جۆرە مۆلّەتێک بەرێگە جیاجیاکانی بەرهەمهێنانی زانیاری جیا لە خودی خۆی نادات و لێرەدایە کە هۆکانی سەرهەلّدانی ئیپیستمێکی دیکە یان جێگۆڕکێی دوو ئیپیستیم دەبێ دەستنیشان بکرێت.

لەلایەکی ترەوە، ئیپیستیم وەکو بچووکترین بەشی پێکهێنەری وتارە جیاجیاکان دادەندرێ. بەواتایەکی تر گوتارەکان، وەک گوتاری پزیشکی، گوتاری ئاکادمیک، گوتاری

1- Sir Gawaeen and the Green Night.

2- Troilus and Criseyde.

3- Geoffrey Chancer (1342 - 1400).

ڕۆشنبیری، گوتاری کۆمەڵناسانە یان زمانناسانە، بۆ خۆیان لە چەند ئیپیستیم پێکهاتوون کە لە هەر سەردەمێکی مێژووییدا بەپێی زاڵبوون ئەو گوتارە بۆ خۆشیان زاڵ دەبن. ئەو زاراوەیە لە باری داڕشتنەوە لە کۆمەڵێ زاراوەی دیکەی وەک ئایدیۆلۆژیم، فۆنیم و میتیم چێ کراوە.

کەواتە ئەگەر گوتار وەکو کۆیەکی مەعریفی ڕەچاو بکرێ و پاشان پۆلێنکاری بکری پاژە پێکهێنەرەکانی ئەبێتە ئیپیستیم. میشێل فۆکۆ لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئەم زاراوەیەوە هەوڵی داوە ئەوە دەربخات مرۆڤ و بەتایبەت شاعیران و هونەرمەندان و نووسەران لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا تا چ ڕادەیەک پێبەندی ئیپیستیمی زاڵی سەردەمی خۆیان بوونە، یان لە هەمبەر ئەو ئیپیستیمانەدا سەرکەشییان کردووە.

**ئیجابی** ← **پۆزیتیڤ**

**ئیجازی دەربڕین؛ کورتیی دەربڕین** **economy of expression**

**ئیرادەی سەر بەهێز** ← **خواستی سەر بەهێز**

**ئێستای مێژوویی** **historic present**

**ئێستایەتی** **actuality (1)**

**ئیشراق** **intuition**

**ئیشراقی** **intuitive**

**ئیلهام (١)** **afflatus**

**ئیلهام (٢)** ← **سرووش**

**ئیماژیزم، وێنەخوازی (لە ئەدەبدا)** **Imagism**

بزاڤێکی شاعیرانە بوو کە لە ئینگلتەرا و ئەمریکا لە ماوەی نێوان ساڵەکانی ١٩١٢ تا ١٩١٧ ڕوویدا. ئیماژیزم یان ڕەسەنایەتی وێنەی خەیاڵ کرد هۆکاری سەرەکی دوورکەوتنەوە بوو لە نەریتی ئەدەبی پێشوو، وشەی ڕازێنەرەوە، هەستگەرێتی ساکار و بەکارهێنانی خوازەی مردوو بەو شێوەیەی لە ئەدەبی پێشوودا زاڵ بوو (لێرەدا مەبەست لە ئەدەبی پێشوو زیاتر ئەدەبی بەرهەمهێنراو لە سەردەمی جۆرجی پێنجەم دایە واتە ساڵەکانی ١٩٠١ تا ١٩١٠). ئەم بزاڤە کە لەژێر کاریگەرێتی فیکریی تی ئی هیوڵم[1] و

1- T. E. Hulme.



چاوەدێریی وردی ئیزراپاوند[1]، ئەمی لۆوێل[2]، ریچارد ئەڵدینگتون[3]، هیلدا ولیتڵ[4] و تەنانەت دی ئێچ لارێنس[5]-یشدا بوو، لەسەر ئەو تەوەرانەی خوارەوە بنیات نرابوو:

١- ئازادیی هەڵبژاردنی بابەت بەشێوەیەکی بێ سنوور و ڕەها.

٢- چوارچێوەی کێش و سەروا و بڕگەدانانی نوێ.

٣- وێنەی خەیاڵکردی دژوار بەڵام ئاشکرا.

٤- سەرنج ڕاگرتن لەسەر یەک بابەت.

٥- ڕەتکردنەوەی شیعری گەردوونی و پێداگری لەسەر تاکخوازی.

٦- شیعری دژوار و کورت.

**ئیماژیست؛ وێنەخواز** **Imagist**

1- Ezra Ponnd.
2- Amy Lowell.
3- Richard Aldington.
4- Hilda Doolittle.
5- D. H. Lawrence.

## بێ

**بابەت (١) ⟵ ئۆبژە**

**بابەت (٢) ⟵ سووژە**

**بابەتە تایبەتەکان** **individuals**

**بابەتی ڕێبازی ئایینی** **cult object**

**بابەتی؛ بابەتیانە** **objective**

ئەم زاراوەیە کە دژی ئاوەڵناوی (زەینی)یە، لە بنەڕەتدا تایبەتی توێژینەوەی زانستیە. واتە لە زانستدا و بەتایبەت لە ئاکامگیریی زانستیدا بیروڕای زەینیی زانیار و زەینیەتی تایبەت و تاکەکەسی لێکۆڵەرەوەی زانستی هیچ چەشنە کاریگەرێتییەک لەسەر چۆنیەتی ئەنجامەکان دانانێ. کەواتە ڕێڕەوی زانستی ڕێڕەوێکی بابەتیانەیە لە ئەدەبدا، بەڵام، زۆربەی کات خوێنەر ڕووبەڕووی زەینیەتی دانەری بەرهەمی ئەدەبی و ڕوانگە زەینییەکانی نووسەر یان کەسێتییەکانی نێو بەرهەمەکە ئەبێتەوە. ئەم تایبەتمەندییەی ئاماژەی بۆ کرا زۆرتر لە شیعر و بەتایبەت لە ئەدەبی ڕۆمانتیسیستیدا وەبەرچاو ئەکەوێ کە ئەدەبێکی زەینی و دەربڕە. لە قوتابخانەی ڕیالیزمدا، بەپێچەوانەوە، دانەری بەرهەمی ئەدەبی بەشێوەیەکی بابەتیانە کێشەکان ئاراستە ئەکات و لێرەدا ڕوانگەی زەینی نووسەر بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەرناکەوێ. کەواتە بابەتێتی یەکێکە لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی ئەدەبی واقیع خوازانەی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم کە پتر خۆی لە ڕواڵەتی ڕۆمانی ڕیالیستیدا ئەبینێتەوە. ئەم تایبەتمەندییەی ڕۆمانی ڕیالیستی سەدەی نۆزدەهەم لە ڕۆمانی سەدەی بیستەمدا گۆڕدرا، هەر بۆیەش زۆربەی شاکارە ئەدەبییەکانی ڕۆمانی سەدەی بیستەم پێکهاتەیەکە لە زەینیەتی نووسەر و ڕوانگە زەینییەکانی کەسێتییەکان. لە توێژینەوەی ئەدەبیدا، واتە لە ڕەخنە و تیۆر و لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا، پێویستە بەشێوەیەکی بابەتیانە ڕووبەڕووی بابەتی بەرباس ببینەوە. ئەمەش ئەوە ئەگەیێنێ کە توێژینەوەی ئەدەبی بۆ خۆی لقێکی زانستییە کە تیایدا ڕوانگە زەینییەکانی



توێژەرەوە دەوری بەرچاو ناگێڕێ و لەبری ئەمە هاماوی دەق و پێوەندییەکانی نێو دەق و لێکۆڵینەوە لە پاژە پێکهێنەرەکانی دەق دەوری سەرەکی ئەگێڕن. کەواتە ئەگەر بەشێوەیەکی بابەتیانە لە توێژینەوەی ئەدەبیدا هەڵسوکەوت بکەین ئەمە بەو مانایەیە کە سەربەخۆیی و سەربەستی دەقمان ڕەچاو کردووە. (ئەم بیرۆکەیەی دوایی پێوەندی زۆری بەڕوانگەی فۆرمالیستیەوە هەیە کە هەوڵی زانستی کردنەوەی توێژینەوە ئەدەبییەکانی ئەدا).

**بابەتی ئابووری** **economic, the**

**بابەتی بوونیانە**[١] **existentiale**

**بابەتی بەرزایی** **transcetlental, the**

(بڕوانە بەرزایی)

**بابەتی بەرزەجێ ⟵ بەرزەجێ**

**بابەتی پاشماوە** **the residual**

ئەم زاراوەیە لە بەرهەمەکانی ڕەخنەگری مارکسیستی هاوچەرخی ئینگلیزی، ڕەیمۆند ویلیامز[٢]دا بەکارهێنراوە. ئەو پێی وایە لە هەر سەردەمێکی مێژووییدا سێ هێزی سەرەکی لە ئارادان، کە بریتین لە هێزی زاڵ، هێزی نۆڕسک، هێزی پاشماوە (بابەتی زاڵ، بابەتی نۆرسک و بابەتی پاشماوە). هێزی پاشماوە بریتییە لەو هێزەی کە لە ڕابردوودا زۆر کاریگەر بووە و لەسەر شوناسی مرۆیی و واقیعی کۆمەڵگا جێ پەنجەی هەست پێ دەکرێ. کەچی ئێستا کە توانای کاریگەرێتییان وەک ڕابردوو نەماوە، بەڵام ئەشتوانن لە قۆناغی هەنووکەییدا کاریگەربن. ئەم هێزە لەگەڵ دوو هێزەکەی دیکەدا لە بەرهەمە ئەدەبییە کلاسیکەکانی هەر سەردەمێکدا دەردەکەون و بەپێی بۆچوونی ویلیامز بەرهەمی ئەدەبی پێکهاتەیە کە لەم سێ هێزە کە لە توێژینەوە ئەدەبییەکاندا دەبێ سەرنجیان بدرێتێ. بەوتەی ویلیامز، یەکێک لە هێزە پاشماوەکانی جیهانی ڕۆژئاوا لە سەردەمی ئێستادا ئایینە کە لە ڕابردوودا توانای هەر چەشنە کارتێکردنێکی هەبوو، بەڵام هەنووکە لە نێوان ئایین و کولتووری بورژوازیدا دژوازییەک دەبیندرێ. بۆ نموونە چەمکی برایەتی لەلایەن ئایینەوە ئاراستەی جەماوەری بورژوا ئەکرێ و ئەوانیش لەبەر هۆکاری ئابووری ڕەتی دەکەنەوە.

---

(١) امروجودی (فا.).

2- Raymond Williams.

**بابەتی تایبەت** — **particular, the**

**بابەتی تەئویلی** — **interpretant**

(بڕوانە: تەئویل کردن)

**بابەتێتی** — **objectivity**

(بڕوانە: بابەتی و بابەتی خوازی)

**بابەتی خواز** — **objectivist**

**بابەتی خوازانە** — **objectivistic**

**بابەتی خوازی** — **objectivism**

ئەم زاراوەیە هاوکات لە فەلسەفە و ئەدەبدا بەکار ئەبرێ و، ئەگەرچی لە هەموو بارێکدا بنەڕەتەکانی یەکێکن بەڵام ئاکامەکانی لێک جیاوازن. لە فەلسەفەدا بۆ پێناسەکردنی (بابەتی خوازی) سەرەتا کەڵک لە زاراوەی (بابەتیتی) وەرئەگیردرێ: بابەتێتی بریتییە لە دەست نیشانکردن و وەسفکردنی ئەو شتەی کە بوونی بابەتیانەی هەیە و بەتایبەت بۆ ڕوانگەی ئەو کەسە بەکارئەبرێ کە سەیری چشتەکان بەو شێوەیەی کە هەن ئەکات، واتە نە دەیانگۆڕێ و نە لە دۆخێکی تایبەتدا دایاندەنێ.

لە فەلسەفەدا هەر تیۆرێک کە پێی وابێ زەین ئەتوانێ لە حەقیقەتی دەرەوە و بەپێی تێگەیینی خۆبژێو تێ بگات لەسەر بابەتی خوازی دامەزراوە. تیۆری بابەتی خوازی بۆ ڕاڤەی تایبەتی فەلسەفەی کانت بەکارئەبرێ، چونکە کانت کاتێ باسی مەعریفە ئەکات پێی وایە وێناکردنی ئێمە خاوەن بایەخی بابەتیانەیە. تیۆری بابەتی خوازی لە زانستی ئەخلاقدا بریتییە لەو تیۆرەی کە پێ لەسەر ئەو خاڵە دادەگرێ کە بەها ئەخلاقییەکان خاوەن پێکهاتێکی سەربەخۆن و لەسەر بیروڕا و هەڵسوکەوتی تاکەکان دانەمەزراوە. لە ئەدەبدا، ئەم زاراوەیە ئەگەرچی بەشێوەیەکی گشتی لە بنەواشەی هەندێک قوتابخانەی ئەدەبیدا وەک ڕیالیزم و واقیع خوازی ڕەچاو کراوە، بەشێوەیەکی سنووردارتر بۆ شیعری ئەمریکایی سییەکان و چلەکانی سەدەی بیستەم بەکار ئەبرێ کە پتر لەسەر دەستی شاعیری ئەمریکایی ئەو سەردەمە، ویلیام کارلۆس ویلیامز[1]، هاتە ئاراوە. لەم بزووتنەوەیەدا ویلیامز هەوڵی دەدا لە وێنەخوازی و نەریتی شیعری ئەزراپاوند دوور کەوێتەوە و، زۆرتر بایەخ بەتوخمە ئامادەکانی نێو ژیانی مۆدێرن بدات. ئەم خوازیارییە

1- William Carlos Williams (1883-1963).



نەک هەروەکو بنەواشەیەک لە شیعری ئەمریکاییدا خرایەڕوو، بەڵکو تەنانەت شێوازێکی شاعیرانەی بەربڵاو جیهانبینییەکی فەلسەفی وردی هێنایە دی.

**بابەتی جیهانی؛ بابەتی گەردوونی** — **universal, the**

**بابەتی داهێنانی خەیاڵکرد؛ بابەتی داهێنانی خەیاڵئامێز** — **object of imaginative creation**

**بابەتی زاڵ(١):** — **the dominant**

بابەتی زاڵ، لە ئەندێشەی ڕەیمۆند ویلیامزدا، ئەو هێزە سەرەکییە کاریگەرەی سەردەمە جیاجیاکانی مێژووە کە لەو دوو هێزەکەی دیکە، واتە بابەتی پاشماوە و بابەتی نۆڕسک کاریگەرترە. لەهەر سەردەمێکی مێژوویدا زۆرترین ڕادەی کاریگەرێتی لەلایەن هێزی زاڵەوە دادەنرێ و ئەو دوو هێزەکەی دیکە بەیەک ڕادە توانای کاریگەرییان هەیە. هەر سێ جۆری هێزەکە لە بەرهەمە ئەدەبییە کلاسیکەکانی سەردەمە جیاجیاکانی مێژوودا دەردەکەون و بەپێی ئەم بۆچوونە بەرهەمی ئەدەبی پێکهاتەیەکە لەم سێ هێزە کە لە توێژینەوە ئەدەبییەکاندا دەبێ سەرنجیان بدرێتێ، بەڵام لە ڕەخنەی ئەدەبی بورژواییدا تەنیا یەکێک لەم سێ جۆر هێزە واتە هێزی زاڵ ئاماژەی بۆ دەکرێ. ویلیامز بەمەبەستی تێگەیشتنی پتری ئەو وتانەی سەرەوە پەنجە دەخاتە سەر ئەو گوتە بەناوبانگەی مارکس کە گوتبووی بورژواکان پێیان وایە لە کۆمەڵگادا هێز هی ئەوانە و توانای کاریگەرێتیش هەر هی ئەو هێزەیە.

(بڕوانە بابەتی پاشماوە، بابەتی نۆڕسک)

**بابەتی زاڵ (٢)** — **the dominant**

ڕۆمەن یاکوبسن لە وتاری بابەتی زاڵدا کە هەندێ جار بەتوخمی زاڵ-یش وەرگێڕدراوەتەوە ئاماژە بۆ جیاوازی و پێوەندیی نێوان زمانە جیاجیا ئەدەبییەکان ئەکات. ئەو پێی وایە کە تەکنیکە ئەدەبییەکانیش بۆ خۆیان دیسانەوە ئاشنا دەبنەوە کەواتە ئەو ئاوڕ لەو ئامراز و شێوەیە ئەداتەوە کە لەو ڕێگەیەوە هەندێ هونەر و تەکنیکی ئەدەبیی دیاریکراو لەناو دەقە ئەدەبییەکاندا زاڵ دەبن و لە هەمبەر تەکنیکەکانی دیکەدا بەجۆرێک دەوری ئاشنایی سڕینەوە ئەگێڕن. کەواتە ئەم وتارەی یاکوبسن بەجۆرێک درێژە پێدەری وتارە بەناوبانگەکەی شکلۆڤسکی-یە بەناوی (هونەر وەکو تەکنیک).

بەپێی نووسینەکەی یاکوبسن پێویستە سەرنج بدرێتە ئەو هونەر و تەکنیکانەی لە

بەرهەمەکەدا بەرجەستە کراونەتەوە و بەسەر تەکنیک یاخود توخمەکانی دیکەدا زاڵ بوونە. هەر بەم چەشنەش لە سەردەمە مێژووییە جۆراوجۆرەکاندا و لەناو ئاسەوارە ئەدەبییەکانی هەر سەردەمێکدا بەردەوام توخمێکی زاڵ بەرجەستە ئەبێتەوە. بۆ نموونە لە دوو سەردەمی مێژوویی جیاوازدا دوو جۆر ئەدەبی جیاواز سەر هەڵدەدا کە لە هەر کامیاندا تەکنیکێک ڕواڵەتی توخمی زاڵ لەخۆ دەگرێ. هەر بەو شێوەیە کە لە وتاری (جەمسەرەخوازەیی و مەجازییەکان)دا دەڵێ لە ئەدەبی ڕۆمانتیکی سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا تەکنیکی خوازە لە ئەدەبی ڕیالیستی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا تەکنیکی مەجاز زاڵ دەبێت.

ئەگەر لە فۆرمالیزمی سەرەتاییدا، واتە لە بەرهەمە ئاماژە بۆکراوەکەی شکلۆڤسکیدا باسی پەیوەندی و جیاوازیی نێوان زمانی ئەدەبی و نائەدەبی ئەکرا، لێرەدا یاکوبسن ئاوڕ لەو لایەنە زماناسانە و شێوەییانەی دەقە ئەدەبییەکان ئەداتەوە و لەگەڵ تینیانۆڤ[1]دا لەسەر ئەو ڕایەن کە تەکنیکە ئەدەبیەکانیش بۆ خۆیان ئاشنا دەبنەوە. کەواتە لێرەدا باس لەو شێوەیە ئەکرێ کە تیایدا تەکنیکی دیاریکراو لە دەقەکاندا ڕواڵەتی توخمی زاڵ لەخۆ ئەگرن.

**social, the** **بابەتی کۆمەڵایەتی**

**grotesque, the** **بابەتی گروتێسک؛ بابەتی نائاسایی**

گرۆتێسک لە وشەی ئیتاڵیایی (گرۆت) بەمانای ئەشکەوت یان قووڵکە وەرگیراوە، بۆ یەکەمجار لە زمانی فەرەنسی و لە ساڵی ١٥٣٢دا بەکارهێنرا و لە زمانی ئینگلیزیشدا لە ساڵی ١٦٤٠دا بەم شێوەیەی ئەمڕۆ بەکارهێنرا.

لە فەرەنسای سەدەی شانزەهەمدا ئەو وشەیە هاتە ناو ئەدەبەوە تا سەدەی هەژدەهەم واتە سەردەمی ئەقڵ و کلاسیسیزمی نوێ کەم تا کورت دەهاتە بەرچاو و بەشێوەیەکی گشتی بەواتای پێکەنیندار، سەیروسەمەرە، زێدەڕۆیی، بایی هەوا، ناسروشتی و بەکورتی بەواتای لادان لە پێوانەگەلی باوی هاوسان، هاوکێش و پێوەندی بەکار ئەهات. زۆربەی هونەرمەندان گرۆتێسکیان بۆ واتای بڕگەیی، کومیک، کینایەدار و زێدەڕۆیی بەکارهێناوە.

لە ئەدەبدا توخمەکانی گرۆتێسک پتر لە کاریکاتێر، دژوازی، هەجوو، تانە، گاڵتە و گەپ، کۆمیدیی ڕەش، سەمای مەرگ (ماکابر) و ئەوەی پێی دەڵێن تیاتری پووچ بەزۆری

1- Jurij Tynjanov



دەبیندرێتەوە. گرۆتێسک پتر دەروونمایەی پووش پێکەنین، گاڵتەی ڕەش، شیعری ڕەش و چەپەڵ نووسییە. لە بەرهەمەی نووسەرانێکی وەک ڕابلە، ئیسکلتۆن، وێبێستر، سویفت، پۆپ، بایرون، ئی. تی. ئا. هوفمان، ڤیکتۆر هۆگۆ، ئالێن پۆ، زۆلا، دیکنز، براونینگ، کافکا، ژێنێ، یۆنسکۆ، ئالفرێدژاری و ساموێل بێکت گرۆتێسک بەزۆری ئەبیندرێ.

هەرچەند هەوڵدان بۆ ئاراستەکردنی پێناسەیەکی تەواو بۆ گرۆتێسک کارێکی ئەستەمە و واتایەکی یەکگرتوو و پوختەی نییە، بەڵام پێکهاتە و شێوەیەکی تایبەتی هەیە. لە بەرهەمێکی گرۆتێسکدا دەکرێ هەندێ توخمی تایبەت و بەرچاو دەستنیشان بکەین کە وەک هەودایەک لە تان و پۆی دەقدا دەبیندرێ. بەرچاوترین تایبەتمەندیی گرۆتێسک توخمی سەرەکی نا هاوئاهەنگییە[2]. بەم نا هاوئاهەنگییە ئەکرێ لە کێشەکێش، پێکدادران، تێکەڵبوونی ناهاوچەشنەکان یان یەکانگیربوونی ناهاوسانییەکان پێک بێت. هەموو ئەو کەسانەی لەسەر گرۆتێسکیان نووسیوە لەگەڵ گاڵتە و تیزدا تێکەڵیان کردووە. هەندێک لەوانە کە گرۆتێسک بەچەشنێک کۆمیدی دادەنێن لە ئاستی بێرلێسک و جۆرەکانی گاڵتەی جەماوەریدا پۆلێنبەندییان کردووە. ئەوانی تریش کە پێداگری لەسەر چۆنایەتی ترسناکی گرۆتێسک دەکەن بەرەو لای دنیای ڕاز و سەیروسەمەرە و تەنانەت دنیای میتافیزیک دەبەن. یەکێکی دیکە لە توخمەکانی گرۆتێسک زێدەڕۆییە، وەک منشینگ دەڵێ: «تێکەڵبوونی سەیروسەمەرە، ترسناک و لەهەمان کاتیشدا تێکەڵبوونی قۆڕی حەقیقەت و خەیاڵە. یەک لە توخم و تایبەتمەندییەکانی گرۆتێسک توخمی نەباوبوونە.

**general, the** **بابەتی گشتی**

**بابەتی گەردوونی ← بابەتی جیهانی**

**known object** **بابەتی ناسینەوە**

**the Emergent** **بابەتی نۆڕسک**

بابەتی نۆڕسک ئەو هێزە نۆڕسکەی هەر سەردەمێکی تایبەتی مێژوویی پێکدێنێ کە بەوتەی ڕیمۆند ویلیامز لە داهاتووی ئەو سەردەمەدا بۆ خۆی ئەبێتە بابەتی زاڵ. هێزی نۆڕسک لەگەڵ ئەو دوو هێزەکەی تردا، واتە بابەتی زاڵ و بابەتی پاشماوە، کۆی هێزە جیاجیا و ئامادەکانی هەر سەردەمێکی مێژوویی پێکدێنن کە هەر هەموویان، بەبڕوای

2- disharmony

ویلیامز، لە بەرهەمە ئەدەبییە کلاسیکەکانی ئەو سەردەمەدا دەرئەکەون کە پێویستە لە توێژینەوە ئەدەبییەکاندا ڕەچاو بکرێ.

(بڕوانە بابەتی زاڵ، بابەتی پاشماوە)

**بابەتی واقیع، واقیع** **fact**

**بارودۆخی کلیشەیی** **stock situation**

**باڕۆک، شێوازی باڕۆک** **baroque**

باڕۆک ئەو شێوازە هونەرییە زاڵەی سەدەی حەڤدە و هەژدەی زایینییە کە بایەخی زۆری بەڕازاندنەوە ئەدا و لەم ڕووەشەوە توانی چەشنێ شێوازی ڕازێنەرەوەی تایبەت بۆ خۆی دەستەبەر بکات. ئەگەرچی باڕۆک پتر لە هونەرەکاندا بەتایبەت لە بیناسازیدا بەکار ئەهێنرا بەڵام شوێن پەنجەی بەسەر ئەدەبی ئەو سەردەمەشەوە هەست پێ دەکرێ. بەکارهێنانی زۆری هونەرە جیاجیا گوتەیی و واتایی و کەلامییەکان لە کۆتایی سەدەی شانزدەهەم و سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا ڕواڵەتی کلێشەیی لەخۆ گرتبوو، هەر بۆیە باڕۆک توانی گیانێکی تازە ببەخشێتە شێوەی ڕازاندنەوەی بەرهەمی هونەری. بەواتایەکی تر باڕۆک لە بیناسازیدا تا ڕادەیەک کاریگەرێتی لەسەر ئەدەبیش دانا. زۆرتر لە ئەدەبی شانۆیی بەتایبەت شانۆنامە کومیکەکاندا وەبەرچاو ئەکەوێ. ئەوڕۆکە زاراوەی باڕۆک بۆ هەر شێوازێکی هونەری بەکار ئەبرێ کە تیایدا چەشنە ڕازاندنەوەیەکی تایبەت، کە هەستێکی جوانیناسانەی تایبەت ئەبەخشێتە مرۆڤ دێتە بەکارهێنان.

**باری ئایدیۆلۆژیک** **ideological burden**

**بازدان بۆ داهاتوو، بازدان بۆ پێشەوە، دەرخستنی پێش وەخت** **flashforward**

«بازدان بۆ داهاتوو»، کە دەقاودەق پێچەوانەی «گەڕانەوە بۆ ڕابردوو»ە، تەکنیک و هونەرێکی چیرۆکنووسینە کە ئەوڕۆکە لە فیلمسازیشدا بەکار ئەبرێ. بازدان بۆ داهاتوو بریتییە لەو تەکنیکەی چیرۆک کە لەو ڕێگەیەوە هەندێ بابەت و ڕووداوی داهاتوو کە دواتر لە خودی چیرۆکەکەدا ئاماژەیان بۆ دەکرێ، پێش وەخت دەرئەخرێن. کەواتە «گەڕانەوە بۆ دواوە» ئەو هونەرە چیرۆکییەیە کە تیایدا ئاماژە بۆ هەندێ ڕووداو و پێشهاتی بابەتیانە یان زەینی دەکرێ کە پێشتر هەر لە هەمان چیرۆکەدا ناویان لێ براوە. ئەگەرچی هەردوو تەکنیکەکە، واتە «بازدان بۆ داهاتوو» و «گەڕانەوە بۆ دواوە» وەکو ئامرازێک لە دەقە ریالیستی و نا ریالیستییەکاندا دێنە بەکارهێنان، بەڵام ئەم دوو



تەکنیکە پتر هەڵگری بارێکی دەروونناسانەن و لە خوێندنەوەی دەروونناسانەی دەقەکاندا سوودی تەواویان لێ ئەبیندرێ.

**بازنە؛ جەغز** **circle**

**بازنەدار، بازنەیی، جەغزی** **circular**

**بازنەدارێتی** **circularity**

**بازنەی هێرمێنوتیک، بازنەی تەئویلی** **hermeneutic**

ئەم زاراوەیە کە دیلتای[1] پەرەپێدەری بوو بۆ دەستنیشانکردنی ئەو ڕەوتەی پێشتر لە لایەن شلایر ماخرەوە[2] پێشنیار کرابوو بەکار ئەبرێ، کە بەو پێیە هەوڵ دەدرێ ڕێگەی تێگەیین لە واتای دەقێک فۆرمووله و یاسامەند بکرێ. واتە بۆ تێگەیشتن لە مانا بەر تەسکەکانی بەشگەلی گوتەیی هەر چەشنە گشتییەتێکی زمانناسانە پێویستە ئێمە بەهەستی پێشینی مانای گشتییەتیەکەوە ڕووبەڕوویان ببینەوە، هەڵبەت دەکرێ تەنیا لە ڕێگەی ناسینی ماناگەلی بەشە پێکهێنەرەکانییەوە لە مانای خودی گشتییەتیەکە تێ بگەین. ئەم بازنەدارێتییەی ڕەوتی تەئویلی لە هاوپێوەندیی نێو وشە جیا جیاکانی یەک ڕستەدا و خودی ڕستەکە وەکو گشتێک بەکار ئەبرێ، هەروەها لە هاوپێوەندی ڕستە جیا جیاکاندا و خودی بەرهەمەکە وەکو گشتێک دیسانەوە بەکار ئەبرێ. هەڵبەت دیلتای لەسەر ئەو بڕوایەشە کە بازنەی هێرمینوتیک بازنەیەکی چەند پاتە بوو نییە کە تیایدا بەردەوام هۆکارەکان بینە بەدیهێنەری دەرئەنجام و، دەرئەنجامەکانیش بۆ خۆیان دیسانەوە بینە هۆکارگەلێکی دیکە، چونکە ئێمە ئەتوانین لە ڕێگەی ئەو کایەیەوە کە لە دوو لایەنەوە بەهای خۆی ئەچەسپێنێ بگەین بەتەئویلێکی بڕوا پێکراوی دەقەکە. لایەنێکی ئەم کایەیە ئەو هەستەی ئێمەیە لە هەمبەر گشتییەتیدا و لایەنێکی دیکەش تێگەینی ئێمەیە لە بەشە پێکهێنەرەکانی.

**باسی بەرزایی** **transcendental discussion**

(بڕوانە بۆ بەرزایی)

**بالـەد** **ballad**

«بالەد» یان بالەدی جەماوەری قاڵبێکی ئەدەبی شیعری ئینگلیزی و فەرەنسی

1-Wilhelm Dilthey (1833 - 1911) .

2- Friedrich Schleiermacher.

سەدەکانی ناوەڕاستە، لە بنەڕەتدا گۆرانی یان سترانێک بووە بەشێوەی زارەکی دەربڕاوە و چیرۆکێک ئەگێڕێتەوە. دانەری ئەم شیعرانە بەگشتی نادیارن و هەر بۆیەش لە درێژایی مێژوودا کە لە زاری چەند کەسەوە گوتراونەتەوە تووشی گۆڕانکاری بوونە. ئەم گۆڕانکاریانە لە دەق و هەوای شیعرەکەدا ڕوویان داوە و هەر بەو بۆنەشەوە بالەدی جەماوەری بەچەند شێوەی جیا جیا لە ئارادایە. تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی بالەد بریتین لە: لەحنی دراماتیک و نازەینی، گێڕانەوەی چیرۆکی دڵدارانە یان نیشتمانی یان ئاماژە بۆ ڕووداوێکی تایبەت، بەکارهێنانی چەند دەستەواژەیەکی وەسفی کلێشەیی، دووبارەبوونەوەی هەندێ دێڕی تایبەت لە هاماوی دەقەکەدا بەگۆڕانکارییەوە یان بەبێ گۆڕانکاری و بەندەکانی ئەم قالبە ئەدەبییە لە چوار دێڕ پێک دێن کە دێڕی دووهەم و چوارەم سەروادارن. دێڕگەلی یەکەم و سێیەم چوار بڕگەیین و دێڕگەلی دووەم و چوارەم سێ بڕگەیین.

لە باڵەددا تەنیا باس لە ڕووداوە گرنگەکان ئەکرێ و شتە لاوەکییەکان وەپشتگوێ ئەخرێن، هەر بۆیەش خاوەن بنەمایەکی زۆر یەکگرتوو نین. بۆ نموونە لەو بەندانەدا کە لە وتووێژی نێوان کەسێتییەکان پێکهاتووە بەئاشکرایی ناوی بێژەری قسەکان نەبراوە و پێویستە خوێنەر بۆ خۆی لە پێوەندیی نێوان پاژەکانی دەقەکە بەزەینیەتی یەکگرتووی شیعرەکەوە بگات.

**literary ballad** — **بالەدی ئەدەبی**

(بڕوانە بالەدی نەریتی)

**folk ballad** — **بالەدی جەماوەری(١)**

(بڕوانە بۆ بالەد)

**popular ballad** — **بالەدی جەماوەری(٢)**

(بڕوانە بۆ بالەد)

**traditional ballad** — **بالەدی نەریتی**

بالەدی نەریتی ناوێکی دیکەی بالەد یان بالەدی جەماوەرییە کە زۆرتر لە هەمبەر زاراوەی «بالەدی ئەدەبی» بەکار ئەبرێ. بالەدی نەریتی ئەو بالەدەیە کە دانەرەکەی نادیارە و لە سەدەکانی ناوەڕاستدا خولقێندراوە و هەڵگری سەرجەم تایبەتمەندییەکانی بالەدی جەماوەرین. بالەدی ئەدەبی، بەڵام، ئەو بالەدەیە کە لەسەر دەستی شاعیرێکی لێزان و



بەمەبەستی لاساییکردنەوەی بەئەنقەستی شێوە و گیانی بالەدی جەماوەری داهێنراوە، کەواتە جیاوازی بالەدی ئەدەبی و بالەدی نەریتی لەوەدایە کە بالەدی ئەدەبی دانەرەکەی ناسراوە و شێوازەکەشی ئەدەبی تر و قورستر و ڕازاوەترە. باشترین نموونە بۆ بالەدی ئەدەبی شیعرێکی کالێریج-ە[1] بەناونیشانی «هەڵبەستی مەلەوانی کۆن»[2].

**art ballad** — **بالەدی هونەری**

**meta - belief** — **بان بڕوا**

**superstructure** — **بان بنەما**

**superstructuralism** — **بان بنەماخوازی**

زاراوەی بان بنەماخوازی لە لایەن چەند ڕەخنەگر و ڕاڤەکارێکەوە ئاراستە کراوە، بەمەبەستی دەستنیشانکردنی سەرجەم ئەو قوتابخانە ڕەخنەیی و تیۆریکانەی کە بەشێوەیەک لە شێوەکان لە بنەمای (ئەدەب و کولتوور) ئەکۆڵنەوە و یاخود هەندێ بۆچوون سەبارەت بەم بابەتانە ئەدەن بەدەستەوە؛ بەواتایەکی دیتر، بان بنەماخوازی هەردوو قوتابخانەی بنەماخوازیی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم و پاش بنەماخوازیی کۆتایی ئەم سەدەیە ئەگرێتەوە.

**meta - question** — **بان پرسیار**

بان پرسیار بریتییە لەو پرسیارەی کە لە پرسیارێکی دیکە ئەکرێ. بان پرسیار پتر لە باسە فەلسەفی و لۆژیکییە ئاراستە ئەکرێ و ڕواڵەتێکی پاژنواڕانە ئەبەخشێتە دەق. لە ئەدەبیشدا بان پرسیار ئەتوانێ دەوری سەرەکی لە یەکگرتوویی فۆرمێکی دەقدا بگێڕێ.

**meta position** — **بان پێگە**

**meta theatre** — **بان تیاتر**

ئەم زاراوەیە ساڵی ١٩٦٣ و لە لایەن لیۆنێل ئایڵ-ەوە[3] ڕۆنرا، بۆ دیاریکردنی ئەو شانۆ جیددیانەی کە بەبڕوای ئەو ناچنە ناو خانەی تراژیدیاوە، وەک: مەرگی

---

1- Samuel Taylor coleridge.

2- The ryme of the Ancient Mariner.

3- Lionel Ayle.

دەسفرۆش[١] نووسینی ئارتورمیلەر[٢]، پاسێک بەناوی هەوەس[٣] نووسینی تێنێسی ویلیامز[٤] و پیاوێک بۆ هەموو وەرزەکان[٥] نووسینی ڕابێرت بۆڵت[٦].

### بان چیرۆک — meta fiction

بان چیرۆک ئەو چیرۆکەیە کە دەربارەی چیرۆکێکی ترە. بان چیرۆک لە سەردەمی پێش مۆدێرندا پتر لە ئەدەبی چەرخەکانی ناوەڕاستدا و بەمەبەستی دەرخستن و پێشاندانی هەندێ پەندی ئایینی و ئامۆژگاری ئەخلاقی بەرهەم هێنراوە. نموونەی بەرچاوی بەکارهێنانی بان چیرۆک لە ڕۆمانسەکانی ئینگلیزی و فەرەنسیدا وەبەرچاو ئەکەوێ و دەربڕی بەگەڕکەوتنی وزەی خەیاڵی شاعیران و نووسەرانی ئەو سەردەمەیە کە زۆرتر لە ژێر کاریگەرێتی سانسۆری زاڵی سەردەمی خۆیان بوون، ئەو سانسۆرەی زۆرتر لە لایەن کلیساوە بەسەریاندا دادەسەپێندرا. لە ئەدەبی هاوچەرخ و بەتایبەت لە ئەدەبی پۆست مۆدێرنیستیدا بان چیرۆک بایەخێکی تازەتری وەدەست هێناوە و لە کورتە چیرۆک و ڕۆمانە پۆست مۆدێرنیستەکاندا کەڵکی لێ وەرگیراوە. دەرکەوتنی بان چیرۆک و گرنگی دان بەم تەکنیک یاخود شێوە ئەدەبە لە قۆناغی هەنووکەیدا لە لایەکەوە پێشاندەری گەڕانەوەی ئەدەبی پۆست مۆدێرنیستیە بۆ لایەن و ڕەهەندەکانی ئەدەبی ڕۆمانتیک و چەرخەکانی ناوەڕاست و، لە لایەکی دیکەشەوە تەعبیر لە چەشنە جیهانبینییەکی تایبەتی نووسەری هاوچەرخ ئەکا کە بایەخ دەداتە فۆرمی لەناوچوو.

(بڕوانە بۆ بان گێڕانەوە)

### بان دەروونناسی — meta - psychology

### بان دەق — meta - text

### بان دەقێتی — meta - textuality

### بان ڕەخنە — meta - criticism

بان ڕەخنە یان «ڕەخنەی ڕەخنە» ئەو تیۆرە ڕەخنە گرانەیە کە تیۆر یان قوتابخانەیەکی

1- Death of a Salesman.
2- Arthur Miller.
3- A Streetcar Named Desire.
4- Tenncssee Wiliams.
5- A Man for All Seasons.
6- Robert Bolt.



ڕەخنەیی دیکە ئەکاتە بابەتی لێکۆڵینەوەی بۆ خۆی. بان ڕەخنە بەدوو شێوەی جیاواز لەگەڵ قوتابخانەیەکی ڕەخنەیی یان تیۆریکدا هەڵسوکەوت ئەکات، واتە یان هەندێ وتەزای تیۆری ناوبراویشی دەکاتەوە و هەوڵ دەدات چەند یاسا و ڕێسایەکی تایبەت بەو قوتابخانەیە دەستەبەر بکات و، یان بەپێچەوانەوە، ڕەخنە لە قوتابخانەی ناوبراو بگرێ و خاڵە لاوازەکانی بخاتە ڕوو. بۆ وێنە قوتابخانەگەلی ڕەخنەیی و تیۆرێکی «قوتابخانەی شیکاگۆ» و «مێژوویی خوازیی نوێ» دوو نموونەی بەرچاوی بان ڕەخنەن.

### بان زمان — meta Iangage

هەر زمانێک کە زمانێکی دیکە وەسف بکات یان زمانێک دەربارەی زمانێکی تر. یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی زمانی واژەیی مرۆڤ ئەوەیە کە ئەتوانێ وەکو زمانەکەی خۆی کار بکات. بەواتایەکی دیکە ئێمە ئەتوانین دەربارەی زمانی خۆمان هەر بەم زمانەی خۆمان قسە بکەین. ئەمەش تایبەتمەندییەکە کە لە سیستەمی پەیوەندی نێوان ئاژەڵ و گیانلەبەرانی دیکەدا نییە. بۆ نموونە سەگ ناتوانێ دەربارەی وەڕینی خۆی بوەڕێ.

ئەو بابەتەی سەرەوە لە تیۆر و ڕەخنەی ئەدەبیدا زۆرتر توێکاری کراوە. بۆ نموونە ژێرار ژنێت[١] پێشنیاری پارادایمێکی زمانناسانەی ئاراستە کردووە کە تیایدا بەرهەمی ئەدەبی بەزمان و ڕەخنەی ئەدەبی بەبان زمان شوبهێندراوە. هەڵبەت پێویستە ئەوەش بوترێ کە ئەدەب خۆی لە خۆیدا ئەتوانێ دەوری بان زمانیش بگێڕێ، وەک ئەوەی کە لە بان چیرۆکدا ئەبیندرێ. بان زمان بەگشتی بریتییە لەو زمانەی لەبری دەستنیشانکردن و گەڕانەوە بۆ بارودۆخ و چشت و واقیعێکی نا زمانی بۆ خودی زمانەکە ئەگەڕێتەوە. لە پاڵ ئەمەشدا، بان زمان ڕوونکەرەوەی هەندێ هێما و یاسای پێکهاتی زمانی بابەتیانەیە و بەمەبەستی دیاریکردنی ماناکان یان تەعبیرەکانی ڕستەکانی ئەو زمانە بەکار ئەبرێ. بۆ نموونە هێنانەوەی چەندین هاوواتا بۆ وشەیەک لە ڕواڵەتی ڕستەگەلی هاوکێش ئاسا بۆ نموونە باشترین دەرکەوتەی بان زمانە. هەڵبەت جیا لە بۆچوونی بنەماخوازانە و پاش بنەماخوازانە بۆ بابەتی «بان زمان» ئەکرێ ئەوەش بوترێ کە تەنانەت لە ڕۆمانە واقیعخوازە کلاسیکەکانیشدا جۆرێک لە بان زمان لە گۆڕێ دایە، چونکە پەخشانی گێڕانەوەیی ئەم ئەگەرە ئەهێنێتە ئاراوە کە هەقیقەت یان واقیع بەشێوەیەک دەرکەوێ کە وەک ڕاستەوخۆ بەواقیعێکی دیکەوە گرێ درابێ.

1- Gerard Genette.

**بان زمانی** metalingual

**بانگکردن** apostrophe

بانگکردن هونەرێکی گوتەییيە کە تیایدا چشت یان مرۆڤێکی زیندوو یاخود مردوو هەروەها بوونەوەرێک وەک دار و گوڵ و ئاژەڵ بەشێوەیەک کە بانگ ئەکرێ کە ئەڵێی ئامادەیە و ئاگای لە بانگکردنەکە هەیە و بەتەواوی لێی تێ ئەگات. نموونەی بەرچاوی ئەم هونەرە شیعری «پایز، پایز»ی گۆران-ە کە تیایدا پایز وەکو بوونەوەر یان مرۆڤێکی هۆشیار بانگی لێ کراوە و ڕووبەڕووی گوتەیەکی تایبەت کراوەتەوە.

**بان گوتار** meta - discourse

**بان گێڕانەوە** meta - narrative

بان گێڕانەوە بریتییە لەو گێڕانەوەیەی سەبارەت بەگێڕانەوەیەکی تر ئەدوێ کە لە هەناوی خۆیدایە و، یان ئەو گێڕانەوەیە کە بۆ خۆی و بۆ ڕەوتی گێڕانەوەیی خۆی ئەگەڕێتەوە. بان گێڕانەوەکان بەهۆی بنیاتنانی پێگەیەکی ئایدیۆلۆژیکی تایبەت لە چیرۆکێکدا ئەتوانێ دەورێکی زۆر گرنگ بگێڕێ. ئەم زاراوەیە زۆر جار لەگەڵ زاراوەی بان چیرۆکدا بەیەکێک دادەندرێن چونکە هەر چیرۆکێک کە هەڵگری بان گێڕانەوەیەک بێ خاوەن توخمێکی بان چیرۆکیشە.

**بان نیشانەناسی** meta - semiotics

**باوکسالارانە، پیاوانە** patriarchal

**باوکسالار** patriarch

**باوککوژی** parricide

**باوکی ستەمکار(١)** heavy father

**باوکی ستەمکار(٢)** senex iratus

**بایەخە مێژووییە گەردوونییەکان ◄—— بەها مرۆییە گەردوونییەکان**

**بایەخی بەکارهێنان** use value

**بایەخی زیادە** surplus value

**بایەخی سفر** zegro value

**بایەخی گۆڕینەوە** exchange value



**بایەخی نیشانەیی** sign - value

**بتئاسا** fetish

**بتئاساخوازی، بتئاسایی** fetishism

ئەم زاراوەیە سەرەتا لە زانستی ئابووریی (- سیاسی)دا و پتر لە لایەن مارکس-ەوە ئاراستە و پاشان جیهانی کرا. لە دوا بەشی پاژی یەکەمی کتێبی سەرمایەدا مارکس باسی «بتئاسایی شمەک و نهێنییەکانی» دەکا و، ئەمەش ئەو قۆناغەیە کە تیایدا شمەک کە لە بنەڕەتدا بەرهەمی مێشکی مرۆڤە ئەگۆڕدرێ و ئەبێتە بوونەوەرێکی خۆ بەڕێوەبەر کە خاوەنی ژیانی تایبەت بەخۆیەتی و، بەگشتی لە ناو خۆیاندا دەست ئەکەن بەسازکردنی پێوەندی لەگەڵ یەکتر و تەنانەت ڕەگەزی مرۆڤیشدا. بەبڕوای مارکس ئەمە ئەو بتئاساخوازییەیە کە خۆی بەبەرهەمگەلی کارەوە گرێ دەدات تا ئەو کاتەی وەکو شمەک دێتە بەرهەم. بتئاسایی جیهانی شمەکەکان لەو تایبەتمەندییە کۆمەڵایەتییە تایبەتەی کارەوە دێتە ئاراوە کە ئەوانی خولقاندووە.

ئەمڕۆکە، بەڵام، ئەم زاراوەیە تەنیا لە ئابووریی سیاسیدا بەکار نابرێ و لە لقە جیا جیاکانی فەلسەفە و تەنانەت مارکسیزمی نوێشدا بەشێوەگەلی جیاواز دێتە بەکارهێنان. بتئاسایی شمەک پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵ «لە خۆ نامۆیی مرۆڤ»دا هەیە. بابەتی ناوبراو کە زیاتر بەهۆی کولتووری مۆدێرنیستییەوە سەری هەڵداوە باسی دابڕانی مرۆڤ لە میتافیزیک و ئایین دەکات کە لە جیهانی مۆدێرندا گۆڕدراوە و بۆتە دابڕانی مرۆڤ لە شوناسی خۆی و لە ئاکامدا دابڕانی لە مرۆڤایەتی کە تێکڕا بۆتە هۆی قوتبوونەوەی هەندێ زاراوە وەک بتئاسایی مرۆڤ و مرۆڤی بەشمەک بوو. لە ناو فەلسەفەکارانی هاوچەرخدا واڵتر بنیامین و تا ڕادەیەک فەیلەسووفانی قوتابخانەی فرانکفۆرت ئاوڕیان لەو بابەتانەی سەرەوە داوەتەوە و هۆکارەکانی بەدیهاتنی و هەندێ جار چارەسەرییان دەستنیشان کردووە.

**بڕگە(١)، یەکەی کێش** meter, metre

**بڕگە(٢)** syllable

**بڕگە دانان** scansion

**بڕگەیی** metrical

**بڕگەی بڵند؛ بڕگەی مەودادار** long syllable

**برگەی بێ گوشار** **unstressed syllable**

**برگەی کورت، برگەی کەم مەودا** **short syllable**

**برگەی گوشاردا، برگەی بەگوشار** **stressed syllable**

**بروا پێ نەکراو، گوماناوی** **apocryphal**

**بروای کەسانی ← تایبەتمەندی کەسەکی**

**بروای نەگۆڕ** **idee fixe (Fr.)**

**بڕیاری ← دانراوەیی**

**بریناو** **epithet**

بریناو لە بنەڕەتدا ئەو ئاوەڵناوە و دەستەواژەیەیە کە چۆنایەتی و تایبەتمەندییەکانی ناوێک دەردەبڕێ و، لە هەندێ شوێنیشدا ئەبێتە هاوواتای خودی ناوەکە. لە ئەدەبدا، بەڵام بریناو زۆرتر بۆ ئەو ئاوەڵناوە یان دەستەواژەیە بەکار ئەبرێ کە تەعبیر لە تایبەتمەندییەکی گران و هەژێنەر ئەکات کە هەڵگری بارێکی ئەدەبی پڕ واتایە. هەر بۆیە بریناو لە دەقە ئەدەبییەکاندا زۆربەی کات لە دوو یان سێ ئاوەڵناو پێک دێت. ئەم شێوە ڕوانینە بۆ بریناو لە ئەدەبی ڕۆژئاوادا (واتە ئەدەبی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانی) لە شێوازی تایبەتی هۆمێرەوە وەرگیراوە و هەر بۆیەش هەندێ جار پێی ئەوترێ بریناوی هۆمێری. هۆمێر لە دوو بەرهەمی ئیلیاد و ئۆدیسەدا کەڵکی زۆری لەم هونەرە بینیووە و ئەمەش تا ئەو ڕادەیەیە کە ئەم بریناوانە ئێستاکە وەکو هاوواتای ئەو کەسایەتییە یان ئەو چشتە بەکار ئەبرێ و تەنانەت ڕواڵەتی کلیشەشیان لە خۆ گرتووە.

**بریناوی هۆمێری** **Homeric epithet**

**بزاف، بزووتنەوە؛ جووڵە** **movement**

**بزاڤی جوانیناسانە** **Aesthetic movement**

بزاڤی جوانیناسانە دیاردەیەکی ئەوروپی بوو کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا سەری هەڵدا و پێشەنگەکانیشی لە فەرەنسەدا بوون. نووسەرە فەرەنساییەکان دژی زاڵیەتی بیری زانستی و هەروەهاش بەهۆی کەمتەرخەمی زۆری جەماوەری ئەو ڕۆژگارە لە هەمبەر هەر چەشنە هونەرێکدا و بێ هەستی ئەو کۆمەڵگایە بەرامبەر بەهونەر، ئەم بیرۆکەیان لەلا گەڵاڵە بوو کە بەرهەمی هونەری سەرترین بایەخی لە نێو دەستکەوتە مێژووییەکاندا هەیە چونکە ئەم بەرهەمە خۆ بژێوە و هیچ چەشنە مەبەستێکی ئەخلاقی لە دەرەوەی کیانی



خۆیدا نییە. واتە ئامانجی بەرهەمی هونەری ئەوەیە کە بەپوختەبوونی شێوەوە بوونی هەبێ واتە جوان بێ و وەکو ئامرازێک بۆ ئامانجێک سەیری نەکرێ، بەڵکو بۆ خۆی وەکو ئامانجێک دابندرێ. هەر بۆیە دروشمی «هونەر بۆ هونەر» بوو بەبانگەوازی سەرەکیی بزاڤی جوانیناسانە.

ئەگەرچی بزاڤی جوانیناسانە لە زۆربەی هونەرەکانی ئەو سەردەمەدا (واتە، کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم) بەرچاو ئەکەوێ، بەڵام بۆ یەکەم جار لە ئەدەبدا ڕەنگی دایەوە. لەساڵی ١٨٠٤ی زایینیدا بنیامین کۆنستانس[1] لە بیرەوەرییەکان-ی خۆیدا ئاماژە بۆ جوانیناسی لە ڕوانگەی کانت-ەوە دەکات. پاش ئەویش تیوفیل گوتیە[2] لە پێشەکی دوو کتێبی خۆیدا بەناونیشانی ئالبێر تووس[3] و مادمازێل دوومووپەن[4] دروشمی هونەر بۆ هونەری دەربڕی و یەکەم بەیاننامەی ئەم بزاڤەی ئاراستە کرد. بەباوەڕی وی ئامانجی هونەر شێوەی جوانە و هیچ پێوەرێک لە دەرەوەی هونەردا ناتوانێ پێوانەی هەڵسەنگاندنی بێت. هەر لەم سەردەمەدا بودلێر و فلۆبێر و تیۆدۆر دووبانڤیل[5] لە پێناو «ڕزگاریی هونەر»دا درێژەیان بەڕێگەکەی گوتیە دا.

ئەم بزاڤە لە ئەمریکا لەسەر دەستی شاعیر و نووسەری مەزن ئێدگارئالن پۆ هاتە ئاراوە. لە وتاری «بنەواشەی شاعیری»دا پۆ پەرە بەڕوانینی هونەر بۆ هونەر لە بەستێنی شیعردا دەدات و زۆرتر تیشک دەخاتە سەر ڕەتکردنەوەی ئەو بیرۆکەیەی کە بانگەواز بۆ فێرکاری لە ڕێگەی هونەرەوە ئەکات. هەر بۆیە ئەم پرسیارەش دێنێتە گۆڕێ کە چلۆن دەکرێ بەمەبەستی دەربڕینی هەقیقەت وەکو خۆی پێویستی بەزمانێکی ساکار و ورد و کورت و بەدوور لە هەست هەیە کەڵک لە شیعر وەربگیردرێ. بەواتایەکی دیکە، پۆ پێی وایە کە کۆبوونەوەی شیعر و هەقیقەت (هەڵبەت نەک هەقیقەتی شیعری بەڵکو ئەو حەقیقەتەی خەڵک بەلایانەوە گرنگە) ناکرێ سەر بگرێ. لە بریتانیاشدا بزاڤی جوانیناسانە لە سێ دە ساڵی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا گوڕ و تینێکی تازەی پێ بەخشرا. واڵتر پەیتر[6]،

1- Benjamin Constance.

2- Teophile Gantier…

3- Albertus.

4- Mademoiselles de Maupin.

5- Theodore de Bauvilles.

6- Walter Pater.

نووسەر و ڕەخنەگری ئینگلیزی یەکەم کەس بوو کە لە ژێر کاریگەرێتی ڕاستەوخۆی جان ڕاسکین[1] و گرووپی شاعیرانی پێش ڕافائێل[2] دەستی کرد بەگرد و کۆی بنەواشە فیکرییەکانی ئەم بزاڤە. لە ساڵی **١٨٧٣**دا کتێبی توێژینەوەیەک لە بابەت مێژووی ڕۆنێسانس[3] بڵاوکرایەوە کە تیایدا پۆ گرێمانەی «ڕێژەیەتی ئەدەبی»ی ئاراستە کرد. پەیتر بەهۆی

کارتێکەری بۆدلێر و فلۆبێرەوە وای بۆ دەچوو کە گەڕان بەدوای هەقیقەتدا لە تراویلکە بەولاوە، شتێکی دیکە نییە و بڕوای بەڕزگاری هونەر لە دوای کۆت و بەندە دەرەکییەکان هەبوو. ئەم بیروڕاگەلەی پەیترکاری زۆری لە هەندێ نووسەری ئینگلیزی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمی وەک ئۆسکار وایڵد[4] و لیۆنێل جانسۆن[5] کرد. بۆ نموونە ڕۆمانی ناوازەی وایڵد بەناوی وێنەی دۆریان گرەی[6] بەبەرهەمی نەمری ئەم بزاڤە لە ئینگلتەرا دادەندرێ.

ئەگەرچی ئەم بزاڤە لە دوا ساڵەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا تووشی نسکۆ بوو و گۆڕدرا لە ئاکامدا بووە قوتابخانەی لەناوچوو، بەڵام، قەت بەتەواوی هەرەسی نەهێنا و تەنانەت شوێن پەنجەشی بەسەر بەرهەمی هەندێ شاعیری مەزنی سەدەی بیستەمی وەک ویلیام باتلێر ییتس و ئیلیۆت-ەوە دیار بوو. دروشمی خۆ بەڕێوەبەری و خۆ بژێوی بەرهەمی ئەدەبی کە یەکێکە لە واتا سەرەکییەکانی بزاڤی جوانیناسانە، دواتر لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا بوو بەبنیاتنەری بەربڵاوترین بزاڤی ڕەخنەی ئەدەبیی هاوچەرخ، واتە ڕەخنەی نوێ.

## بزاڤی ڕۆمانتیک Romantic movement

بزاڤی ڕۆمانتیک کە لە زمانی فەرەنسیدا ڕۆمانتیزم و لە زمانی ئینگلیزیدا ڕۆمانتیسیزم-ی پێ ئەگوترێ بزاڤی زاڵی ئەدەبی ئەوروپایە لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا. هۆکارە فەلسەفییەکانی بەدیهاتنی ئەم بزاڤە بریتین لە بیرۆکەی تاکخوازی لای جان لاک[7] و فەلسەفەی تایبەتی ژان ژاک ڕۆسۆ کە بەو پێیە

1- John Rnskin.
2- Pre - Raphaelite.
3- Studies in the History of Renaissance.
4- Oscar Wilde (1854 - 1900).
5- Lionel Jonson.
6- The Picture of Dorian Gray.
7- Johan Loche (1632 - 1704).



شارستانێتی ئەبێتە هۆی لە دەستچوونی پاکێتی مرۆڤ و کەواتە منداڵان و مرۆڤی لادێیی و گوندنشین تەنیا نموونەی ئەو مرۆڤە پاک و بێ گەردەن کە هێشتا پاکێتی خۆیان لە دەست نەداوە. هەر بەم بۆنەوە، تاکایەتی، گرنگیدان بەمنداڵان یاخود سروشت و مرۆڤی تەنیشت سروشت (واتە مرۆڤی گوندنشین) ئەو واتا سەرەکییانەی ئەدەبی ڕۆمانتیکن کە هۆکەی ئەو هۆکارە فەلسەفییانەی سەرەوە بوون.

هۆکارە سیاسییەکانی بەدیهاتنی ئەم بزاڤە بریتین لە شۆڕشی گەورەی فەرەنسای ساڵی ١٧٨٩ و سەربەخۆیی ئەمریکا لە ساڵی ١٧٧٨دا. ئازادی، برایەتی و یەکسانی سێ ئاکامی سەرەکی شۆڕشی گەورەی فەرەنسا بوون کە لە ئەدەبی ڕۆمانتیکدا بەرجەستە ببوونەوە. لە لایەکی دیکەشەوە سەربەخۆیی و هەوڵ و تێکۆشان دژی دەسەڵاتی سیاسی ئەویدی ئاکامی سەرەکی سەربەخۆیی سیاسی ئەمریکا بوو کە لە ئەدەبی ڕۆمانتیکدا بایەخیان پێ درا.

هۆکارە ئەدەبییەکانی سەرهەڵدانی ئەم بزاڤە لە ئینگلیسدا بریتین لە بڵاوبوونەوەی ئەو کتێب و نامیلکانەی لە باری شێواز و چەشنی تایبەتی جیهانبینییەوە جیاوازییەکی زۆریان لەگەڵ ئەدەبی زاڵی سەدەی هەژدەهەم (واتە ئەدەبی نیئۆکلاسیستی هەبوو) هەندێ لەم بەرهەمانە بریتین لە ئاسەوارە شیعرییەکانی ئەندامانی قوتابخانەی شیعری گۆڕستان و بەتایبەت کتێبی هەرە کاریگەر و زۆر بەناوبانگی چامە لیریکەکان. لە ئەدەبی فەرەنسیشدا بەرهەمە شیعرییەکانی شاعیرانی فەرانسی سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم و بەتایبەت پێشەکی شانۆنامەی کرامویڵ نووسینی ڤیکتۆر هۆگۆ[1] بەمانیفێستی ئەدەبی ڕۆمانتیک لە فەرانسە دادەندرێ.

بەبڕوای هەندێ ڕەخنەگر بزاڤی ڕۆمانتیک سەرەتا لە ئەدەبی ئاڵمانییەوە کەوتە گەڕ و ئەم بزووتنەوەیەش تا ئەو ڕادەیە گەشەی کرد کە نیوەی دووهەمی سەدەی هەژدەم لە ئەدەبی ئاڵمانیدا بەسەردەمی گۆشار و تۆفان ناوبردە دەکرێ گوتەی گەنج و شیلێر بەکەسایەتی سەرەکی ئەم سەردەمەی ئەدەبی ئاڵمانی دادەنێن.

تایبەتمەندییە گشتییەکانی ئەدەبی ڕۆمانتیک بریتین لە ساکارێتی شێواز، بایەخدان بەمنداڵان بەهۆی ڕۆحی سپی و بێ گەردیانەوە، گرنگی دان بەسروشتی دەرەکی و بێ خەوش کە لەم ئەدەبەدا هەڵگری بایەخێکی مینۆکی و خواییە، بەکارهێنانی توخمگەلی

1- Victor Hugo (1804 - 1893).

نائاسایی و سەیر کە لە ژیانی شارستانێتیدا نین، گرنگی دان بەجوانی و بەتایبەت جوانی ڕەها و بگۆڕ، ڕەچاوکردنی ئازادی و سەربەخۆیی وەکو دوو واتای سەرەکی و لە ئاکامدا گەڕانەوە بۆ ئەو کەش و هەوا ئوستوورەیی و کۆنەی هەم لە ئەدەبی یۆنانی کۆن و هەم هەندێ جار لە ئەدەبی چەرخەکانی ناوەڕاستدا ئامادەبوونیان هەیە.

بیرۆکە زاڵ و گشتگیرەکانی ئەدەبی ڕۆمانتیک بریتین لە ڕزگاری بوونی شاعیر و جەماوەر لە چەوسانەوەی سیاسی و کەواتە سەربەخۆیی تاکە کەسی و نەتەوەیی و هەر بۆیەش نکۆڵی کردن لە بڕوای سنوورداری ئایین و کەواتە پشتگوێ خستنی شێوازی لاتینی لە نووسیندا، بیرۆکەی زاڵی ناسیۆنالیزم و بڕواکردن بەڕزگارکردنی خەڵک لە لایەن تاکێکی سەربەخۆ یان خودی شاعیرەوە، ڕەچاوکردنی بیرۆکەی یەکییەتی بوون (یان پانتەئیزم) و هەروەها زاڵیەتی ڕوانگەیەکی تایبەت بۆ مینۆکییەتی نەک بەو مانایەی ئایین بانگەشەی بۆ ئەکات بەڵکو بەو مانایەی کە شاعیر لە ڕێگەی سەربەخۆیی و ئازادی و گرنگی دان بەجوانی ڕەها و بزۆزەوە لە بەرهەمەکانیدا ئەینوێنێتەوە.

بزاڤی ڕۆمانتیک لە ئینگلیسدا شەش شاعیری گەورەی بەدی هێنا کە بریتین لە ویلیام بلەیک، ویلیام وۆردزوۆرس، ساموێل تەیلێر کالێریج، لۆردبایرۆن، جان کیتس و پێرس شێلی. ڕۆماننووسە ناودارەکانی بزاڤی ڕۆمانتیکی ئینگلیزیش بریتین لە جەین ئاستن و سێروالتەرسکات. لە بواری وتار نووسینیشدا ئەم بزاڤە سێ وتارنووسی نایابی بەخۆیەوە بینی کە بریتین لە چارلز لەم، ویلیام هەزلیت و تامس دی کوێنس. بزاڤی ڕۆمانتیک لە فەرەنسا چەندین شاعیری بەناوبانگی لە خۆ گرتبوو کە بریتین لە دوو لامارتین، شاتۆبریان، ئالفرێد دوموشە و بەتایبەت ڤیکتۆر هۆگۆ لە بواری ڕۆمان نووسینیشدا جگە لە هۆگۆ، ستاندێڵ و تەنانەت بالزاک – کە زۆرتر وەکو نووسەرێکی ڕیالیست ناوبانگی دەرکردووە دەکرێ ناوبردە بکەین.

شکستی سەختی ناپلیۆن لە شەڕی واترلووی[1] ساڵی ١٨١٥دا و دەسەڵاتی دیکتاتۆران بەسەر زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەوروپا و گۆڕینی کۆمەڵگای کشتیارانەی ئەوروپی بۆ کۆمەڵگایەکی پیشەسازانە و کەواتە پەرەسەندنی ژمارەی دانیشتوانی شارەکان و دانانی چەند یاسا و ڕێسایەکی تایبەت لە پەرلەمانی ئەو وڵاتانە بۆ دەستەبەرکردنی دیموکراسی – هەڵبەت بەشێوەیەکی سەرەتایی – لە ئاکامیشدا مردنی

1- Waterloo (1815).



زۆربەی شاعیرە ڕۆمانتیکە گەورەکان، چ لە باری جەستەیی یان ئەدەبییەوە، تێکڕا هۆکارەکانی هەرەسهێنانی بزاڤی ڕۆمانتیک لە ئەوروپا پێک دێنن کە لە ئەنجامدا (واتە پاش ١٩٣٠) دوو لقی گەورەی ئەدەبی ڕیالیست کورتە چیرۆک و ڕۆمان و ئەدەبی هێماخواز شیعر و مۆسیقای لێ کەوتەوە.

**بژاردەبێژی ← پەند(١)**

**بگۆڕ؛ دینامیک** dynamic

**بناخەی ئوستوورەناسانە؛ بنەڕەتی ئوستوورەناسانە** mythological base

**بناخە؛ بن؛ بناوان؛ بنج؛ بنچینە؛ بنەڕەت** base

**بنج(١)؛ بنچینە** origin

**بنج(٢)؛ یەکە (لە برگەداناندا)** foot

**بنجی تەواو؛ یەکەی تەواو (لە کێشدا)** perfect foot

بنجی تەواو یان یەکەی تەواو بریتییە لەو یەکەیەی کە لە هەموو برگە پێکهێنەرەکانی خۆی پێکهاتووە. لە کێشناسی و عەرووزی ئینگلیزیدا زۆربەی یەکەکانی کێش لە دوو یان سێ برگە پێک دێن کە هەندێکیان بەگوشارن و هەندێکیشیان بێ گوشار. لەم کێشناسییەی ئەدەبی ئینگلیزیدا بەگشتی شەش جۆر یەکەی کێشدار بەکار ئەبرێن کە لە ناو ئەم شەش یەکەیەدا دانەیەکیان لەوانیتر پتر بەکار ئەبرێ. ئەویش یەکەی ئایامبیک–ە کە لە دوو برگە پێکهاتووە و برگەی یەکەمیان بێ گوشارە و برگەی دووهەمیش لە دەربڕیندا گوشاری ئەخرێتە سەر.

**بنمایە؛ بن واتا؛ مۆتیف** motif

بنمایە یان مۆتیف بریتییە لە توخمێکی بەرچاوی بەرهەمە ئەدەبییەکان کە لە ڕواڵەتی ڕووداو، وێنەی خەیاڵکرد یان هەندێ بیرۆکەی تایبەت و وشە و یاخود دەستەواژە بەردەوام یان چەند جار دووپات ئەبێتەوە. ژمارەیەک لە مۆتیفەکان زۆربەی کات لە فۆلکلۆری هەر نەتەوەیەکدا دەکەونە بەرچاو. بۆ نموونە لە ئەدەبی ئینگلیزیدا ئەو ژنە ناشیرین و پیرەی کە لە ناکاو بەهۆی هەندێ هۆکاری نا سروشتییەوە ئەگۆڕدرێ و ئەبێ بەشازادەیەکی جوان و دڵڕفێن یان ئەو پیاوەی کە گیرۆدەی چاوی جادووکارەکانە و لە ئاکامدا هەر بەو هۆیەشەوە تیا ئەچێ، نموونەگەلی بەرچاوی دوو موتیفی تایبەت بەفۆلکلۆر یان ئەفسانەی ئەو نەتەوەیە پێک دێنن. لە فۆلکلۆری کوردیشدا بابەتی حەزلێکردن لە نێوان کچ و کوڕێکدا

که زۆربەی کات کچەکە مێرد بەپیاوێکی پیر یا پیاوێکی نەویستوو ئەکات و ئەمەش ئەبێتە هۆی ئەوەی کە کوڕە دڵدارەکە وەلی دێوانە ئاسا ڕوو لە چیا و چۆڵەوانی بکا و هەوێنی ئەم ئەشقەش ببێتە دەستمایەی گۆرانی دڵدارانە و یاخود هۆنینەوەی شیعر و چەندەها نموونەی تری لەم جۆرە... بەنموونە سەرەکییەکانی مۆتیف دادەندرێ.

لە ئەدەبیشدا هەر بەرهەمە و خاوەن مۆتیفی تایبەت بەخۆیەتی. یان ئەکرێ بوتری مۆتیف بریتییە لەو بیروڕا زاڵانەی نێو بەرهەمێکی ئەدەبی کە هەندێ جاریش لە ڕواڵەتی کەسایەتییەکی نێو بەرهەمەکەدا ڕەنگ ئەداتەوە. کۆی مۆتیفەکانی بەرهەمێک دەشێ تێم یان واتای سەرەکی ئەو بەرهەمە پێک بهێنن. بۆ نموونە هەندێ لە مۆتیفەکانی شانۆنامەی هاملێت[١] بریتین لە ئەشق، پرسە، خەیانەت، کوشتن، شەڕ، پاشایەتی و دەسەڵات. کەچی تێم یان واتای سەرەکی ئەم بەرهەمە تۆڵەیە.

**بنمایەی چەندپاتەوەبوو** **leitmotif**

بنمایەی چەند پاتەوە بوو یان لیت مۆتیف لە بنەڕەتدا زاراوەیەکی ئەڵمانییە کە سەرەتا بۆ ئەو واتا مۆسیقاییانەی نێو گشتیەتی بەرهەمێک بەکار ئەبرا کە بەڕواڵەتی کەسایەتی چشت یان هەستێکی تایبەتەوە دەرئەکەوتن و پتر لە ئۆپێراکانی ڕیچارد واگنێردا بەکار ئەبران. بەڵام ئەمڕۆکە ئەم زاراوەیە بۆ ئەو وشە و یاخود دەستەواژەگەلە بەکار ئەبرێن کە پەسندی نووسەرن و گەڵێک جار لە بەرهەمەکەدا دووبارە ئەکرێنەوە. ئەم زاراوەیە پتر لە ڕەخنەکاریی بەرهەمە مۆدێرنیستییەکاندا بەکار ئەبرێ بۆ نموونە بەرهەمەکانی تۆماس مان و جەیمس جۆیس و ڤیرجینیاوولف و ویلیام فاکنێر بەرجەستەترین نموونەن.

**بنەڕەتی؛ ڕەســەن** **original**

**بنەما؛ پێکهاتە؛ سازە** **structure**

**بنەماخوازی** **structuralism**

ئەگەرچی بابەتی بنەما هەر لە کتێبە کاریگەرەکەی ئەرەستوو بەملاوە لەناو بەرهەمی بیرداڕێژانی ئەدەبیدا بەردەوام باسی کراوە و بەمەبەستی شیکاریی ئەو بەرهەمانە کەڵکی لێ وەرگیراوە، بەڵام بنەماخوازی ئەو قوتابخانە زاڵەی ناوەڕاستی سەدەی بیستەمە کە گۆڕانکاری قووڵ و بنەڕەتی بەسەر زمانناسی و ڕەخنە و تەنانەت خوێندنەوەی نوێی کولتوور و دەروونناسی و مرۆڤناسی و کۆمەڵناسی و بیرکاری و... هتد-دا هێنا. کتێبی

1- Hamlet.



چەند وانەیەک دەربارەی زمانەوانیی گشتی[١] نووسینی فێردینان دۆسوسوور[٢] بەبنیاتنەر و بناخەدانەری بنەماخوازی دادەنرێ کە تیایدا سوسوور ڕەخنە لەو زمانناسییە سوننەتی و مێژووییە ئەگرێ کە سەرەتای سەدەی بیستەم لە ئەکادیمیاکانی ئەوروپادا زاڵ بوو. بەواتایەکی دیکە، زمانناسی سوننەتی پێی وابوو زمان خاوەنی سروشتێکی گەڕانەوەییە و بەو پێیەش زمان و ئەدەبیات وەکو دەرکەوتە و دەنگدانەوەی واقیعی دەرەکی لە قەڵەم دەدا. پاش بڵاوبوونەوەی تیۆرە زمانناسانەکانی فیردینان دۆسوسوور ئەم ڕوانگەیە ڕووی لە زمان کرد. سوسوور بەمەبەستی ئەوەی کە سیستمی زاڵ و ڕاستەقینەی زمان بناسێنێ گرنگی دەدا بەلێکۆڵینەوەی هاوکاتیی زمان و وازی لە لێکۆڵینەوەی ناوکاتی یان مێژوویی زمان هێنا. لە زمانناسی سوننەتیدا زمان پێکهاتبوو لە هێمایانەی کە دەقاودەق دەربڕی چشتە دەرەکییەکان و ئەزموونەکانی مرۆڤ بوون، بەڵام بەپێی باوەڕی سوسوور زمان سیستمێکە لە نیشانەکان کە پەیوەندی نێوان هەر وشە یاخود نیشانەیەک لەگەڵ مانای ئەو وشەیە شتێکی بڕیارییە. بەواتایەکی تر پەیوەندی نێوان دال و مەدلوول لە هەموو زمانەکاندا بڕیارییە. جگە لەمەش هەر وشەیەک بۆ خۆی لە کۆمەڵێک پیت پێکهاتووە و جیاوازی نێوان پیتەکان لەهەر وشەیەکدا و جیاوازی نێوان وشەکان لەهەر ڕستەیەکدا تەنیا هۆی تێگەیشتنی مرۆڤە لەو وشەیە یان لەو ڕستەیە.

ئاکامی ئەم تیۆرەی سوسوور ئەوەبوو کە پەیوەندیی نێوان واقیعی دەرەکی و زمان لەناوچوو. هەر زمانە و خاوەن سیستمی سەربەخۆ و جیاوازی خۆیەتی و ئەرکی زمانناس دۆزینەوەی یاسا و ڕێساکانی زمانە. ئەم بۆچوونە بنەماخوازانەیەی سوسوور بۆ زمانناسی کاری زۆری کردە سەر لقەکانی دیکەی زانستە مرۆییەکان و تەنانەت زانستە سروشتییەکانیش. بۆ نموونە کلۆدلێڤی شتروس لە مرۆڤناسیدا و میشێل فۆکۆ لە گوتاری فەلسەفیدا و ژاک لاکان لە دەروونشیکاریدا و ژان پیاژە لە دەروونناسیدا و ڕۆلان بارت لە ڕەخنەی ئەدەبیدا و ڕۆمەن یاکوبسن لە زمانناسیدا بناخە داڕێژ و پەرەپێدەری بنەماخوازی گشتگیر و کاریگەری ناوەڕاستی سەدەی بیستەم بوون.

لە نێوانیاندا شتروس و فۆکۆ و لاکان و بارت وەکو پێشەنگی بنەماخوازیی فەرەنسی ناویان دەرکرد بەڵام ئەوەش بگوترێ کە لە شەستەکانیشدا کۆمەڵێک نووسەری دیکەی وەک تۆدۆرۆڤ، ژرارژنێت، کریستاڤا و ئێمبێر تۆئێکۆ لەم بوارەدا بەرهەمهێنی ئەندێشە

1- Courses on General Linguistics.

2- Ferdinand de Sanssoar.

بوون. زۆربەی ڕەخنەگران پێیان وایە کە جیا لە کاریگەرێتی حاشا هەڵنەگری کتێبەکەی سوسوور بەڕاستی ڕۆمەن یاکوبسن و چەند ئەندامێکی دیکەی قوتابخانەی پراگ بوون کە نەک هەر شوێن پەنجەی بیروڕاکانیان بەسەر بنەماخوازی فەرەنسییەوە دیارە بەڵکو تەنانەت دەوری سەرەکیشیان، لە سازکردنی پەیوەندی نێوان فورمالیزمی ڕوسی و بنەماخوازی فەرەنسیدا گێڕا.

بنەماخوازی بەسەر بوارە سوننەتییەکانی زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکاندا باز دەدا و بەپشتگوێ خستنی ئەوان هەوڵ دەدا بۆ خۆی ڕوانگەیەکی بابەتیانە لە سەرجەم دیاردە کولتووری و کۆمەڵایەتییەکان دەستەبەر بکات کە لە گێڕانەوە ئوستوورەییەکان و دەقە ئەدەبییەکانەوە تا تەنانەت ئاگاداریی ناو ڕۆژنامەکان و مۆدی جلوبەرگ ئەگرێتەوە. بنەماخوازی وەکو بنەمایەکی دەربڕ و گرنگ سەیری ئەو دیاردانە ئەکا، واتە، بنەماخوازی پێی وایە ئەم دیاردانە لە کۆمەڵێک نیشانە پێکهاتوون کە گرنگایەتییەکی تایبەتیان بۆ ئەندامانی کولتوورێکی تایبەت هەیە و ئەو خاڵەش دەرئەخەن کە ئەو دیاردانە بە چ شێوەیەک بایەخێکی کولتووری وا گرنگیان وەدەست هێناوە. لەم پێناوەشدا ئەوان تیشک ئەخەنە سەر پێوەندیگەلی نێوان توخمە دەربڕ و گرنگەکانی هەر کولتوور یاخود گوتارێکی تایبەت و هەوڵیش دەدەن یاسا و ڕێساکانی چۆنیەتی تێکەڵاوبوونیان و پەیوەندییان پێکەوە شی بکەنەوە. هەروەک چۆن سوسوور پەیوەندی و جیاوازیی نێوان پیتەکانی یەک وشە یاخود وشەکانی یەک ڕستە و دەستەواژە بەجەوهەریترین خاڵی سیستمی زمان و هۆی تێگەییشتنیان لەلایەن مرۆڤەوە ئەزانێ، هەر بەهەمان شێوەش بنەماخوازەکانی دیکە دیاردە کولتوورییەکان بەبنەمای خۆ بەڕێوەبەر و چۆنیەتی پەیوەندیی نێوان توخمە گرنگەکانەوە دائەنێن. بەواتایەکی ڕوونتر هەر دیاردەیەکی ساکاری کولتووری بۆ خۆی نیشانەیەکە کە تەنیا لە ڕێگەی پەیوەندی و جیاوازی لەگەڵ توخمەکانی تری ئەو سیستمە کولتووریەدا ئەبێتە خاوەنی شوناسی خۆی.

ئەگەرچی ئەو باسانەی کرا بناخەی یەکگرتوو و هاوبەشی بیری بنەماخوازانەی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم پێک ئەهێنن بەڵام لە لقە جیاجیاکانی زانستدا پەرەیان پێدرا و کەڵکیان لێ بیندرا، ئەگەرچی مەبەستە ڕەخنەییەکانیشیان زۆر جیاوازن. پسپۆڕانی بیرکاری پێیان وایە بنەماخوازی دژ بەچەند لق بوونەوەی بیرکاری وێستاوەتەوە. چونکە مەبەست لە بنەماخوازی لە(بیرکاریدا) ئەوەیە، کە بەکەڵک وەرگرتن لە هاوچەشنێتی بەرچاو لە نێوان پەلە جیاجیاکانی بیرکاردا یەکیەتی دابمەزرێنێ.



لە ڕوانگەی چەندین وەچەی زمانناسەوە. بنەماخوازی بەگشتی بریتییە لە دوورکەوتنەوە لە لێکۆڵینەوەی ناو کاتی دیاردە لێک دابڕاوەکانی زمانناسی، کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا برەوی هەبوو. هەروەها بەرەوپیرچوونی لێکۆڵینەوە لە بابەت سیستمە زمانییە یەکدەستەکان، کە بەشێوەی هاوکاتی کار دەکەن. بنەماخوازی لە دەروونناسیدا، لە زووەوە لەگەڵ شێوەگەلی ئاتمیستی، کە گشت دابەش ئەکات بەپارچە (پێکهێنەرە) پێشینەکانی دژایەتی نواندووە. لە ئاکامدا لە باسەکانی ئێستای فەلسەفەدا، بنەماخوازی لە بەرامبەر مێژووچیەتی، کارکردخوازی و هێندێ جاریش لە بەرامبەر گشت ئەو بۆچوونانەی کە خۆیان خستوەتە پاڵ بکەر یان سووژەی بەشەری، ڕاوەستاوە. کەوابوو ئەگەر بنەماخوازی لە ڕووی دژایەتیکردنی ڕێباز و ڕوانگەکانی دیکەوە پێناسە بکەین، واتە هەوڵ بدەین بنەماخوازی لە ڕوانگەی پووچەڵکردنەوەوە بناسێنین و بەتەنیا لێی نەکۆڵینەوە، ئاشکرایە جگە لە دژایەتی و کۆمەڵێ بیروڕای جیاواز کە لەگەڵ هەڵسوکەوتە ڕێکەوتەکانی مێژووی زانست و ئەندێشەدا پێکەوە گرێدراون، شتیکی دیکەمان چنگ ناکەوێ.

لە لایەکی دیکەشەوە کاتێ سەیری لایەنە باشەکەی ناواخنی بنەما ئەکەین، بەلانی کەمەوە دوو لایەنی هاوبەش لەناو هەموو جۆرەکانی بنەماخوازیدا دەبینینەوە. یەکەم: ئامانج یان ڕەنگە ئاواتی شیاوی تێگەیین بوونی سروشتی بنەما-یە، کە ئەویش بەپاڵپشتی ئەم گریمانەیە کە؛ بنەماکان سەربەخۆ یان خود خۆ بەڕێوەبەرن و درککردنیان پێویستی بەگەڕانەوە و پشتبەستن بەتوخم و شایەتی جۆراوجۆری دەرەکی نییە. دووهەم: بوونی هێندێ ڕاستی و ڕوانگە، واتە، بەلێکۆڵینەوەی تیۆریانەی ئەو پێکهاتانەی کە لە ڕاستیدا ڕوون بوونەتەوە، بۆمان دەرئەکەوێ کە بنەماکان سەرەڕای فرە چەشنێتیان خاوەنی کۆمەڵێ تایبەتمەندی هاوبەش و ڕەنگە پێویستیشن. بەکورتی وێنای پێکهاتە لەسەر بناغەی سێ چەمک دامەزراوە: چەمکی گشتیەتی، چەمکی گۆڕان، چەمکی خۆ ڕێکخەری.

| | |
|---|---|
| **بنەماخوازیی سەرەتایی** | **early structuralism** |
| **بنەمادارِشتن؛ بنەماسازی** | **structuration** |
| **بنەماشکێنی ⟵ هەڵوشاندنەوە** | |
| **بنەمای بازنەیی** | **circular structure** |
| **بنەمای بەش بەش** | **episodic struction** |

**بنەمای خوازەیی** metaphorical structure

**بنەمای شانۆیی** dramatic structure

**بنەمای وشەیی** verbal structure

**بنەمای هەڵوێست ئەنگێز** response - inviting structure

**بنەمایی** structural

**بنیات؛ جەوهەر؛ سروشتی ناوەکی** essence

**بنیاتخواز** essentialist

**بنیاتخوازی** essentialism

بنیاتخوازی بریتییە لەو بیروایەی کە پێی وایە چۆنایەتییەکان لە بابەتگەلی لێکۆڵینەوەدا زاتی و جەوهەرین و، کەواتە ئەو بەستێنانەش کە تیایدان و یان ئەخرێنە بەر لێکۆڵینەوە پەیوەندییان بەچۆنایەتیەکەوە نییە. هەر بەم بۆنەشەوەیە کە بیناتخوازی لە بۆچوون و تیۆرە دیالیکتیکی و چەمکی و یاخود تیۆرە پێوەندیدار و چوونیەکەکانی تر جیا ئەکرێتەوە. ئەم زاراوەیە لە خۆیدا هەڵگری ئەو دەربڕینەشە کە چۆنایەتییەکانی بابەتگەلی لێکۆڵینەوە بۆ خۆیان بەتەواوی ڕوون و ئاشکران و پێویستییان بەوە نییە کەس بەدوای بنەڕەتەکەیاندا بگەڕێ و یاخود بیەوێ لێکیان بداتەوە.

ئەمڕۆکە ئەم زاراوەیە پتر لە گوتاری سیاسیی هاوچەرخدا بەکار ئەبرێ و زۆرتر تەعبیر لەو دەسەڵات و ئایدیۆلۆژیا ئایینییە ئەکات کە ڕێڕەوێکی پووچەڵکارانە لە هەمبەر پێشکەوتە زانستی و دیموکراتیکەکانی جیهانی هاوچەرخ بۆ خۆی دەستەبەر ئەکات.

**بنەواشەگەلی بنەمایی؛ پرەنسیپە بنەماییەکان** structural principles

**بنیاتی هاوبەش** common essence

**بواری (ی زانستی)** field

**بواری تایبەت؛ لقی زانستی** discipline

**بۆچوون** approach

**بۆچوونی ئوستوورە ناسانە** mythological approach

(بڕوانە بۆ ئوستوورە و ڕەخنەی ئوستوورە ناسانە)

**بۆچوونی ڕەخنەگرانە** critical approach



بۆچوونی ڕەخنەگرانە هەڵگری دوو واتای سەرەکیە کە یەکیان گشتییە و ئەویدیش تایبەتی. واتای گشتی بۆچوونی ڕەخنەگرانە بریتییە لەو بۆچوونەی کە لە سۆنگەی بیرۆکە فەلسەفیە جیاجیاکانەوە لەلایەن تاکە جیاوازەکانەوە لە سەردەمە جۆراوجۆرەکاندا ڕەخنە لە چەمک، چشت، فەلسەفە یان تەنانەت زەینیەتێکی تایبەت ئەگرێ و لەوانەشە لە ڕێڕەوگەلی چوونیەک یاخود دژیەک کەڵک وەربگرێ. لەو پێناسەیەی سەرەوەدا ڕەخنەگر بەچاوێکی ڕەخنەگرانەوە دیاردەکانی خود و ئەویدی و بەگشتی دەق ئەخوێنێتەوە. بۆچوونی ڕەخنەگرانە بەپێی پێناسەکەی سەرەوە ئەتوانێ هەڵگری هەندێ مەبەستی جیاواز بێت وەک، ڕەخنەکاری، ڕوونکردنەوە، ڕاڤەکاری یان شڵەژاندن و ڕووبەڕووی قەیران کردنەوەی دەقەکە و هتد. واتای تایبەتی بۆچوونی ڕەخنەگرانە، بەڵام، بریتییە لەو بۆچوونەی کە ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرت گرتیانەبەر. بەمەبەستی دەستنیشانکردنی تایبەتمەندییەکانی ئەم بۆچوونەی دوایی پێویستە ئاوڕ لە تیۆری ڕەخنەگرانە بدەینەوە کە لەلایەن ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرتەوە پەرەی پێدرا.

**بۆچوونی سەرچەشنانە** archetypal approach

بریتییە لەو بۆچوونە ڕەخنەکاری و خوێندنەوەییەی دەق کە لە ڕەخنەی سەرچەشنانەدا ڕەچاو ئەکرێ.

**بۆچوونی میتۆدۆلۆژیکی؛ بۆچوونی ڕێبازناسانە** methodological approach

بریتییە لەو بۆچوونەی کە لە میتۆد و ڕێباز و ڕێڕەوێکی تایبەت کەڵک وەرئەگرێ یان واتای سەرەکی لێکۆڵینەوە کە لەبری ئەوەی کە هەندێ لایەنی تری وەک پاڵپشتی فەلسەفی و چەشنی تایبەتی جیهانینی دەربخا پتر میتۆدی لێکۆڵینەوەکە بەرجەستە ئەکاتەوە. لێرەشدا دیسانەوە ئەتوانرێ بۆ میتۆد دوو واتای سەرەکی دابنرێ کە بریتین لە واتای گشتی میتۆد یان جۆرێکی تایبەتی میتۆد، کەواتە بۆچوونی ڕێبازناسانە زیاتر لە نووسینە ڕێبازناسانەکاندا بەکار ئەبرێن. مەبەستی سەرەکیشیان فێرکاریی ڕێڕەوناسیەکی تایبەت یان ڕێبازناسییە جیاجیاکانە.

**بۆش ⟵ بەتاڵ**

**بۆشایی ⟵ بەتاڵایی**

**بۆنموونە** e. g = exempli gratia

**بووتیقا؛ هونەری شیعر** **poetics**

بووتیقا کە لە بنەڕەتدا لە ناوی کتێبەکەی ئەرەستووەوە وەرگیراوە بریتییە لەو زانست و هونەرەی کە لە سەرجەم چەشنە ئەدەبییەکان ئەکۆڵێتەوە و ئەمەش بۆوەتە هۆی چەشنە شێواندنێک لە زەینیەتی خوێنەرانی ئەمڕۆی ئەدەبدا. چونکە ئەگەر بووتیقا بەشێوەی هونەری شیعر مانا ئەکرێتەوە لەبەرچی سەرجەم چەشنە ئەدەبیەکان ئەگرێتەوە. کلیلی تێگەیشتن لەم دژوازیە لەوەدایە کە زاراوەی بووتیقا تا کۆتایی سەدەی هەژدەهەم لە زمانی ئەوروپییەکاندا بەمانای ئەدەب بەهەموو لقەکانیەوە بەکار ئەبرا. بەڕاستی ئەوە ئەمڕۆکەیە کە زاراوەی (poem) یان (poesy) تەنیا بۆ شیعر بەکار ئەبرای. کەواتە بووتیقا ئەو زانست و هونەرەیە کە دەلالەت دەکاتە سەر سەرجەم چەشنە ئەدەبیەکان کە لە ڕۆژگاری کۆندا و لە هەر سەردەمێکدا چەشنێکی تایبەتی ئەدەبی زاڵ بووە.

ئەگەرچی ئەمڕۆکە زاراوەی بووتیقا تەنانەت بۆ ئەدەبی قۆناغی هەنووکەییش بەکار ئەبرێ بەڵام پتر هەڵگری مانایەکی کلاسیکە. بەم پێیە ئەتوانین دوو جۆر بووتیقا دەستنیشان بکەین، یەکەم، بووتیقای کلاسیک کە پتر لە بەشی یەکەمی ئەدەبناسی ئەکۆڵێتەوە؛ واتە، تەنیا لە بەرهەمە ئەدەبیەکاندا و ژیاننامەی ئەدەبی و قوتابخانە و زاراوە ئەدەبیەکان و واتاکانی بەرهەمگەلی ئەدەبی ئەکۆڵێتەوە و کەمتر خۆی ڕووبەڕووی ڕەخنەی پراکتیکی دەقێکی تایبەت ئەکاتەوە. بووتیقا لەو مانایەی سەرەوەدا لە سەردەمە جیاجیاکاندا تاقمێ یاسا و ڕێسای تایبەتی بۆ خۆی دەستەبەر کرد، ئەمەش لە بووتیقای سەردەمی ئەرەستووەوە بگرە کە تیایدا بایەخ بەشانۆنامەی تراژێدی ئەدات لە چاو مێژوو، تا بووتیقای زاڵی سەدەی هەژدەهەم کە ئەگەرچی لەژێر کاریگەری بیرۆکەکانی کتێبی بووتیقای ئەرەستوودایە بەڵام زۆرتر جەخت لەسەر بابەتی فێرکاری لە ئەدەبدا دەکات. ئەگەرچی لە بووتیقای کلاسیکدا هەست بەنموونەگەلی تیۆری ئەدەبی ئەکرێ ئەمانە سەرلەبەر نموونەگەلێکی ساکار و تیژ تێپەڕن و کەواتە بووتیقای کلاسیک بەهۆی دوو خاڵی جیاکەرەوە لە بووتیقای هاوچەرخ جیاوازە کە بریتین لە نەبوونی ڕەخنەی پراکتیکی دەقێکی تایبەت بەشێوەیەکی گشتگیر و بەردەوام و هەروەها لە ئارادانەبوونی تیۆری ئەدەبی بەربڵاو و کاریگەر بەو شێوەیەی لە سەدەی بیستەمدا هەیە. کەچی لەلایەکی دیکەوە ئەو دوو بابەتەی سەرەوە لە بووتیقای هاوچەرخدا ئامادەبوونیان هەیە.

چەند نموونەیەکی بووتیقای کلاسیک بریتین لە بووتیقا، نووسینی ئەرەستوو، هونەری شیعر، نووسینی هۆراس، هونەری شیعر، نووسینی بوالۆ، وتارێک لەسەر ڕەخنە،



نووسینی ئەلەکساندێر پۆپ و پێشەکی کتێبی چامە لیریکەکان، بەرهەمی هاوبەشی وۆردزوۆرس و کالێریج، لە ئەدەبی فارسیشدا کتێبی (المعجم فی معاییر اشعار العجم)، نووسینی شەمسی قەیسی ڕازی بەنموونەی بەرچاوی بووتیقای فارسی دادەنرێ.

بووتیقای هاوچەرخ زۆرتر خۆی لە ڕواڵەتی ئەو دەقانە ئەبینێتەوە کە دەچنە نێو خانەی تیۆری ئەدەبیەوە وەک تیۆری ئەدەبی مارکسیستی، تیۆری ئەدەبی شێوەخوازانە، تیۆری ئەدەبی بنەماخوازانە و، تیۆری ئەدەبی پاش بنەماخوازانە و... جگە لەمەش بووتیقای هاوچەرخ هەڵگری چەند خوێندنەوەیەکی پراکتیکی دەقە ئەدەبییەکانە کە لە بۆچوونگەلی جیاوازی تیۆرە جیاجیا ئەدەبییەکانی سەدەی بیستەمەوە خراونەتە بەر ڕەخنەکاری.

**بوون – لە** **being - in**

**بوون – لە – جیهان – دا** **being - in - the - world**

**بوون – لەگەڵ** **being - with**

**بوونناسانە** **ontological**

**بوونناسی** **ontology**

بوونناسی لقێکە لە فەلسەفە کە بنەڕەت و جەوهەری (بوون) جیا لە پەیوەندییەکان و دیاردەکانی ئەخاتە بەر لێکۆڵینەوە. بەواتایەکی تر، بوونناسی بریتییە لە زانستی بوون (ئەرەستوو). بابەتی ئەم زانستە تەنیا بۆ بوون تەرخان کراوە هەروەک لە ڕەسەنایەتی بوون–ی هایدگێریشدا باس ئەکرێ؛ ئەم زانستە لەوانەشە هەندێ باس دەربارەی سروشتی بوونەوەرە ڕاستەقینەکان لەخۆ بگرێ، واتە، باسی بوونەوەرە بابەتییەکان و چیەتیەکەیان. گرنگترین پرسەکانی ئەم زانستە بریتییە لە دەستنیشانکردنی پێوەندیی نێوان بوون و چییەتی. لەلایەکی دیکەوە، بوونناسی بەپشتگوێ خستنی دیاردەکان و بارەکانی چشتەکانەوە بنەڕەتی چشتەکان کە بەواتای دیکارتی بریتین لە جەوهەری چشتەکان ئەخاتە بەر لێکۆڵینەوە. کەواتە بوونناسی لەم ڕووەوە لە هەمبەر دیاردەناسی دایە. هەڵبەت فەلسەفەکار ئەتوانێ وەکو سارتر لە کتێبی بوون و نەبوون لە (بوونناسیی دیاردەکان) بکۆڵێتەوە. جیاوازیی بوونناسی و میتافیزیکی ڕەخنەگرانە لەوەدایە کە بوونناسی دیاردەکان وەپشتگوێ ئەخات و دەچێتە ناخی قووڵایی بوونەوە تاکو بنەڕەت و جەوهەری چشتەکان بدۆزێتەوە، کەچی میتافیزیکی ڕەخنەگرانە تەنیا هەوڵ دەدات لایەنگەلی بەرایی مەعریفە بناسێت.

ڕەسەنایەتی بوونناسی یان بوونناسیخوازی بریتییە لەو قوتابخانە فیکری و فەلسەفییە کە تیایدا فیکر بەرەو باسە بوونناسانەکان مل دەنێ تاکو خەسارە جەوهەریەکانی بوون بخاتە بەر باس.

ئەگەرچی زاراوەی بوونناسی لە فەلسەفەدا بەکورتی بریتییە لەو زانستەی لە بوون ئەکۆڵێتەوە، بەڵام وەکو زاراوەیەکی ئەدەبی مانایەکی دیکە لەخۆ ئەگرێ. بەم پێیە بنەما و تەندراوەی دەق و بەتایبەت شیعر کە تێکەڵی یەکدی بوونە مانای ئەو شیعرە ئەدەن بەدەستەوە و لە ئاکامدا هەر بەهۆی ئەم تێکەڵاویەوە بوونناسییەکی تایبەت ئەدەن بەو شیعرە، ئەمەش واتە ئەو تایبەتمەندی و چۆنایەتییە تایبەتەی کە ئەو شیعرە هەڵگریەتی و لە ڕاستیدا لایەنی جیاکەرەوەی ئەم شیعرە و یاخود ئەو بوونەیە لەهەر شتێکی تر کە شیعر نییە.

**ontologism** — **بوونناسی خوازی**

(بڕوانە بوونناسی)

**being** — **بوون؛ هەبوون؛ بوونەوەر**

**polemical** — **بەباس و خواس؛ مشتومڕ هەڵگر (١)**

**argumentative** — **بەباس و خواس؛ مشتومڕ هەڵگر (٢)**

**blank (adj.)** — **بەتاڵ؛ بۆش (١)**

**empty** — **بەتاڵ؛ بۆش (٢)**

**blank (n.)** — **بەتاڵایی؛ بۆشایی (١)**

**gap** — **بەتاڵایی؛ بۆشایی (٢)**

**deification** — **بەخواکردن**

**بەدوایەکدا هاتنی کردەکان ◄—— بەرودوایی کردەکان**

**contrast** — **بەرامبەرێتی**

**analogical** — **بەراوردکارانە (١)**

**comparative** — **بەراوردکارانە (٢)**

**analogy** — **بەراوردکاری (١)**

**comparison** — **بەراوردکاری (٢)**



**analogy of experience** — **بەراوردکاریی ئەزموون**

**analogy of innocence** — **بەراوردکاریی بێگوناهی**

**collate** — **بەراوردکردن (١)**

**compare** — **بەراوردکردن (٢)**

**primitive** — **بەرایی**

(بڕوانە بەرایی خوازیی)

**primitivism** — **بەرایی خوازی**

بەرایی بریتییە لەو شتەی کە لە ڕووی کاتەوە لە هەموو چشتەکانی تر لە دواترەوە بێت و شتێکی کۆنتر لەو لە ئارادا نەبێ. هەڵبەت واژەی بەرایی بەماناگەلێکی دیکەش بەکار ئەبرێ. بۆ نموونە بەرایی بەو شتەش ئەوترێ کە چشتەکانی دیکە لەوەوە دەرک پێدەکرێن. هۆزە بەراییەکان بریتین لەو هۆزانەی بەر لە مێژوو یان لە سەدەگەلی یەکەمی مێژوودا ژیانیان بەسەر بردووە. زاراوەی بەراییخوازی لە فەلسەفەدا تەعبیر لەو قوتابخانەیە ئەکات کە شتە ئاسایی و سروشتەکان لەچاو شتە دەستکردەکان بەباشتر ئەنرخێنێ. لەو پێناسەیەی سەرەوەدا بابەت و شتە سروشتییەکان بریتین لەو شتانەی کە بەر یان جیا لە سەربەخۆیی کولتووری مرۆڤ و ئەقڵانیەت لە ئارادابوونە و بابەت و شتە دەستکردەکانیش بریتین لەو شتانەی کە مرۆڤەکان بەهۆی بیرکردنەوە و ئەقڵ و چالاکی و یاسا و ڕێسا تایبەتەکانی نێو پێوەندییە ئاڵۆزەکانی ناو کۆمەڵگەیەکی شارستانیدا بەدەستیان هێناوە.

نووسەری بەراییخواز بەگوێرەی وتەکانی هۆراس ئەو کەسەیە کە ئەمرۆکە بۆ ئەو ئەدەبە دەست دەدات کە چەشنە نۆستالۆژیایەک بۆ شێوە ژیانی بەرایی مرۆڤ یان ژیانی پێش شارستانێتی دەردەبڕێ. بەراییخوازی بەگشتی خۆی لە دوو شێوەدا دەردەخات کە بریتین لە بەرایی خوازیی کولتووی و بەراییخوازیی زەمانمەند.

**chronological primitivism** — **بەراییخوازی زەمانمەند**

بەرایی خوازی زەمانمەند بریتییە لەو بیروباوەڕەی کە سەردەمی ئایدیالی ڕەوشی ژیانی مرۆڤایەتی لە ڕابردوویەکی دوورەدەست دایە و ئەمەش دەلالەت لەو سەردەمە دەکات کە ژنان و پیاوان بەشێوەیەکی ساکار و ئازاد و سروشتیانە ژیانیان دەبردە سەر. ئەم بیرۆکەیە هەروەها تیشک دەخاتە سەر ئەم بابەتە کە ڕەوتی مێژوو بەردەوام تووشیاری داکشان و نزمبوونەوە بووە و لە ئاکامدا گەیشتووە بەبەرزترین پلەی ژیانی دەستکرد و ئاڵۆزی و

دڵەڕاوکێی تایبەت بەنەزمی کولتووری و کۆمەڵایەتی و دەروونناسانەی ئەم دۆخە.

ئەم بیروڕایە لە توندڕەوترین ئاستی خۆیدا پەنجە دەخاتە سەر ئەو بیرۆکەیەی کە سەردەمی ئایدیال تەنیا لە سروشتدا بوونی هەیە. واتە پێش ئەوەی کۆمەڵگا و شارستانێتی بێنە ئاراوە. بیرۆکەی بەراییخوازی زەمانمەند دژی چەمکی پێشکەوت-ە.

**بەراییخوازیی کولتووری؛ بەراییخوازیی فەرهەنگی** **cultural primitivism**

بەراییخوازیی کولتووری بریتییە لە بەباشتر دانانی سروشت و بابەتی سروشتی لەچاو دەستکرد و بابەتی دەستکرد لە هەموو بوارەکانی بایەخ و کولتووری مرۆڤدا، بۆ نموونە لە زانستی ئەخلاقدا بیرمەندێکی بەراییخواز غەریزە و هەستە سروشتییەکان لەچاو ئەقڵ و ئاوەزی دادوەری بەباشتر دادەنێن، یان لە فەلسەفەی کۆمەڵایەتیدا، بابەتی ئارمانی یان ئایدیال بریتییە لە شێوەگەلی سروشتی و ساکاری نەزمی سیاسی و کۆمەڵایەتی نەک ئەو دڵەڕاوکێ و ئاڵۆزیانەی کە بەهۆی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییە زۆر پێشکەوتوو و ئاڵۆزەکانەوە هاتوونەتە بەرهەم. بیرمەندی بەرایی خواز ئەو سروشتە دەرەکییەی بەلاوە مەبەستە کە مرۆڤ دەستی تێ وەر نەداوە، کەواتە لێرەدا مەبەست شارەکان و یاخود باخچە گشتییەکانی ناو شار نییە. لە ئەدەبیشدا و تەنانەت لە هونەرەکانی تردا ئەدیب و هونەرمەندی بەراییخواز دەربڕینی خودکار و ئازادی هەستە ناوەکییەکانی خۆی و بەرهەمە شهوودییەکانی بەهرەی سروشتی لەچاو ڕێکوپێککردنی ئەقڵانی ئامرازە هونەرییەکانی بەمەبەستی گەڕان بەدوای چارەسەری ئەقڵانی و گەیشتن بەشێوەگەلی دەستکردی هونەری و یاخود هەندێ یاسا و ڕێسا و ڕێککەوتنی ئەدەبی باشتر و ڕەسەنتر و دڵخوازتر دادەنێ. ئەوان پێیان وایە کە ژیان و چالاکی و بەرهەمەکانی مرۆڤی بەراییەکان لە جیهانی مۆدێرندا لانی کەم لە هەندێ بواردا لە ژیان و چالاکی و بەرهەمەکانی ئەو مرۆڤانەی لە کۆمەڵگای پێشکەوتوو و بەتایبەت لە شارەکاندا بەسەر ئەبەن زۆر باشتر و لەسەرترن.

ڕێبازی فەلسەفیی (وەحشیی نەجیب) لە سەدەی هەژدەهەمدا کە بەو پێیە مرۆڤ بەشێوەیەکی ئاسایی و سروشی بۆ خۆی ئەخلاقی و زیرەک و خاوەن دەسەڵاتی بیرکردنەوە و کارکردنە و، (شیعری سروشتی)ی ئەم سەدەیە کە شیعری فۆلکلۆر یان وەرزێرە نەخوێندەوارەکان بوو دوو لایەنی بەرچاوی بەراییخوازیی کولتووریی پێکدێنن.

ئەگەرچی بەراییخوازیی کولتووری تا ڕادەیەک کاری کردە سەر سەرجەم نەریتی ئەدەبی ڕۆمانتیکیی ئەورووپی، بەڵام توانی دەورێکی سەرەکی و گرنگ لە بیر و ئەدەبی



ئەمریکیدا بگێڕێ و تەنانەت (جیهانی نوێ) (واتە، ئەمریکا) لە سەرەتاوە وەکو سەردەمی زێڕینی ڕابردووی دوورەدەست و تەشقی بیری مەسیحی داهاتوو ڕاڤە دەکرا. هەروەها مرۆڤی سوور پێستی ئەمریکی هەندێ جار وەکو وەحشیی نەجیبی ئەفسانەیی دادەنرا و ئەو مرۆڤە ئەورووپییەش کە بەرەو ئەمریکا کۆچی ئەکرد وەکو ئادەمی نوێ دادەنرا کە خۆی لە ژیانی دەستکرد و ناڵەباریی شارستانێتی ئەورووپیی دوورخستبووەوە تاکو بەژیانی سروشتی ئازاد و پاکی و بێ گوناهی و ساکارێتی بگات.

**بەربێژ؛ چەپ بێژ** **strophe**

سێ زاراوەی بەربێژ یان چەپ بێژ، دوابێژ یان ڕاست بێژ، ناوبێژ یان بێژی وێستان لە ڕاستیدا سێ بەند یان پارچە هەڵبەستی قەسیدەی یۆنانی (قەسیدەی پێنداری)[1] پێکدەهێنن. مۆدێلی قەسیدەی پێنداری کە لە سترانی گرووپی کۆڕ لە تراژێدیای یۆنانیدا بەکار ئەهێنرا شێوەیەکی دژواری هەبوو، بەم چەشنە کە ئەگەر ئەندامانی گرووپی کۆڕ بەپێی کێشی سەماکەیان بەرەو لای چەپ هەنگاویان هەڵبگرتایە ئەو بەندە بەربێژ یان چەپ بێژیان پێ دەگوت. هەر بەهەمان شێوەش ئەگەر ئەندامانی گرووپی کۆڕ بەپێی کێشی سەما بەرەو لای ڕاست بچوونایە بەو بەندەیان دەگوت دوابێژ یان ڕاست بێژ. لە سێیەمین قۆناغی ئەم سەمایەی نێو تراژێدیاکانی یۆنانی کۆن ئەگەر ئەندامان بوێستانایە واتە لە نێوان چەپ بێژ و بەربێژدا بەو بەندەیان دەگوت ناوبێژ.

**بەرپرس؛ دەروەست** **commited**

**بەرپرسایەتی؛ دەروەستی** **commitment**

**بەرجەستە ← بەرهەست**

**بەرجەستەکردنەوە** **foregrounding**

بەرجەستەکردنەوە، کە ئەمرۆکە لەجیاتی (ئاشنایی سڕینەوە)ش دێتە بەکارهێنان، لە ڕاستیدا بریتییە لە پێشکەوتنێک لە پێناسەی چەمکی ئاشنایی سڕینەوەدا. ئەگەرچی هەردوو چەمکەکە پێوەندییان بەو ڕوانگەیەوە هەیە کە زمانی شاعیرانە بەڕاشکاوی لە شێوەگەلی دیکەی زمان جیا ئەکرێتەوە، بەڵام چەمکی بەرجەستەکردنەوە کە لەلایەن یان موکارۆڤسکی[1]-یەوە ئاراستە کرا. لەم پێناسەیەی خوارەوەی زمانی شاعیرانەدا ئاماژەی بۆ کراوە: «کارکردی زمانی شاعیرانە تا ڕادەیەکی زۆر بەرجەستەکردنەوەی دەربڕین و

1- Pindaric Ode

لەحنە و بەرجەستەکردنەوەی هەریەک لە پاژە پێکهێنەرەکانی گوتار لە ڕێگەی ئوتوماتیک و ئاسایی کردنەوەی پاژەکانی ترەوە سەرئەگرێ».

**بەرزایی؛ بەرزانی** **transcendental**

ئەم زاراوەیە لە قاموسدا بەمانای بەرزە و لە فەلسەفەی قوتابخانەیی چەرخەکانی ناوەڕاستدا بۆ بەرزترین و گشتیترین بارە مانایییەکان بەکار ئەهێنرا کە برێکیان بریتین لە یەکە، بوونەوەر، هەق، خێر و... هتد کە هەموویان لە وتەزاگەلی ئەرەستوویین، چونکە دەرهەق هەموو بوونەوەرێک، تاقمێکیان ڕاستە، بەڵام لە بەرهەمەکانی کانتدا ئەم زاراوەیە بەواتای نائەزموونی و هەندێ جار بەمانای میتافیزیکی بەکار هێنراوە. ئەگەر بەمانای نائەزموونی بەکاربهێنرێ بریتییە لە مەرجی بەر لە ئەزموون بۆ ئەزموونکردن، وەک یاسا ئەقڵییەکان کە وەکو یاسای ناسین دادەنرێن. (ناسینی بەرزایی) یان (مەعریفەی بەرزایی) تەنیا بەمانای ئاگاداری جەوهەری خودی مرۆڤ نییە بەڵکوو بەمانای ناسینی جەوهەری خودە، چونکە ئەم جەوهەرە سەرەتای پێویستی سەرجەم عاتیفە و هەستەکانە. کەواتە هەر باسێک کە لە ناسینی وێناکان یان ماناگەلی ئەقڵی بکۆڵێتەوە و لەو ڕووەوە کە ئەم ماناگەلە پێوەندییەکی ڕاستەوخۆ و پێویستیان لەگەڵ ئەزمووندا هەیە بە(باسی بەرزایی) دادەنرێ؛ بۆ نموونە، ئەکرێ باس لە (جوانیناسیی بەرزایی)، (لۆژیکی بەرزایی) و (ئەنجامگیریی بەرزایی) بکرێ. بۆ نموونە لۆژیکی گشتی لە لۆژیکی بەرزایی جیاوازە، چونکە لۆژیکی گشتی تەنیا باسی پێوەندیی واتاکان ئەکات کەچی لۆژیکی بەرزایی لە بنەڕەتی ئەم واتەگەلە و پێوەندییان لەگەڵ چشتەکان ئەکۆڵێتەوە. کانت ناوی ئەم فەلسەفەی بەرزانییەی ناوە فەلسەفەی ڕەخنەگرانە.

جیاوازیی نێوان بابەتی بەرزایی و بابەتی میتافیزیکی لەوەدایە کە سەرچاوەی بەرزایی پێویستە هەڵگری مەرجێکی پێش ئەزموونی بێت کە سەبارەت بەهەر ئەزموونێک و بەبێ لێکدانەوە و دەستنیشانکردنی ئەزموونەکان ڕاست بێت، کەچی سەرچاوەی میتافیزیکی یاسایەک دادەهێنێ کە بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەزموون مەعریفەی ئێمە زیاد ئەکات. زاراوەی بەرزایی کە لە فەلسەفەی کانتدا زاراوەیەکی فرە پاتە بەگشتی دەلالەت لەو بابەتە دەکات کە لە ئەزموونەوە نەهاتووە و بەڵکو پەیوەندی بەپێش مەرجەکانی ئەزموونەوە هەیە و ئەمەش بەشێکە لە تیۆری گشتیی سروشتی ئەزموون یان مەعریفە لە فەلسەفەی کانتدا.

---

1- Ian MOkarovski



**بەرزاییخوازی؛ بەرزانیخوازی** **transcendentalism**

بەرزاییخوازی قوتابخانەیەکی ئەدەبی و زۆرتر فەلسەفەیی ئەمریکای ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم پێکدێنی کە لە بیری کۆمەڵایەتی و ئایینی و تەنانەت ئابووری ویلایەتی نیوئینگلەندا لە ماوەی نێوان ساڵەکانی ١٨٣٠ تا ١٨٥٠ کاریگەر بوو.

بارودۆخی شۆڕشگێڕانەی تایبەت بەئەورووپای ئەو سەردەمە، فەلسەفەی ئەڵمانی و بەتایبەت بەرهەمەکانی دوو شاعیری گەورەی ئینگلیزی، واتە وۆردوۆرس و کالێریج، شوێنی زۆری لەسەر ئەو قوتابخانەیە دانا. ئەندامە سەرەکییەکانی ئەم قوتابخانەیە بریتی بوون لە: ئێمێرسۆن، تۆریۆ، فوولێر و فرێدریک هێج. گۆڤاری وەرزانەی دایڵ ئۆرگانی ناوەندیی ئەندامانی ئەم قوتابخانەیە بوو کە بۆ ماوەی چوار ساڵ (١٨٤٠ تا ١٨٤٤) وتار و شیعر و بۆچوونەکانیانی بڵاو دەکردەوە.

ئەگەرچی بەرزاییخوازی قەت هەڵگری فەلسەفەیەکی سیستماتیک و چوار چێوەدار نەبوو بەڵام خاوەنی بارێکی ڕۆشنبیرانە و تەنانەت عاتیفی بوو کە لە ڕێگەی دەنگە جیاجیاکانی ئەندامانی ئەو قوتابخانەیەوە دەردەبڕا و زۆرتر بناخەیەکی ئایینی بۆ خۆی دەستەبەر کردبوو و جەختی لەسەر دەور و گرنگایەتی ویژدانی تاکەکەس دەکردەوە و هەروەها بەردەوام تیشکی دەخستە سەر بایەخی شهود لە بابەتە ئەخلاقیەکان و سرووش و ئیلهامدا.

بەگوێرەی ئەو مێژوونووسە مۆدێرنانەی لەم قوتابخانەیان کۆڵیوەتەوە بەرهەمە سەرەکییەکانی بەرزاییخوازی بریتین لە: (توێژەرەوەی ئەمریکی)[1]، (ناونیشانی قوتابخانەی خواناسی)[2] و (متمانە بەخۆ)[3] بەرهەمی ئێمێرسۆن و کتێبی واڵدان یان ژیان لە جەنگەڵدا[4] بەرهەمی تۆریۆ. زاراوەی (بەرزایی) هەروەک ئێمێرسۆن لە لێدوانێکدا بەناوی (بەرزاییخواز)[5] ڕایگەیاندووە لە فەیلەسوفی ئەڵمانی کانت، وەرگیراوە؛ بەڵام ئەگەرچی مەبەستی کانت لە زاراوەی (زانیاریی بەرزایی) کۆبوونەوەی ئەو شێوە وتەزایانەی وەک شوێن، کات و چەندایەتیە کە لە ڕێگەی لایەنە پێکهێنەکانی

---

1- The Amerecan Scholar.

2- Dirincty School Address.

3- Self Reliance.

4- Walu or Life in a Wood.

5- The Transcendentalist.

زەینی مرۆڤایەتییەوە بەسەر تێگەیینی مرۆڤدا دەسەپێندرێن، کەچی ئێمێرسۆن و ئەندامانی تر چەمکی زانیاریی بەرزاییان بەشێوەیەک پەرەپێدا کە کانت پێشتر نکۆڵی لە بایەخەکەی کردبوو؛ واتە ئەوان پێیان وابوو زانستی بەرزایی کۆبوونەوەی شهوودیی ئەو بابەتە ئەخلاقی و هەقیقەتانەیە کە سنوورەکانی هەست و ئەزموونی مرۆڤایەتی بەرز ئەکەنەوە. هەڵبەت سەرەڕای ئەم کاریگەرێتییەی کانت چەند بیرمەندێکی ئەڵمانیی دیکە سەر بەقوتابخانەی پاش کانت خوازی جێ پەنجەیان لەسەر قوتابخانەی بەرزاییخوازی دانابوو، وێڕای ئەمانەش تا ڕادەیەک لەژێر کارتێکردنی فەلسەفەی ڕۆژهەڵاتیدا بوون.

ئەگەرچی ئەندامانی ئەم قوتابخانەیە خاڵی هاوبەشی کەمیان پێکەوە هەبوو، بەڵام هەر هەموویان دژی ئەقڵخوازیی خاوێن و فەلسەفەی ئەزموونیی قوتابخانەی جان لاک و ئایینی زۆر ڕەسمی، بەتایبەت وەک ئایینی باوی کالڤینیستی[1] ئەمریکی بوون. ئەوان بەردەوام بایەخی ئەو زانیارییەیان دووپات ئەکردەوە کە ڕەگوڕیشەی لە هەست و شهوود دایە و هەروەهاش ئەوەی لە ڕوانگەی ئەقڵی لۆژیکییەوە ڕەنگە لێکدژ بێتە بەرچاو بەلایانەوە پەسند دەکرا و بەگشتی بانگەشەیان بۆ ئەو ئەخلاقە تاکخوازانە ئەکرد کە پێی لەسەر متمانە بەخۆ و ڕێزنان لەخۆ دادەگرت.

### sublime — بەرزەجێ؛ بابەتی بەرزەجێ

بابەتی بەرزەجێ یان بیرۆکەی (بەرزەجێیەتی) لە زانستی کەلامەوە هاتووەتە نێو باسە ڕەخنەیییەکانەوە و پتر لەم ڕێگەیەوە شێوازە جیاجیاکانی گوتە و نووسینی دەستنیشان دەکرێن کە بەگشتی بریتین لە شێوازی نزم و مامناوەندی و بەرز. دەربارەی بابەتی بەرزەجێ[2] ناونیشانی کتێبێکی لانجینوس[3]-ە کە یەکێکە لە کەلامزانانی ڕۆمی کۆن. لەم کتێبەدا لانجینوس بابەتی بەرزەجێ پێناسە دەکا و تایبەتمەندییەکانی دەقێکی خاوەن شێوازی بەرزەجێ دەخاتە ڕوو. بەباوەڕی لانجینوس پێنج سەرچاوەی بەرزەجێیەتی لە گوتە و نووسیندا بریتین لە: گەورەیی و بەرزی و بیر و فکر بەمەبەستی توانای وەدەستهێنانی چەمک و واتای مەزن، هەستی ئیلهام پێکراو، بەکارهێنانی کاریگەری هونەرە گوتەیی و کەلامیەکان، زمانی دیار و سەرنجڕاکێش کە هەڵگری خوازە شێوە زمانیەکانە، دەسەڵاتی گشتی و بەرزیی شێواز.

1- Calvinism.

2- On the Subline.

3- Longinus.



ئەگەرچی لە سەدەی حەڤدە و هەژدەهەمدا بیرۆکەی بەرزەجێیەتی بەگشتی ڕەچاو نەدەکرا بەڵام لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم بەم لاوە و بەتایبەت لە ئەدەبی ڕۆمانتیکی سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا بابەتی بەرزەجێ و بەرزەجێیەتی لە ئەدەبدا بەتەواوی ڕەنگی دایەوە کە تەعبیری لە بیری مەزن و هەستی نەجیب و شێوازی سەرنجڕاکێش و ڕەوانبێژی گوتە و نووسین بەتایبەت لە بواری شیعردا ئەکرد.

### sublimity — بەرزەجێیەتی

(بڕوانە بەرزەجێ)

### super - ego — بەرزەخود؛ بەرزەمن

(بەرزەخود) یەکێکە لە سێ بەشی پێکهێنەری زەینی ناهۆشیاری مرۆڤ (بەپێی دەروونناسیی فرۆید). (بەرزە خود) کە لایەنی دژی (نزمەخود)ە، بریتییە لەو بەشەی ناخودئاگای مرۆڤ کە جێگەی خۆشەویستی و تایبەتمەندییە باشەکانی مرۆڤ (بەپێی ئەخلاقی مرۆڤایەتی و بایەخەکانی کۆمەڵگا) و بەتایبەت جێگەی ویژدانی مرۆڤە و بەردەوام بەشێوەیەکی نا هۆشیارانە مرۆڤ بەرەو لای ئەنجامدانی کاری مرۆڤانە و باش دەکێشێت. لە دۆخی ئاساییدا لە ڕێگەی (خود)ی زەینی نا هۆشیارەوە هاوسەنگیەک لە نێوان (بەرزەخود) و (نزمەخود)دا دادەمەزرێ. لە دۆخی نائاسایی دەروونناسانەدا ئەگەر (بەرزەخود) دەسەڵاتی ناهۆشیاری زیاتر بێت، ئەنجامەکەی بریتییە لە نەخۆشییەکی دەروونی کە بە(هەستی تاوان) ناوبردە دەکرێ.

### high seriousnes — بەرزە مەبەستی

ئەم زاراوەیە ڕۆنراوی مەتیو ئارنۆڵد[1]-ە کە ڕەخنەگرێکی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بوو. ئەم ڕەخنەگرە ئینگلیزییە بەیارمەتی ئەم زاراوەیە و چەند زاراوەیەکی تایبەتی دیکەی لەم چەشنە هەوڵی دا پێناسەی تایبەتی خۆی بۆ ڕەخنە و ڕەخنەگر لە گوتاری ئەدەبی کۆمەڵایەتیدا ئاراستە بکا. بەبڕوای وی، ڕەخنەگر پێویستە خاوەنی (بەرزە مەبەستی) بێت کە ئەمەش بریتییە لە خوێندنەوەی ڕابردوو و دەق بەگوێرەی ئەخلاقێکی تایبەت و بەشێوەیەکی وردەکارانە کە تیایدا ڕەخنەگر بتوانێ باشترین دەقی سەردەمە جیاجیاکان بەباشترین شێوە بخاتە بەر ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و بەردەوام هەندێ بنەواشەی وەک بایەخدان بەچەند کولتوورێکی ڕابردوو و ڕەچاوکردنی

1- Matheu Arnold (1822-1888)

ناسیۆنالیزمی بیردۆزانە و خۆپاراستن لە چوونە ناو بازنەی ڕەخنەی قوتابخانە زاڵە ڕابردوو و هەنووکەییەکانی بەلاوە گرنگ بێ.

**بەرزێتی** **transcendence**

ئەم زاراوەیە لە بنەڕەتدا بەمانای بەرزبوونەوەیە و مەبەست ئەوەیە کە چشت هێندە بەرز ببێتەوە تا لە هەموو چشتەکانی تر بەرزتر بێت. بابەتی بەرز ئەو شتەیە کە هێندە بەرز بێ شتێکی بەرزتر لەو لە ئارادا نەبێ. هەر بۆیە خواوەند بەرزە و لەو بەرزێتیەدایە کە هیچ شتێکی بەرزتر لەو لە گۆڕێدا نییە. فەلسەفەی بەرزێتی، پتر لە فەلسەفەی ئیسلامیدا، لە سێ ڕەهەندی سەرەکیدا دەرئەکەوێ: یەکەم، پێوەندی خواوەند بەجیهانەوە وەکو پەیوەندی ئاغا بەرەعیەتەوە و باوک بەمناڵەوە وایە (وتەی لایبنیتس لە کتێبی مۆنادۆلۆژیدا). دووەم، لە سەرووی دیاردە هەست پێکراوە بگۆڕەکاندا جەوهەرگەلی نەگۆڕ و هەقیقەتگەلی وەها سەربەخۆ لە ئارادان؛ سێیەم، پەیوەندیگەلێکی نەگۆڕ هەن کە بەسەر ڕووداوەکاندا زاڵ و جیاوازن لێیان. بەواتایەکی دیکە هەر فەلسەفەیەک وای بۆ بچێ کە لە جیهاندا سیستەمێکی ڕێچکەیی زاڵە و تیایدا دیاردەکان بەندن بەوێناکانەوە و وێناکانیش بەندن بەسەرچاوە و بنەماکانەوە، بەفەلسەفەی بەرزێتی ناودێر دەکرێ.

**بەرژەوەندخوازی** **Utilitarianism**

بەرژەوەندخوازی قوتابخانەیەکی فیکری و پتر ئابووری بوو کە سەرەتا لەلایەن بیرمەندی ئینگلیزی، جێرێمی بێنتام[1]–ەوە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا ئاراستەکرا و پاشان لە نیوەی یەکەمی ئەم سەدەیەدا (سەدەی نۆزدەهەم) بووە هۆی هەڵگیرسانی مشتومڕێکی زۆر دەربارەی بابەتە ئابووری و تەنانەت ئایینییەکان و شێوەی تایبەتی هەڵسوکەوت لەگەڵ دامەزراوە حوکمی و گشتیەکاندا و ئەمەش تا ئەو ڕادەیە بوو کە بەگوێرەی وتارە بەرچاوەکانی جان ستوارت میل[2] کێشەی فیکریی نێوان بنتام و نووسەری دژی ئەم قوتابخانەیە واتە کالێریج سەرنجی زۆربەی هەرە زۆری ڕۆشنبیران و بیرمەندانی ئەو سەردەمەی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو.

بەرژەوەندخوازی، هەروەک بەناوەکەیدا دیارە، بریتییە لەو قوتابخانەیەی کە بەردەوام بەدوای بەرژەوەندی زیاتر بۆ جەماوەری زیاتردا دەگەڕێ، واتە سوودی زۆرتر بۆ جەماوەری

---

1- Jeremy Bentham (1748-1832).

2- John Stuart Mill (1806-1873).



زۆرتر. لەم پێناوەشدا پێیان وابوو کە پێویستە سەرجەم دامەزراوەکان لە ڕێگەی ئەقڵی مرۆڤەوە بخرێنە بەر نرخاندن و تاقیکردنەوە بەو مەبەستەی لە ئاکامدا ئەو خاڵە دەرکەوێ کە کام لەم دامەزراوانە بۆ جەماوەر سوودبەخشن، چونکە بانگەشەیان بۆ بەختەوەری زیاتر بۆ جەماوەری پتر دەکرد. ئەو تاقیکردنەوە بەرژەوەندیانەیە ڕێڕەوێکی زۆر کاریگەر بوو لە دەرخستنی خاڵە لاوازەکانی ژمارەیەک لە دامەزراوە حکومیەکان. بەڵام کێشەکان کاتێک سەریان هەڵدا کە ئەندامانی ئەم قوتابخانەیە پێیان وابوو کە پێویستە تەنانەت دامەزراوەیەکی کۆن و گشتگیر وەک کلیسای ئینگلیس یان بیری ئایینی بەگشتی بخرێتە بەر تاقیکردنەوە. دیارە بیرمەند و نووسەرانی ئایینی ئەم سەردەمە، واتە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم، نارەزایەتیان لە هەمبەر ئەم هەڵوێستەی دوایی ئەندامانی قوتابخانەی بەرژەوەندیخوازی بەشێوەگەلی جیاجیا دەربڕی.

**بەرکاری ڕەها** **cognate object**

**بەرگری (١)** **apology**

**بەرگری (٢)؛ مۆڵەت نەدان** **avoidance**

**بەرناس ⟵ ئۆبژە**

**بەرودوایی** **sequence**

**بەرودوایی کردەکان؛ بەدوای یەکداهاتنی کردەکان** **sequence of actions**

**بەرەو بڕکردن؛ قەدەغەکردن** **forbrid**

**بەرەودواچوون؛ ڕەوتی بەرەودوا** **retrospection**

**بەرهەست؛ بەرجەستە** **concrete**

**بەرهەستکردنەوە؛ بەرهەستکاری** **concretization**

بەرهەستکاری، کە دژی دەرهەستکاری–ە، ئەو کردەیەیە لە ڕەخنەی ئەدەبیدا لەکاتی خوێندنەوەدا ڕوو دەدا. واتە، دەقی ئەدەبی بۆ خۆی و بەتەنیا دەرهەستە و کاتێ خوێندرایەوە ڕواڵەتێکی بەرهەست لەخۆ ئەگرێ. بەپێی بڕوای دێریدا بەرهەستکاری هەر خوێنەرێک لەویدی جیاوازە – ئەکرێ ئەوەش بوترێ کە بەرهەستکاری کاتێ دێتە کایەوە کە دەقەکە سەرلەبەر و بەتەواوی بخوێندرێتەوە، چونکە ئەگەر کورتەی دەق یان کورتەی ڕووداوەکان و یاخود پوختەی تایبەتمەندییەکانی دەق بۆ خوێنەر بگێڕدرێتەوە ئەوا ئیدی بەرهەستکاری ڕوو نادات.

**بەرهەڵستکار ← دژکار**

**بەرهەم (١)** — oeuvre (Fr.)

**بەرهەم (٢)** — product

**بەرهەم (٣)** — work

**بەرهەمگەلی نادیار؛ بەرهەمگەلی گوماناوی** — apocrypha

**بەرهەمگەلی (سەردەمی) لاوێتی** — Juvenilia

**بەرهەمهێنانەوەی میکانیکی** — mechanical reproduction

**بەرهەمهێنەرێتی** — productivity

**بەرهەمی (ئەدەبی و هونەریی) نەمر** — classic (2)

**بەرهەمی ئەدەبی** — literary work

**بەرهەمی هونەری** — work of art

**بەرهەمی ئەدەبیی لاواز** — pot - boiler

**بەزمەسات ← کۆمیدی**

**بەستێن؛ زەمینە** — context

**بەستێنسازی؛ زەمینەدانان** — contextualisation

**بەستێنی دانەرانە؛ بەستێنی خولقێنەرانە** — authorial context

**بەستێنی؛ زەمینەیی؛ پەیوەندیدار بەدەقەوە** — contextual

**بەستێنی مێژوویی؛ زەمینەی مێژوویی** — historical context

**بەشانۆکراو؛ نوێندراو (٢)** — dramatized

**بەشانۆکردن؛ نواندن** — dramatization

**بەشبەش** — episodic

**بەشی سەرەتایی (کتێب)** — prolegomena

**بەشی کۆتایی (ئینجیل، بەڵێنی نوێ)** — Revelation (3)

**بەشی کۆتایی ← دوابەش**

**بەکەم دانان؛ بەکەم زانین (١)** — meiosis



**بەکەم دانان؛ بەکەم زانین (٢)** — understatement

**بەلارێدا بردن؛ چەوت نواندن** — distortion

**بەڵگەمەندی؛ ڕەسەنایەتی (٢)** — authenticity

**بەڵێن؛ وەعد؛ پەیمان** — testament

(بڕوانە بەڵێنی کۆن)

**بەڵێنی کۆن. وەعدی کۆن** — Old Testament

وشەی (testament) بەماناگەلی بەڵێن، وەعد، پەیمان، وەسیەت، شایەت و بەڵگە دێتە بەکارهێنان (و بەهیچ جۆرێک بەمانای سەردەم و قۆناغ و دەورە بەکار نەهاتووە). ئەم وشەیە تەعبیر لە پەیمان یان بەڵگەیەکی گرنگ و چارەنووسساز و تەنانەت میتافیزیکی ئەکات؛ بۆ نموونە ئەو بەڵێنەی مرۆڤ لەگەڵ خۆی هەیەتی یان ئەو پەیمانەی مرۆڤ لەگەڵ پێغەمبەرەکاندا ئەیبەستێ یاخود ئەو پەیمانەی کە لە نێوان مرۆڤ و خواوەندا هەیە. ئەکرێ بەشێوەی وەسیەتی گرنگ بەکار ببرێ و تەنانەت بەمانای شایەتی ئامادە و بەڵگەنەویست بەکار ئەهێنرێ.

وەعدی کۆن یان بەڵێنی کۆن بریتییە لەو کتێبە پیرۆزە ئاسمانییەی مێژوو و سەربووردەی جوەکان و بیروبڕواکانیانی تیادا نووسراوە و لەناو ئێمەدا بەکتێبی تەورات ناوبردە کراوە. بەواتایەکی دیکە، کتێبی تەورات بریتییە لەو بەڵێنەی کە جەماوەری جوولەکە بەمووسا پێغەمبەریان دا (و پاشان ئەو پەیمانەیان شکاند).

**بەڵێنی نوێ؛ وەعدی نوێ** — New Testament

بەڵێنی نوێ کە هەمان کتێبی پیرۆزی ئینجیل-ە بریتییە لەو بەشەی کە ئامۆژگارییەکانی عیسا پێغەمبەر و پەیڕەوانی نزیکی ئەوی تێدایە. کەواتە بەڵێنی نوێ، وەک بەڵێنی کۆن، ئەو پەیمانەیە کە جەماوەر لەگەڵ عیسا پێغەمبەر و خوادا بەستیان (و پاشان لەلایەن زۆربەی جەماوەرەوە پشتگوێ خرا).

**بەند هەڵبێژ؛ بێژەری شیعری پیاهەڵدان** — panegyrist

**بەند هەڵگوتن؛ پیاهەڵدان (١)** — panegyric

**بەند هەڵگوتن؛ پیاهەڵدان (٢)** — eulogy

**بەهادار؛ بەهامەند** — normative

**بەهامرۆییە گەردوونییەکان** — **universal human values**

**بەهرەی تاکی؛ بەهرەی تاکەکەسی** — **individual talent**

**بەهەشتی ← ئاپۆکالیپتیک**

**بەهەشتی سەرزەوی ← ئارکادیا**

**بەیەکبوون** — **unification**

**بێ ئەدەب و نەریت، بێ ڕەوشت و نەریت (١)** — **agroikos**

**بێ ئەدەب و نەریت؛ بێ ڕەوشت و نەریت (٢)** — **churlish**

**بیرداڕێژی ← تیۆر**

**بیردۆزانە** — **Formulaic**

**بیردۆزی** — **Formula**

**بیرکردنەوەیی** — **reflective**

**بیرگەی مێژوویی** — **historical memory**

**بێرلێسک** — **burlesque**

بێرلێسک کە بەشێوەی (لاسایی کردنەوەی نابار) پێناسە ئەکرێ بریتییە لەو بەرهەمە ئەدەبیەی کە شێوە یان شێوازی بەرهەمێکی جیددی یان چەشنێکی ئەدەبی بەشێوەیەکی گاڵتەئامێز ئەکاتەوە و لە پاڵ ئەمەشدا بەزەقکردنەوەی جیاوازیی نێوان بابەتی بەرهەمەکە و شێوە و شێوازی بەرهەمەکە بەشێوەیەکی تەوساوی لاسایی بەرهەمەکە ئەکاتەوە. هێندێ جار تەنیا بەمەبەستی پێکەنین ئەنووسرێ و، هێندێ جاریش بەشێکە لە تیز و تەنز.

ئەگەرچی سێ زاراوەی (بێرلێسک)، (پارۆدی) و (هەجوو) زۆربەی کات لەبری یەکتر بەکارئەبرێن بەڵام بێرلێسک زۆرتر وەکو زاراوەیەکی گشتی و گشتگیر بۆ ئەوانیتر بەکار ئەبرێ. بێرلێسک بەسەر دوو چەشنی بێرلێسکی بەرز و بێرلێسکی نزمدا دابەش دەکرێ. بێرلێسکی بەرز واتە ئەو بەرهەمەی کە شێوە و شێوازەکەی بەرز و هونەرییە بەڵام بابەتەکەی نزم و بێ بایەخە. بەپێچەوانەوە بێرلێسکی نزم بریتییە لەو بەرهەمە لاساییکەرەوە کە بابەتەکەی بەرز و سەرنجڕاکێشە، بەڵام شێوە و یاخود شێوازەکەی بەئەنقەست بەشێوەیەکی نزم دادەنرێ، هەردووک بێرلێسکی بەرز و نزم بەچەند بەشی بچووکتر دابەش دەبن.



**بیرۆکە** — **doctrine**

**بیرەوەری مێژوویی** — **historical memory**

**بیرهێنانەوەی واتاکان؛ واتاکێشەکی** — **association of ideas**

**بیری ئوستوورەیی** — **mythical thought**

(بڕوانە ئوستوورە)

**بیری پاش بنەماخوازانە** — **post - structuralistic thought**

**(بڕوانە پاش بنەماخوازی)**

**بیستەنی؛ ژنەفتەنی؛ دەنگناسانە** — **acoustic**

**بیسەری گێڕانەوە** — **narratee**

**بیناسازیی گوتیک** — **Gothic architecture**

**بینەری یەکەم کەس** — **first person observer**

**بێ هەست (بەرامبەر بەهونەری ڕەسەن)** — **philistine**

ئەم زاراوەیە لەو تاقمە زاراوەیەیە کە ڕەخنەگری ئەدەبی و کۆمەڵایەتی ئینگلیزی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم، واتە مەتیوئارنۆڵد، بەکاری دەهێنا، ئارنۆڵد لە ڕەخنە کۆمەڵایەتییەکانی خۆیدا کۆمەڵگای ئینگلیزی و بەتایبەت شاری لەندەنی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمی بەسەر سێ چیندا دابەش دەکرد. بەباوەڕی ئەو، چینی زۆرینەی ئەوسای لەندەن کە لە جەماوەری مامناوەندی و خوێنەری ڕۆژنامەکان پێکهاتبوو کە هێندە چووبوونە ناخی ژیانی ئاساییەوە خۆیان بەکاری ئاسایی و تەنانەت خوێندنەوەی بەرهەمە ئاساییەکان سەرقاڵ ئەکرد کە لە هەمبەر ئەدەب و هونەری جیددی و ڕەسەندا خاوەن هەست و هەڵوێست نەبوون. ئەم چینە بەلایەن ئارنۆڵدەوە بەجەماوەری (بێ هەست...) ناوبردە دەکرا.

**بینینەوە ← پێداچوونەوە**

## پێ

**پابەندی زەمینەی دەق** **context - bound**

**پارادایم** **paradigm**

ئەگەرچی ئەمڕۆکە زاراوەی پارادایم لە لقە جیاجیاکانی ڕەخنەی ئەدەبیدا وەک ڕەخنەی ئەدەبی بنەماخوازانە و شێوازخوازانە و بەتایبەت لە زمانناسیی بنەماخوازانەدا بەکار ئەبرێ، بەڵام ئەم زاراوەیە لە فەلسەفەوە هاتووەتە نێو ئەو لقانەوە و لە ئەدەبیشدا دیسانەوە پێناسەکەی دەگۆڕدرێ. پارادایم و بەتایبەت گۆڕانکاریی پارادایم پاش بڵاوبوونەوەی کتێبەکەی تامس کووهن[1] بەناوی بنەمای ڕاپەڕینە زانستیەکان[2] (١٩٦٢) بەشێوەی فرەپات و بەلێشاو لە بوارگەلی دیکەدا هاتە بەکارهێنان، بەبڕوای ئەو هەندێ جڤاتی پێشکەوتوو یاخود چەند بوارێکی پسپۆڕانە لەسەر پەسەندکردنی (کۆمەڵێک وێنای بەردەوام و شێوە ستاندارد لە تیۆرە جیاجیاکان دامەزراون کە لە ڕوانین و کاربردە واتایی و مەبەستدارەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە». ئەم وێنایانە پارادایمگەلی ئەو جڤاتە پێک دەهێنن و لە کتێبی وانە و لێدوان و چالاکیەکانی نێو تاقیگەکاندا وەبەرچاو ئەکەوێ.

کووهن توێژینەوەیەکی بەرفراوانی لەسەر چۆنیەتی بەدیهاتنی گۆڕانکاری لە بیری زانستیدا ئەنجام داوە، چەمکی پارادایمیش دەوری سەرەکی لە لێکۆڵینەوەکەیدا دەگێڕێ. پارادایم لەم ڕوانگەیەوە ئەو وێنایانە نین کە کووهن دەستنیشانیان دەکا بەڵکو بریتین لەو فیکر و شێوە ڕوانینانەی کە لە پشتی خودی ئەم وێنایانەوە هەن، یان ئەو دیدگایانەی کە خودی ئەم وێنایانە پێشنیاری دەکەن؛ بەواتایەکی دیکە، پارادایم بریتییە لە کۆی ئەو بیروڕایانەی کە لەلایەکەوە ئەبنە هۆی سەرگرتنی لێکۆڵینەوەیەک و لەلایەکی دیکەشەوە هەر هەمان لێکۆڵینەوە سنووردار ئەکەنەوە. کەواتە، پارادایم چوارچێوە و کۆی ئەو ڕوانین

1- Thomas Cohen.

2- Scientific Revolution.



و باوەڕانە پێکدێنن کە لەلایەکەوە یارمەتیدەرن بۆ ئەنجامگەیاندنی ئەو لێکۆڵینەوەیە و لەلایەکی تریشەوە هەر هەمان لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵێک ئەگەر و شیمانە و ئاکامی دیکە دوور ئەخەنەوە.

پارادایم وەکو زاراوەیەک پتر لە فەلسەفەی زانستی تامس کوهندا سەری هەڵدا و بەو پێیە باس لە ئەگەر یاخود پێویستی بەدیهاتنی پێشکەوتنی زۆر و بەرچاو لە تیۆری زانستیدا دەکرێ کە ئەمەش لە ڕێگەی گۆڕانکاری پارادایمە هەبووەکانەوە سەر ئەگرێ. لە ڕەخنەی ئەدەبیشدا، بەکاریگەری وەرگرتن لەو باسانەی سەرەوە، ئاماژە بۆ پارادایمە ئەدەبیەکان ئەکرێ کە گۆڕانکاریان بەسەردادێ. لەم ڕوانگەیەشەوە ئەو بەرهەمە ئەدەبیە بەچاک دادەنرێ کە لە ڕێگەی پارادایمە ئەدەبیە نوێکانەوە دەرک بکرێ یاخود ئەو پارادایمە ئەدەبیە نوێیانە یارمەتیدەربن لەپێناو باشتر تێگەیشتنی ئەو بەرهەمە. تایبەتمەندی و چەشنەکانی پارادایمگەلی جیاواز لە جڤات و یاخود بوارە جیاجیاکاندا پەیوەندیی ڕاستەوخۆی بەئیپیستمی ئامادەی نێو ئەو جڤات و بوارەوە هەیە.

**پاراستنی خود** ⟵ **خۆپارێزی**

**پارچەبەندی** **bricolage**

گەرچی زاراوەی پارچەبەندی لە ئەدەب و هونەرە جیاجیاکاندا بەکار ئەبرێ و هەڵگری پێناسەی تایبەتی خۆیەتی و بەڵام ئەم زاراوەیە بەشێک لەو کۆمەڵە واژانە پێکدێنێ کە لە سیستمی فیکری کلۆدلێڤی شترۆسدا و بەمەبەستی دەستنیشانکردنی جیاوازییەکانی نێوان مرۆڤی بەرایی و مرۆڤی مۆدێرن بەکار ئەبرێ و پاشان لەلایەن ژاک دێریداوە ڕەخنەی توندیان ئاراستە کرا. شترۆس لە کتێبی زەینی وەحشی[1]دا سیستمە نیشانەییەکانی مرۆڤی مۆدێرن و هاوچەرخ لەوانەی مرۆڤی بەرایی جیا ئەکاتەوە. شترۆس پێی وایە مرۆڤی مۆدێرن وەک ئەندازیارێک ئامێر و مادە پسپۆڕانە و باو و بەرزەکان بەکار ئەهێنێ کەچی مرۆڤی بەرایی وەکو مرۆڤی سەیر وێنا کراوە لە کارکردندا کە مەبەست و تایبەتمەندییەکانی کەرەسە خاوەکان بەنیازی چێکردنی بەندی بەکارئەهێنێ. بەواتای شترۆس «بیری ئوستوورەیی چەشنێک پارچە بەندیی ڕۆشنبیرییە».

شترۆس لە درێژەی باسەکەیدا تیشک دەخاتە سەر ئەو خاڵە کە «هونەرمەند لەلایەکەوە زانیارە و لەلایەکی تریشەوە ئەو کەسەیە کە پارچەبەندی ئەکات». کەواتە، هونەر لە

1- The Wild Mind.

شوێنێکدا «لەنێوان بیری زانستی و بیری ئوستوورەییدا جێگیر دەبێ». ئەم ڕوانینانەی شترۆس بۆ چەمکی پارچەبەندی لەلایەن ژاک دێریداوە کەوتە بەر ڕەخنە، دێریدا لە ڕێگەی ڕەخنەی هەڵوەشێنەرانەوە دوانەی لێکدژی مرۆڤی مۆدێرن و یاخود مرۆڤی ئەندازیار و مرۆڤی پارچەبەند هەڵئەوەشێنێتەوە. پاشان بەو ئاکامەش دەگات کە هیچ پارچەبەندییەک خاوەنی یەکێتی و سەرچاوەیەکی ڕەها نییە و سەرجەم دەقەکان بۆ خۆیان پارچەبەندیگەلێکن کە تیایاندا بەهیچ شێوەیەک ئامادەبوون و چەق و یاخود سەرچاوەی ڕەها لە ئارادا نییە.

### پارچە پارچەیی — fragmentariness

ئەگەرچی پارچە پارچەیی وەکو هونەرێک، بەشێوەیەکی هۆشیارانە و ناهۆشیارانە، لە تاقمێ بەرهەمی ئەدەبی سنوورداری سەردەمی سەرهەڵدانی ئەدەبی مۆدێرنیستیدا وەبەرچاو ئەکەوێ. بەڵام بەگشتی بەتایبەتمەندییەکی ئەدەبی مۆدێرنیستی دادەنرێ کە پتر لە شیعر و تاڕادەیەکیش لە ڕۆمان و زۆر بەدەگمەنیش لە چەند نموونەی شانۆنامەی مۆدێرنیستیدا بیندراوە. پارچە پارچەیی ئەو تەکنیکەیە کە یان لە پاشخانی فیکری پاڵپشتی بەرهەمدا هەیە یان لە شێوە و فۆرمی بەرهەمدا دەرئەکەوێ. ئەگەر هونەری پارچە پارچەیی چ لە بەرهەمەکانی سەردەمانی بەر لە سەرهەڵدانی بزووتنەوەی مۆدێرنیزم یاخود لە چەند بەرهەمێکی ئەدەبی مۆدێرنیستیدا بەشێوەیەکی ناهۆشیارانە و بەبێ ئەوەی بەلای دانەری بەرهەمەوە گرنگ و مەبەست بێ ئەوە بەتایبەتمەندییەکی سەلبی و خراپی ئەو بەرهەمە دادەنرێ؛ بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی هۆشیارانە ڕەچاو بکرێ – بەو چەشنەی لە هەندێ بەرهەمی مۆدێرنیستیدا دەبیندرێ – ئەوە تەعبیر لە چەشنی تایبەتی جیهانبینیی دانەری بەرهەم دەکات کە بەو پێیە نووسەری مۆدێرنیست بەبەکارهێنانی هونەری پارچە پارچەیی بەئەنقەست ئەیەوێ پارچە پارچەیی و ئاڵۆزی ژیانی ڕۆژانە و یاخود شێواو تەنانەت ناکارامەیی ئاوەزی مرۆیی لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کێشەکانی جیهانی مۆدێرندا پێشان بدات.

پارچە پارچەیی بریتییە لەو هونەرە ئەدەبییەی کە پارچەگەلی جیاواز و پتر لە ناهاوچەشنی ئامادە لە زەینیەتی کەسێتییەکاندا هاوکات و لە شوێنێکی تایبەتی بەرهەمەکەدا لە پاڵ یەک دادەنرێن؛ ئەم پارچە جیاجیا زەینیانە کە هەمان بیرۆکە فیکری و یاخود ڕووداوە ئاسایی و نائاساییەکانی ئامادەی زەینی ئەو کەسێتییەن دەلالەت دەکەنە سەر زەینیەتی ئاڵۆز و پارچە پارچەی کەسێتی ناوبراو کە لە ڕواڵەتی چەند دەستەواژە و



ڕستە یان یەکەگەلی جیاوازی ماناییدا لە بەرهەمەکەدا دەرئەکەون. کەواتە شێوە و فۆرمی پارچە پارچەی ئەدەبی مۆدێرنیستی، تەعبیر لە مەعریفەی دانەری ئەو بەرهەمە دەکات کە دەیەوێ لێکپچڕان و پارچە پارچەبوونی زەینیەتی مرۆیی، بەتایبەت مرۆڤی چەقیو لەناو لایەنەکانی ژیانی مۆدێرندا، بنوێنێتەوە. هۆیەکی دیکەی بەکارهێنانی ئەم هونەرە پێشاندانی کاریگەرێتییە سەلبییەکانی جیهانی مۆدێرنە لەسەر مرۆڤی سەردەمی مۆدێرن کە لە خۆنامۆیی و دوورکەوتنەوە لە پاڵپشتێکی ڕۆحی و یاخود دۆڕاندنی پاراستنی خود بەچەند نموونەی سەرەکی ئەو ئاکامە سەلبیانە دادەنرێن.

ئەو بەرهەمانەی هەڵگری هونەرگەلێکی لە چەشنی پارچە پارچەیین هەڵگری توانایەکی بەزەبرن کە ئەبێتە هۆی ژیانەوە و بەگەڕخستنی زەینی خوێنەر. واتە ئەم بەرهەمانە ئەو تێڕوانین و گومانانەی کە خوێنەر پێش دەستپێکردنی خوێندنەوە هەیەتی و یان ئەو هەڵسەنگاندن و نرخاندنەی کە پێش سەرگرتنی ڕەوتی چالاکی خوێندنەوە لەلایەن خوێنەرەوە بۆ چەمک و دیاردە جیاجیاکان دادەبەزێنێ بەتەواوی لەناو ئەبەن و جۆرێکی دیکەی نرخ هەڵسەنگاندن و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کێشەکانی خود و دەوروبەر ئاراستەی خوێنەر ئەکەن. دیارە، خوێنەر لە ڕەوتی خوێندنەوەی ئەم بەرهەمانەدا بەتاڵاییەکانی ئامادە لە فۆرم و شێوەی ئەو بەرهەمانەدا دەستنیشان و پڕ دەکاتەوە و بەم چەشنە گوڕ و تینێکی تایبەت ئەبەخشێتە خەیاڵی خۆی.

### پارۆدی؛ گاڵتە بەرهەم — parody

پارۆدی جۆرە بێرلێسکێکی بەرزە کە شێوە ڕوانینی جیددی و لایەنە جیاکەرەوەکانی بەرهەمێکی ئەدەبی تایبەت یان شێوازی بەرچاوی نووسەرێکی تایبەت یان تایبەتمەندییە شێوازناسانە گشتییەکانی چەشنێکی ئەدەبی جیددی (بەتەنز و تیزەوە) لاسایی ئەکاتەوە و ئەم لاساییکارییەش بۆ بابەتێکی کۆمیک و تاڕادەیەک بێ بایەخ دادەبەزێنێ. نموونەی بەرچاوی پارۆدی لە ئەدەبی ئینگلیزیدا ڕۆمانی جۆزێف ئەندرووز[1] نووسینی هێنری فیلدینگ[2]–ە کە بەپارۆڕی ڕۆمانی پامێلا[3] بەرهەمی ساموێل ڕیچاردسۆن[4] دادەنرێ.

1- Josopn Andrews.

2- Henry Fielding (1707-1754).

3- Pamela.

4- Samnel Richardson (1689-1761).

**پاساوهەڵگری** **justifiablity**

**پاستیش؛ گاڵتە بەرهەمی سووک** **pastiche**

پاستیش سەرجەم تایبەتمەندییەکانی پارۆدی ئەگرێتەخۆ جگە لەوەی لە پارۆدیدا بایەخی ئەدەبی و هونەری بەرهەم لەو بەرهەمەی کە لاسایی کراوەتەوە زۆرترە، کەچی پاستیش لە رووی ئەدەبی و هونەرییەوە لەو بەرهەمەی لاسایی دەکاتەوە و یاخود بەچاوێکی تیزاویەوە تێی ئەڕوانێ کەمترە. هەر بۆیەش پارۆدی بەگاڵتە بەرهەم مانا دەکرێتەوە کە بۆ خۆی جۆرێک ئەدەبی بەبەهایە کەچی پاستیش بەگاڵتە بەرهەمی سووک ئەژمێردێ کە لە رووی ئەدەبی و هونەرییەوە هەڵگری هیچ چەشنە بەهایەک نییە. کەواتە لە خوێندنەوەی ئەدەب و مێژووی ئەدەبی و ڕەخنەی ئەدەبیدا لێکۆڵەر ڕووبەڕووی چەندین پارۆدی سەرنجڕاکێش ئەبێتەوە کە پێویستە وەکو ئەدەبی پلەی یەکەم سەیریان بکا، کەچی ئاوڕێکی زۆر لە پاستیش نادرێتەوە و تەنانەت ئەو بەرهەمانەش کە بەپاستیش یان گاڵتە بەرهەمی سووک ناسراون وەکو ئەدەبی پلەی یەکەم لە قەڵەم نادرێن و پشتگوێ ئەخرێن.

**پاش بنەماخوازی** **post - structuralism**

پاش بنەماخوازی ئەو ڕوانگە ڕەخنەیی و ڕەخنەگرانە جیاجیایانەیە کە لە کۆتایی شەستەکان بەملاوە جێگەی بنەماخوازی گرتووەتەوە و وەکو ڕێڕەوێکی تازە و ڕادیکال زمان و سیستەمە نیشانەییەکانی دیکە دەخاتە بەر خوێندنەوەی نوێ. ئەگەر بنەماخوازی ڕوانگەی زاڵی لێکۆڵینەوە زمانناسانە و ئەدەبی و کولتوریەکانی پەنجاکان و شەستەکان بوو، پاش بنەماخوازی کە لە زۆر ڕووەوە ڕەخنەی توند ئاراستەی بنەماخوازی ئەکات توانیویەتی لەم ماوەیەدا کاریگەرێتی لەسەر چەند بوارێکی دیکەی زانستی وەک نیشانەناسی و دەروونناسی و دەروونشیکاری و ڕەخنە و تیۆری ئەدەبی و تەنانەت هەندێ بزووتنەوەی دیکەی وەک فێمینیزم و بزاڤی ڕزگاریخوازانەی ڕەش پێستەکان و تەنانەت سیاسەت دابنێ.

بیری پاش بنەماخوازانە بەگشتی لە لێدوانێکی ژاک دێریداوە بەناونیشانی (بنەما، نیشانە و کایە لە گوتاری زانستە مرۆییەکاندا) - دەست پێ دەکات کە لە کۆڕێکی نێونەتەوەیی زانکۆی جان هاپکینزی ئەمریکادا ئاراستەی کرد تیایدا بەشێوەیەکی ڕادیکاڵ و ڕەخنەگرانە بەپێی سیستەمی فەلسەفەی تایبەتی خۆی ڕوانگە بنەماخوازانەکانی کلۆدلیڤی شترۆس هەڵدەوەشێنێتەوە. هەڵبەت بەبڕوای چەند نووسەر و



ڕەخنەگرێک پاش بنەماخوازی بەبڵاوبوونەوەی کتێبی S/Z (١٩٧٠) نووسینی ڕۆلان بارت دەست پێ دەکات... دێریدا هێرش دەباتە سەر ئەو بانگەشە شێوە زانستیانەی بنەماخوازی - کە پتر لە شێوە ڕوانینی سوسوور بۆ بنەمای زمان و هەروەهاش بیری مرۆڤناسانەی کولتووری شترۆس سەری هەڵدابوو - کە بەو پێیە دێریدا ئەیەوێ تیشک بخاتە سەر ئەو بیرۆکەیەی کە بنەمای سیستەماتیک چ زمانناسانە بێت یاخود هیتر خۆی لە خۆیدا (چەق)ێک دێنێتە گۆڕێ کە ئەو چەقە ئەبێتە هۆی ڕێکخستن و یاسامەندکردنی ئەو بنەمایە کەچی هەر هەمان چەق بۆ خۆی لە (بنەمامەندێتی هەڵدێ). هەروەک لە نووسینەکانی دیکەی دێریدادا دەرکەوتووە بیرۆکەی ناواقیعی و یەک نەگرتووی چەقێکی بەردەوام چالاک و بەڵام نائامادە یەکێک لەو ڕێگایانە پێکدێنێ کە تیایدا گوتە تەوەری ڕۆژئاوایی بۆ خۆی بنیاتێکی ناوەندی و بنەڕەت یان جەوهەرێکی ڕەها دەستەبەر ئەکات کە بەردەوام هەست بەپێویستبوونی دەکرێ و کەچی قەت ئامادە نییە. دێریدا بەسەرنجدانی چەمکی جیاوازی لە زمانناسی سوسووردا ئەو ڕوانینەی سوسووری بەلاوە پەسندە کە مانا بەرهەمی پەیوەندییە جیاوازەکانی دالەکانە بەڵام بەشێوەیەک لە سوسوور تێدەپەڕێ و بەبەربڵاوتر کردنەوەی ڕەهەندی (ناوکاتی)ی زمان پەنجە دەخاتە سەر ئەو خاڵە کە زمان زنجیرەیەکی بێ کۆتایی لە وشە و پاشانیش لە داکان کە تیایدا هیچ سەرچاوە و بنەڕەتێک لە ئارادا نییە.

چەند بیرمەندێکی هاوچەرخی دیکەش وەک میشێل فۆکۆ و ژاک لاکان و ژولیا کریستاڤا، هەڵبەت بەشێوەگەلی جیاجیا چەند بانگەشەیەکی سووننەتیان بۆ ئامادەبوونی بنیاتە جەوهەرییەکان تووشی چەقسرینەوە کردووە. ئەو بنیاتانە، بەبڕوای ئەوان وەکو پاڵپشتێک تەعبیر لە بەڵگەدارێتی زانیاری و هەقیقەت ئەکەن و، هەر ئەم دژە بنیاتخوازیەش کە هاوکات گومانی ئاراستەی چەمک و بیرۆکە سووننەتییەکانی مانا و واتا و زانیاری کردوەتەوە لە زۆربەی ڕێباز و شێوازەکانی لێکۆڵینەوە ئەدەبیە باوەکانی وەک ڕەخنەی مارکسیستی و ڕەخنەی فێمنیستی و ڕەخنەی مێژوویی‌خوازیی نوێ و ڕەخنەی هەڵوێستی خوێنەردا ڕەنگی داوەتەوە. ئەکرێ بوترێ لە بیری پاش بنەماخوازانەدا مانا بەتەواوی لە زمان وەکو بوونەوەرێکی سەربەخۆ جیایە. زمان هەڵگری مانا نییە بەڵکو تەنیا ئەیگوازێتەوە هەر بۆیەش ئەو چەمکانەی ناو کەلام و فەلسەفەی ڕۆژئاوا کە دەوری بنیات ئەگێڕن بەمەدلوولی بەرزایی ناویان دەبات، هەندێکیان بریتین لە ئاوەز، خێر، بوون، چەق، خوا و هتد... لەلایەکی ترەوە ئەم مەدلوولە بەرزاییانە لەگەڵ دژەکانی

خۆیاندا واتە هەست، شەڕ، نەبوون، پەراوێز و شەیتاندا دوانە لێکدژەکانی نێو فەلسەفەی ڕۆژئاوایی پێکدێن کە بەردەوام لەو فەلسەفەیەدا یەکێکیان بەگرنگ و چاک و ناوەند داندراوە و ئەوی دیکە بەخراپ و پەراوێز. هەڵگەڕانەوەی تەوەرەی پێکهاتوو لە دوانە لێکدژەکان بەهەڵوەشانەوە ناسراوە. گەرچی بەبڕوای زۆر نووسەر و بیرمەند هەردوو زاراوەی پاش بنەماخوازی و هەڵوەشانەوە لە بنەڕەتدا یەکێکن و لە زۆر نووسیندا لەبری یەکتر دێنە بەکارهێنان، بەڵام بەبڕوای ئێمە هەرچەندە هەڵوەشانەوە یەکەمین و سەرەکیترین تیۆری پاش بنەماخوازی پێکدێنێ، بەڵام پاش بنەماخوازی وەکو زاراوەیەکی گشتگیر بەکار ئەبەین کە جگە لە هەڵوەشانەوەش چەند تیۆرێکی دیکەی وەک (مەرگی دانەر)ی ڕۆلان بارت و (دانەر چییە؟)ی میشێل فۆکۆ و تیۆرەکانی کریستاڤا و ژیل دلوز و پۆل دوومەن و هتد... ئەگرێتەوە. بیرمەندان و فەلسەفەکارانی پاش بنەماخواز و زۆر ڕوانگەی جیاوازیان لە هەمبەر پرسە جیاجیاکاندا ئاراستە کردووە، بەڵام ئەکرێ خاڵە هاوبەشەکان و لایەنە وێکچووەکانی زۆربەیان لەم تایبەتمەندییانەی خوارەوەدا کورت و کۆ بکرێتەوە.

١- گرنگایەتی و سەرەتی تیۆر: هەرچەندە هەر لە ئەفلاتوون و ئەرەستووەوە هەندێ گوتار سەبارەت بەشیعر و ئەدەب بووەتە هۆی سەرهەڵدانی تیۆر و ئەم تیۆرەش بەپێی مانا و کاربردە سوننەتیەکەی بریتییە لە کۆی وتەزا و بنەواشە و خاڵە بەرچاوەکان بەمەبەستی ناساندن، پۆلێنکاری، شیکردنەوە یان هەڵسەنگاندنی بەرهەمە ئەدەبییەکان. بەڵام لە بیر و ڕەخنەی پاش بنەماخوازانەدا تیۆر وەکو پرس و بابەتی زاڵ و ناوەندی بەرجەستە ئەکرێتەوە کە هەر ڕەخنەگرە و دەشێت پێگە و کردەوەکانی خۆی تیۆریزە بکاتەوە. لە پاڵ ئەمەشدا لێرەدا تیۆر تەنیا بۆ ئەدەب سنووردار ناکرێتەوە و سیستەمە نیشانەییە کولتووری و کۆمەڵایەتی و جینسی و دەروونییەکانیش ئەگرێتەوە و، کەواتە، ڕەخنەی ئەدەبی لە بیری پاش بنەماخوازانەدا تا ڕادەیەکی زۆر تێکەڵی ئەو بوارانە ئەبێت کە بەشێوەیەکی سوننەتی بەزانستە مرۆییەکان ناوبردە کراون و لە ئاکامدا ڕەخنەی ئەدەبی لە ویژدانی مرۆڤایەتی و زەینیەتی مرۆیی و هەروەها سەرجەم شێوەگەلی دیاردە کولتووری و کۆمەڵایەتییەکان جیا ناکرێتەوە. لایەنێکی دیکەی تیۆرە پاش بنەماخوازانەکان ئەوەیە کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ دژی شێوەگەلی دامەزراوە و پێوەری بیرکردنەوەن لە سەرجەم ئاقارەکانی زانیاری و سیستەمی بایەخەکاندا. واتە ئەم تیۆرانە ئەو چەمک و واتا و دەرەنجامانە دادەبەزێنن و تووشی شڵەژان و بگۆڕییان دەکەن کە، بەبڕوای ئەوان، بنیات و جەوهەری ئوسلووبە سوننەتییەکانی گوتارە جیاجیاکانیان لە شارستانێتی ڕۆژئاوادا پێکهێناوە کە



دیارە توێژینەوەی کولتووری و ڕەخنەی ئەدەبی بەشێکە لەو ژیار و شارستانێتییە. لە ئاکامدا، ئەم شێوە ڕوانینە بەباس و خواسە و ئەم هەڵوێستە مشتومڕ هەڵگرەی پاش بنەماخوازی ئەبێتە هۆی سەرهەڵدانی خوێندنەوەیەکی دیکەی دامەزراوە سەقامگرتووەکان و ڕوانگەیەکی دیکە بۆ دەسەڵاتی سیاسی و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکان.

٢- چەقسڕینەوەی سووژە: یەکێ لەو ڕەهەندە دژکارانەی ڕەخنەگرانی پاش بنەماخواز بریتییە لەو ڕەخنە توندەی ئاراستەی (مرۆڤخوازی) دەکەنەوە. ئەمەش ئەو ڕوانگە سوننەتیەیە کە بەو پێیە دانەر - یان بەشێوەیەکی گشتی سووژەی مرۆیی - بەخاوەنی شوناسێکی یەکگرتوو کیانێکی سەربەخۆ دادەنێ کە بەچالاکی و مەبەستمەندییەوە شێوە و مانای بەرهەمێکی نووسراوە یان ئەدەبی ئەخاتە بەر گەلاڵەی زەینی و مەبەستی خۆیەوە. (لێرەدا وەبیر شێوەڕوانینی دیکارت بۆ مرۆڤ و زەینیەتی مرۆیی ئەکەوینەوە). لە ڕوانگەی ڕەخنەگرانی بنەماشکێنەوە، بەڵام، سووژە یان دانەر یان گێڕەوەی دەق بۆ خۆی ئەبێتە بەرهەمێکی سەرانسەر و زمانناسانە و ئەوان بەوەرگرتنی کاریگەری لە دەروونشیکاریی هاوچەرخەوە کیانی سەربەخۆی ئەو سووژەیەی مرۆڤخوازی پێناسەی دەکرد هەڵدەوەشێنێتەوە. بەواتایەکی تر، لە ڕەخنەکەی میشێل فۆکۆ و ڕۆلان بارتدا لەسەر پێناسەی دانەر لە مرۆڤخوازی ئەورووپیدا جگە لە گرنگیدان بەو پێوەندییەی نێوان تاکەکەس و زنجیرەی ڕووداوەکان، پتر کاربرد و دەورە سەرەکیەکەی دانەر لە بیری ڕۆژئاواییدا ئەخەنە بەر ڕەخنەکە بەو پێیە دانەر بەسووژەیەکی مەبەستدار و خاوەن سەرچاوەی سەرجەم زانیارییەکان دادەنرا کە بەدابینکەری فۆرم و ماناکانی دەقەکەی خۆشی لە قەڵەم دەدرا. بەواتایەکی ڕوونتر، لە نەریتی مرۆڤخوازانەی ڕۆژئاواییدا دانەر وەکو چەق یان ڕێکخەری ئەو بابەتانە ئەزانرا کە لە ڕەخنەی ئەدەبی سوونەتی و تەنانەت مێژووی ئەدەبییشدا باسیان ئەکرا. ئەم هەڵوێستە دژەی پاش بنەماخوازەکان لە بەرامبەر مرۆڤخوازی ئەورووپیدا بووەتە هۆی چەقسڕینەوەی سووژە. جگە لەمەش لە ڕەخنەی مارکسیستی و دەروونشیکارانە و مێژوویی خوازانەی نوێدا ڕەخنەیەکی وێکچوو ئاراستەی ئەم بیرە کراوەتەوە کە تیایدا دەوری دانەر وەکو سووژەیەکی دابینکەر و مەبەستمەند و یەکگرتوو پشتگوێ ئەخرێ. لێرەدا مرۆڤ وەکو خودێکی یەک نەگرتوو دادەنرێ کە بەندە بەمیکانیزمە کۆنترۆڵ نەکراوەکانی ناچاریە جیاجیا ناهۆشیارەکانەوە. کەواتە ئیدی مرۆڤ بەهۆی ئەوە و بێ ئەوەی بزانێ کە شێوە باوەکانی ئایدیۆلۆژیا ئەگوازێتەوە یان لەبەرئەوەی کە زۆرتر وەکو کۆی بینا کولتووریەکان دادەنرێ و لە ئاکامدا

لەبەرئەوەی کە مرۆڤ پێکهاتەیەکی گوتارییە کە بنەماکانی دەسەڵات لە سەردەمێکی دیاریکراودا بەرهەمی هێناوە چیدی وەکو سووژەیەکی یەکدەست و سەربەخۆ و یەککگرتوو سەیر ناکرێ.

٣- خوێندنەوە، دەقەکان و نڤیسار: چەقسڕینەوە و وەپشتگوێ خستنی دانەر ئەبێتە هۆی ئەوەی کە خوێنەر یان ڕاڤەکار ببێتە وتەزایەکی گرنگ لەو هەڵسەنگاندنە پاش بنەماخوازانەیانەی کە لەسەر کردەوە نیشانەییەکان ئەنجام دەدرێت. لێرەشدا ڕێوڕاست خوێنەر وەکو دانەر لەو تایبەتمەندییە مرۆییانەی کە بەشێوەیەکی نەریتی خراوەتە پاڵی جیا ئەکرێتەوە. ئەوەی خوێنەر ئەیخوێنێتەوە چیدی چەمکی نەریتی بەرهەم نییە کە هەڵگری تایبەتمەندییەکان مەبەستی دانەری بەرهەمە، بەڵکو ڕەوتی خوێندنەوە لەسەر دەق ئەنجام ئەدرێ کە بریتییە لە بنەمای دالەکان. لەپاش بنەماخوازیدا بەگشتی و لە هەڵوەشانەوەدا بەتایبەتی دەقەکان تاکایەتی خۆیان ئەدۆڕێنن و پتر وەکو دەرکەوتەیەک لە نڤیسار ئەژمێردرێن. نڤیسار لێرەدا ئەو دەقێتیە گشتییە کە تیایدا سنوورە دەستکردەکانی نێوان جۆرە جیاجیاکانی دەقە ئەدەبی و مێژوویی و یاساییەکان لەناو ئەچێ. بەکورتی و بەگوێرەی ڕوانگەی پاش بنەماخوازانە هیچ دەقێک ناتوانێ ئەوەی وا دیارە ئەیلێ بیلێ. بیرۆکەگەلی ڕەخنەگرانی قوتابخانەی کۆنستانس و ڕەخنەی هەڵوێستی خوێنەر کاریگەرێتی زۆریان لەسەر ئەم لایەنەی بیری پاش بنەماخوازانە داناوە.

٤- گوتار: گوتار بەشێوەیەکی نەریتی ئەو بەشانەی بەرهەمە ئەدەبییەکان ئەگرێتەوە کە تیایاندا وتووێژی نێوان کەسێتییەکان ئامادەیە. جگە لە لەم پێناسە کۆن و نەریتییە، لە حەفتاکاندا و بەهۆی کاریگەرێتی ڕەخنەی وتووێژ تەوەری میخاییل باختین زاراوەی (شیکاریی گوتار) هاتە ئاراوە کە لە زمانناسیدا بەشێوەی شیکاریی گوتەش بەکار ئەبرێ و پێ لەسەر ئەو گوتارە ئەدەبییە یان گوتە کۆمەڵایەتییە دادەگرێ کە لەلایەن کەسێتییە مرۆییەکانەوە بەڕێوە ئەبرێ و دەنگەکانیان بەتەواوی لەو گۆڕینەوە بزۆز و بگۆڕەدا بەشدارن کە لەسەر بیروبڕواکان و ڕوانگەکان و هەستەکان و دەربڕینەکانی دیکەی باری زەینیەت ئەنجام ئەدرێ. لە ڕەخنەی پاش بنەماخوازانەدا گوتار ئەو زاراوە زاڵ و گشتگیرەیە کە هەندێ جار دەق کامڵ دەکا و هەندێ جاریش لەجیاتی دەق بەکار ئەبرێ. لێرەدا دەق ئەو کەرەسە زمانییەیە کە سەرەکیترین کەڵکەڵە و سەرنجی ڕەخنەی ئەدەبی پێکدێنن. هەروەک زاراوەی نڤیسار، لێرەشدا گوتار هەر تەنیا ئەو وتووێژانەی نێو بەرهەمی ئەدەبی و یاخود کۆمەڵگا ناگرێتەوە بەڵکو پتر تەعبیر لە ڕواڵەتی بوونی سنوورەکانی نێوان ئوسلووبە



ئەدەبی و نائەدەبییەکانی دەلالەت ئەکات. لەناو بیرمەندانی پاش بنەماخوازدا میشێل فۆکۆ و ڕەخنەگرانی مارکسیستی وەکو لویی ئالتووسێر پتر لەوانی دیکە ئاوڕ لە گوتار ئەدەنەوە.

**پاش دەق** — **hypertext**

**پاش دەقێتی؛ فرەدەقێتی** — **hyper - textuality**

**پاش شیکارانە** — **postanalytical**

**پاش شێوەخوازی؛ پۆست فۆرمالیزم** — **post formalism**

زاراوەی پۆست فۆرمالیزم یان (پاش شێوەخوازی) ڕۆنراوی ژولیا کریستاڤایە و، بەپێی باوەڕی ئەم دەروونناس و نیشانەناسە بەڕەگەز بولگاری و دانیشتووی فەرەنسایە، تەعبیر لەو سیستەمە مەعریفی و چوارچێوە تیۆریک و پێگە ڕەخنەییە ئەکا کە میخاییل باختین لە سەرجەمی ژیانیدا هەوڵی پتەوترکردنەوە و پەرەپێدانی دەدا. ڕەهەندە فیکری و ڕوانگە ڕەخنەییەکانی تیۆری ئەدەبی پاش شێوەخوازانەی میخاییل باختین بەگشتی لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورت و کۆ ئەکرێنەوە:

١- ڕوانگەی ڕەخنەگرانە بۆ قوتابخانەی شێوەخوازی یان فۆرمالیزم:

گرنگترین جیاوازیی نێوان باختین و نەریتی فۆرمالیستی لەوەدایە کە باختین، بەپێچەوانەی ڕەوتی ڕەخنەکاریی شێوەخوازانە، ئاوڕێکی جیددی لە پێوەندی نێوان دەق و دەقساز ئەداتەوە. کەچی فۆرمالیستەکان هەر تەنیا بنەمای بیردۆزانە و تەندراوەی سەربەخۆیی دەقیان بەلاوە بایەخدارە و ئەمەش تا ئەو ڕادەیەی کە لەو نەریتەدا لەبری (بەرهەم) پتر لە (دەق) کەڵک وەردەگیرێ. باختین، بەڵام، پێی وایە دەقی بێ دەقساز یان بەرهەمی بێ دانەر لە ئارادا نییە و کەڵکەڵەی زۆر و پێ داگری فۆرمالیستەکان لەسەر چوارچێوە و بنەما و شێوەی دەق و هەروەها جیاکردنەوەی دەق لە بەرهەمهێنی دەق و وەپشتگوێ خستنی بەستێنی ئامادە لە داهێنانی دەقدا سەر و مڕ پێکەوە بووەتە هۆی ئەوەی کە فۆرمالیزم خاوەن چەندین کەموکوڕی بەرچاوبێ. بەبڕوای کریستاڤا، ئەگەرچی لە زۆر لایەنی جیاجیاوە ڕەخنە لەم تایبەتمەندییەی فۆرمالیزم گیراوە. بەڵام ئەوانەی پۆست فۆرمالیزم کە لە بیروبۆچوونەکانی باختین و ڤۆلۆشینۆڤ[1] و مێدڤێدۆڤ[2]دا دەرکەوتوون

1- Voloshinov.

2- Medvedev.

لەوانی تر گرنگتر و کاریگەرتر بوون. بەکورتی، پاش شێوەخوازی لە دوو خاڵدا لە شێوەخوازی جیا ئەبێتەوە کە بریتین لە پۆلێنبەندیکردنەوەی سەرلەنوێی چەمکی زمان و هەوڵ و بۆ ترینجاندنی ئایدیۆلۆژیا لە واتای دەقدا.

٢- روانگەی رەخنەگرانە بۆ قوتابخانەی دەروونناسی (ی فرۆیدی):

باختین و ڤۆلۆشینۆڤ لە هەمبەر دەروونناسی فرۆیدیدا روانگەیەکی رەخنەگرانە بۆ خۆیان دەستەبەر ئەکەن و خاڵە لاوازەکانی ئەم بۆچوونە رەخنەییە دەخەنە روو. بەباوەڕی ئەوان، بۆچوونی دەروونناسانە بۆ خوێندنەوەی بەرهەم تەنیا گرنگی دەداتە زەینییەتی تاکەکەسی دانەری بەرهەم و، هەر بۆیەش نکۆڵی لە هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی خوڵقاندنی بەرهەم ئەکات و، هەروەک ئەڵێن: «فرۆید توانای ئەوەی نییە لە جەوهەری کۆمەڵناسانەی سەرجەم ئەم دیاردانە تێ بگات و هەوڵ دەدا ئەم هۆکارە کۆمەڵناسانەگەلە بخاتە نێو ئاقاری سنووردار و بەرتەسکی ئۆرگانیزمی تاکەکەسی و دەروونییەوە. فرۆید ڕەوتە بەبنەڕەت کۆمەڵایەتییەکان لە روانگەی دەروونناسیی تاکەکەسیەوە لێک دەداتەوە». کەواتە، بەپێی ئەم بۆچوونەی باختین و ڤۆلۆشینۆڤ بۆچوونی دەروونناسانە بەناتەواو و رووکەش لە قەڵەم دەدرێ.

٣- شیکاریی توێکارانەی لایەنی کۆمەڵناسانەی زمان:

باختین بەردەوام جەخت لەسەر تیۆریزەکردنی چەمکی زمان ئەکاتەوە و لەم پێناوەشدا شیکاریەکی توێکارانە و وردەکارانە دەربارەی لایەنی کۆمەڵناسانەی زمان ئەدات بەدەستەوە و دەیەوێ لایەنی کۆمەڵایەتی زمان بەزەقی بەرجەستە بکاتەوە. لە بەشگەلی سێیەم و چوارەمی وتاری گرنگی (گوتار لە ژیان و شیعردا: پێشەکیەک لەسەر بوتیقای کۆمەڵناسانە» باختین ئەو خاڵە دەردەبڕێ و دەیسەلمێنێ کە زمان ئەوە نییە تاقمێ زماننانسی رۆژئاوای ئەوروپا و تەنانەت چەند زمانناسێکی رووسیش بانگەشەی بۆ ئەکەن. لێرەدا باختین خاڵە لاوازەکانی ئەو بۆچوونە دەردەخا و، بەپێچەوانەی ئەو روانگەیە، بڕوای بەسێ جۆر بەشداربوون لە گوزارە گوتەییەکاندا هەیە کە بریتین لە بێژەر، بیسەر و وەرگرێکی سێهەم کە بەردەوام ئامادەبوونەکەی وەکو پێش گریمانەیەک دادەنرێ.

٤- ئاراستەکردنی تیۆرێک دەربارەی سەرهەڵدانی رۆمان:

لەوانەیە گرنگترین و فرەپاتترین واتای سەرەکی نێو تیۆری ئەدەبی پاش شێوەخوازانەی میخاییل باختین (رۆمان) بێ. روانگەی باختین لەم بارەیەوە واتە لەسەر چۆنیەتی



سەرهەڵدانی رۆمان تارادەیەک زۆر لەو بیروبۆچوونانەی کە پێشتر لەم بارەیەوە لەئارادابوون جیاوازە، پێشتر ریالیزم و گەورەبوونەوەی شارەکان و سەرهەڵدانی چینی ناڤینی کۆمەڵگا بەهۆکارە سەرەکییەکانی سەرهەڵدانی رۆمان لە قەڵەم ئەدرا (بۆ نموونە، بڕوانە بۆ سەرهەڵدانی رۆمان نووسینی یان وات). لەلایەکی دیکەوە، باختین بەشێوەیەکی دیکە لە بابەتەکە ئەکۆڵێتەوە و بەئەنجامێکی تر ئەگات. لە وتاری (قۆناغە سەرەتاییەکانی گوتاری رۆمانخوازانە)دا توێژینەوەیەکی شێوازناسانە لە رۆمان ئاراستە ئەکات و تیایدا دێرینە ناسی و رەچەڵەکناسی ئەم چەشنە ئەدەبیە بەشێوەیەکی نوێ ئەخاتە روو – بەبڕوای باختین رۆمان لە سەردەمی مۆدێرندا هەر ئەو دەورە ئەگێڕێ کە کارناڤێل لە چەرخەکانی ناوەڕاست و کۆمیدیای فارس لە سەردەمی رۆنێسانسدا ئەیانبینی. واتە، کارناڤێڵ رەخنە لە دەسەڵاتی رەهای پاپ و ئایینزای کاتولیک ئەگرێ بەکۆمیدیای فارس یان کۆمیدیای هەڵبەزدابەز رەخنە لە دەسەڵاتی تاک جەمسەریی پاشاکانی سەر بەئایینزای پرۆتێستان ئەگرێ و رۆمانیش رەخنە لەو ئۆمانیزم و مرۆڤ تەوەریە ئەگرێ کە بەو پێیە مرۆڤ ناوەندی جیهانە و خاوەن ئەقڵ و ئاوەزی تەواوە کە ئەتوانێ کێشەکانی خۆی و بەرەی داهاتووی خۆی چارەسەر بکا. هەر بۆیەش یەکەم ژانری رۆمان کە سەری هەڵدا رۆمانی عەییاری بوو (وەک دۆن کیشۆت و تام جونز) کە بەشێوەیەکی تەوساوی و گاڵتەئامێز رەخنەی لە مرۆڤی خاوەن ئەقڵ ئەگرت.

٥- چەشنناسیی رۆمان و بنیاتنانی بوتیقایەکی تایبەت بۆ رۆمان.

هەوڵی باختین و تیۆری ئەدەبی پاش شێوەخوازانە بۆ بنیاتنانی بووتیقایەکی تایبەت بۆ رۆمان ئەو روانگە بەناوبانگانەی باختین دێنێتەوە یاد کە سەبارەت بەرۆمان بەگشتی و رۆمانی داستایۆڤسکی بەتایبەتی ئاراستەی کردووە (بڕوانە بۆ کتێبی پرسەکان و گرفتەکانی بوتیقای داستایوڤسکی). ئەو پێی وایە دوو جۆر رۆمانی تاکدەنگیانە و چەند دەنگیانە لە ئارادان و رۆمانی چەند دەنگیانە لە نەریتی کارناڤێلی چەرخەکانی ناوەڕاست و کۆمیدیای هەڵبەزدابەزی رۆنیسانس و رۆمانی عەییاری سەرەتای سەردەمی مۆدێرن پەیڕەوی ئەکات و تیایدا هیچ دەنگێک، تەنانەت دەنگی نووسەرەکەش، زاڵ نابێ و بەرجەستە نابێتەوە. لەلایەکی ترەوە، لە رۆمانی تاکدەنگیانەدا هەر تەنیا دەنگی نووسەر یان کەسایەتییەکی تایبەتی رۆمانەکەیە کە بەسەر دەنگەکانی تردا زاڵ دەبێ و دایان دەپۆشێ. بەبڕوای باختین داستایۆڤسکی ئەو نووسەرەیە کە رۆمانی چەند دەنگیانە بەرهەم ئەهێنێ (وەک رۆمانی برایانی کارامازۆڤ).

**پاشکۆ (١)** — **addendum**

**پاشکۆ ◄── ئەنجام (٢)**

**پاشنووس ◄── پەراوێز (١)**

**پاش واقیع؛ فرە واقیع** — **hyper - reality**

**پاکئایین خوازی** — **puritanism**

پاکئایین خوازی ڕێبازێکی ئایینزای پرۆتێستانتیزمە کە لە ناوەڕاستی سەدەی شانزدەهەمدا و بەتایبەت لە ئینگلتەرا کەوتە گەڕ و لایەنگرانی ئەم ڕێبازە ئایینیە، هەروەک بەناوەکەیدا دیارە، بەدوای (پاکی) و ڕەسەنایەتی ئایینیدا دەگەڕێن و، هەر بۆیەش زۆربەی هەرە زۆری ئەو یاسا و ڕێسا ئایینیانەی ئایینزای کاتولیک کە تیایدا بەردەوام باسی کەسایەتی و چەمکە پەراوێزییەکانی مەسیحیەت دەکرێ پشتگوێ ئەخەن و بایەخێکی تایبەت ئەدەنە ویژدانی تاکەکەسی مرۆڤ و پاکی و ڕەسەنایەتی ئایینی. زۆربەی پاکئایین خوازەکان و ڕەخنەیەکی توندیان ئاراستەی ئەدەبی ڕۆنێسانس و سەرەتای سەردەمی مۆدێرن کردووە و لە بەرزترین پلەدا ئەو باسە دەهێنێتە گۆڕێ کە ئەدەب شتێکی زەوینیە و هەڵگری توخم و ڕەهەندی ماتریالیستیە و کەواتە دەبێ دەرەوبڕ بکرێ. نووسەران یان ڕەخنەگرانی ئایینخوازی نەرمڕۆ پتر گرنگی دەدەنە ئەو ئەدەبەی بانگەشە بۆ بابەتە ئەخلاقییەکان ئەکات. پێویستە بوترێ یەکەم تاقم و گرووپی کۆچبەرانی ئەوروپی کە لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا ئەوروپایان بەهۆی ماتریالیزمی تازە سەرهەڵداو و سەرکوتکاریی ئایینییەوە بەجێهێشت و ڕوویان کردە ئەمریکا لەو پاکئایینخوازانە پێکهاتبوون کە خاوەنی بیروبڕوایەکی قورسی ئایینی بوون و، کەواتە ئەدەبی ئەمریکی تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم و بەگشتی تا سەرەتای سەدەی بیستەم ئەدەبێکی ئەخلاقی و ئایینی و تا ڕادەیەک ڕۆمانتیکە کە تایبەتمەندییە ئەخلاقییەکانی تیادا بەرجەستە بووەتەوە (بڕوانە خەونی ئەمریکایی).

**پاکبوونەوە (ی دەروونی)** — **catharsis**

پاکبوونەوە زاراوەیەکە ئەرەستوو لە بەشی شەشەمی کتێبە بەناوبانگ و کاریگەرەکەیدا، بوتیقا[1]، بەکاری بردووە و لە پێناسەکردنی تراژێدیادا کەڵک لەم زاراوەیە وەردەگرێ. بەکارهێنانی ئەم زاراوەیە و پێناسەکردنی لەلایەن ئەرەستووەوە مشتومڕێکی زۆری لەنێو

1- Poetics.



نووسەران و ڕەخنەگراندا و بەتایبەت نەوەکانی کۆتایی چەرخەکانی ناوەڕاست و سەرەتای ڕۆنیسانس هەڵگیرساندووە، ئەرەستوو پێی وایە کارکردی تراژیدیا ئەوەیە کە چەشنە هەست و ترسێک (لە ئاکامدا) لەنێو بینەراندا بخولقێنێ کە ئەنجامەکەی ببێتە بەدیهاتنی (پاکبوونەوە)ی ئەو هەستانە لەناو مێشکی بینەراندا. ئەم چەمکە لەسەر دەستی چەندین نەوەی جیاجیای ڕەخنەگرانەوە سەرلەنوێ و بەشێوەگەلی جیاواز پێناسە کراوەتەوە. بۆ نموونە، جان میلتۆن[1] لە پێشەکی بەرهەمەکەیدا بەناونیشانی سامسۆن ئاگۆنیست[2] ئەڵێ: تراژێدی بەو شێوەیەی ئەرەستوو ئەڵێ هەڵگری ئەو هێز و وزەیەیە کە هەست و ترس و یاخود دڵەڕاوکێ و دڵەخورپێ هەڵئەگیرسێنێ و مێشک لەو هەستانە و یاخود لە چەند هەستێکی تری لەم جۆرە پاک و خاوێن ئەکاتەوە»، واتە تراژێدی ئەو هەستانە بەشێوەیەک کەم ئەکاتەوە و یان بەجۆرێک ڕواڵەتێکی نیانتریان پێ ئەبەخشێ کە لە ئەنجامدا و لە ڕێگەی خوێندنەوە یان بینینی ئەو هەستانەوە کە باش لاسایی کراونەتەوە خۆشیی ئەدا بەبینەر.

**پاڵەوان سڕینەوە** — **deheroisation**

**پاڵەوان فس فس** — **miles gloriosus**

**پاڵەوان؛ قارەمان** — **hero**

**پاڵەوانی تراژیک** — **tragic hero**

**پاڵەوانی، حەماسی (١)** — **heroic**

**پانتێئیزم؛ یەکبوونی بوون؛ یەکیەتی بوون** — **pantheism**

پانتێئیزم کە بە(وحدة الوجود ) ناوی لێ ئەبرێ بریتییە لەو ڕوانینەی کە بڕوای بەیەکبوونی (تێ) یان خواوەند لەگەڵ جیهاندا هەیە. ئەم ڕوانینە ئایینیە هاوکات بەشێوەی (گشت خوا خوازی) بەکار ئەبرێ کە تەعبیر لە یەکبوونی جەوهەری خواوەند و جەوهەری جیهان ئەکات. چەمکی پانتێئیزم پتر لە ئایین و ئایینزا جیاجیاکانی پێش و پاش مەسیحیەت و ئیسلام بەکارهێنراوە و تەنانەت لە سەردەمی مۆدێرنیشدا لەناو هەندێ قوتابخانەی ئەدەبی و فەلسەفی ڕۆژئاوادا ڕەنگی داوەتەوە و، بەگشتی ئەم چەمکە کەمتر لەو قوتابخانە ئەدەبی و فەلسەفیانەدا ناوی لێ ئەبری کە بانگەشە بۆ بیری ئەقڵانی

1- John Milton (1608-1674).

2- samson Agoniste.

و ئەقلانییەت ئەکەن. بەپێی ئەم بۆچوونە خواوەند لە هەموو شوێنێکی جیهاندا ئامادەبوونی هەیە و، بەگوێرەی هەندێ شاعیری ڕۆمانتیک خواوەند لە سروشتی دەرەکیدا ئامادەیە و، ئەرکی شاعیر ئەوەیە کە بچێتە ناو سروشتەوە و، سروشت لێرەدا بەهۆی ئامادەبوونی خواوەندەوە تایبەتمەندییەکی ڕۆحانی لەخۆ ئەگرێ و ئەبێتە سەرچاوەی سرووش و ئیلهام بۆ شاعیر.

پێویستە ئەوەش بوترێ کە ئەم ئایینە نەک هەر لە ئەدەبی ڕۆمانتیک و بەتایبەت شاعیرانێک وەک وۆردوۆرز[1] ئاماژەی بۆ کراوە بەڵکو لە ئەدەبی ڕۆژهەڵاتیشدا و بۆ نموونە لە ڕوانگەکانی ئەبوسەعیدی ئەبولخەیردا دەرکەوتووە و، تەنانەت ئەکرێ ئەو خاڵەش دەستنیشان بکرێ کە لە ئایینی بەرەهمەنی و فەلسەفەی ڕەواقی و نیئۆ ئەفلاتوونیدا و بەگشتی و بەتایبەت لە شێوە ڕوانینی سۆفیەکاندا گرنگایەتی هەیە. لە ئەدەبدا، بەڵام، پانتێئیزم ئەو چەمکەیە کە پتر خۆی لە نێوان دوو قوتابخانەی سەرەکی ئەدەبی ڕۆژئاوادا، واتە نیئۆ کلاسیزم و ڕۆمانتیسیزم، دەبینێتەوە. بەواتایەکی تر، پانتێئیزم ئەو توخمە پێکهێنەر و خاڵە بنەڕەتیەی قوتابخانەی ڕۆمانتیکە، کەچی قوتابخانەی (نیئۆ) کلاسیستی سەدەگەلی حەڤدە و هەژدە بەهۆی بنەواشە ئەقلانی و پاڵپشتە فەلسەفیەکەیەوە ئاوڕ لە چەمک و ڕوانینی پانتێئیستی ناداتەوە و لەو ئەدەبەشدا لەبری سروشتی دەرەکی زۆرتر تیشک ئەخرێتە سەر سروشتی دەستکردی ڕێکوپێکی ناو شارەکان و باخچە گشتییەکان. بەکورتی، لە (نێئۆ) کلاسیزمدا لەجیاتی پانتێئیزم ڕوانینی (دێ ئیزم) زاڵە کە لێرەدا هەردوو واژەی (تێ) و (دێ) بەمانای خواوەند بەکارهێنراوە. بەکورتی پانتیئێزم خەسڵەتێکی خواوەندی و بەهەشتی و ڕۆحانی ئەبەخشێتە تاقمێ بەرهەمی ئەدەبی ڕۆمانتیستی کە تیایدا ئاماژە بۆ ئامادەبوونی خواوەند لە سروشت و یەکیەتی خواوەند لەگەڵ جیهان و سروشت (ی دەرەکی)دا و یەکسانی هەقیقەتی جیهان و خواوەند و لە ئاکامدا وزەی ئیلهامبەخشی سروشت کراوە.

لە فەلسەفەی کۆندا چەمکی پانتێئیزم لە چوار لایەنی جیاجیاوە بەکارهێنراوە کە بریتین لە: یەکەم برەهمانەکان کە پێیان وابوو برەهمان هەقیقەتی گشتی و ڕۆحی جیهانە و سەرجەم چشتەکانی دیکە دەرکەوتە یان شێوەی ئەم حەقیقەتەن؛ دووەم ڕەواقیەکان کە ئەڵێن خوا و جیهان یەک شتن و جیهان لە خواوەند جیا نییە؛ سێیەم نێئۆ ئەفلاتوونیەکان

1- William wordsworth (1770-1850)



کە پێیان وایە خواوەند یەکێکە و بەدیهاتنی جیهان لە خواوەندەوە وەکو بەدیهاتنی تیشک لە خۆرەتاو وایە و بوونەوەرەکان هەڵگری پلەی جیاوازن، بەڵام ئەم زنجیرە و پلە جیاوازانە لەگەڵ خواوەنددا یەک چشت پێک ئەهێنن؛ چوارەم سۆفیەکان ئەڵێن خواوەند هەقە و جگە لە بوونەوەرێکی یەکبوو شتێکی دیکە لە ئارادا نییە و ئەوەش (واتە خواوەند) بوونێکی ڕەهایە و جیهان یەکێکە لە دەرکەوتەکانی زاتی خواوەند.

لە فەلسەفەی پاش ڕۆنێسانسدا ڕوانگەی پانتێئیزم لە بەرهەمی هەندێ فەلسەفەکاری ئەوروپیدا ڕەنگی داوەتەوە کە یەکیەتی بوونی سپینۆزا کە بەو پێیە هەر تەنیا خواوەند بوون و بوونەوەری حەقە و، یەکیەتی بوونی ڕۆح خوازیی هێگڵ کە بەو پێیە خواوەند ڕۆحی گشتی شاراوە لە ڕۆحە بچووکەکاندایە دوو نموونەی ئاماژەی فەلسەفەی مۆدێرنن بۆ ئەم چەمکە.

**پچڕان؛ دابڕان؛ نابەردەوامی** **discontinuity**

**پرتەی زمان** **slip of tongue**

ئەم زاراوەیە سەرەتا بەشێوەیەکی بەرچاو لەلایەن زیگمۆند فرۆیدەوە بەمەبەستی دەستنیشانکردنی ئەو هەڵە و پرتانەی زمان بەکارهێنرا کە بێژەر لەکاتی قسەکردندا و بەهۆی هەندێ هۆکاری دەروونناسانەوە تووشیان ئەبێت؛ فرۆید دەیەویست لەم ڕێگەیەوە پەیوەندییە جیاجیاکانی نیۆ ناهۆشیاری تاکەکەسیی مرۆڤ پێشان بدات و پرتەی زمان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ گرێ بداتە چۆنیەتی باری ناخود ئاگاوە. لە زمانناسیشدا، ڕۆمەن یاکوبسن بەمەبەستی پەنجە خستنە سەر ئەو خاڵە لاوازانەی بێژەر لەوانەیە لە دوو تەوەری ئاسۆیی و ئەستوونی زماندا تووشیان ببێت کەڵکی زۆری لەم دەستەواژەیە وەرگرت. هەڵبەت یاکوبسن پرتەی زمان کە پتر لە تەوەری ئاسۆیی و هاونشینی زماندا ڕوودەدات وەکو جۆرێک نەخۆشیی زمان یان پەرێشانی زمان دادەنێ کە نەتوانینی قسەکەر لە هونەری مەجاز و کەم دەسەڵاتی ئەو بەسەر تەوەری هاونشینی زماندا ئەخاتە ڕوو.

جگە لەو دوو ڕوانگەیەی سەرەوە، ژاک لاکان لە دەروونشیکاریدا و لەپێناو خستنەڕووی پەیوەندی نێوان زمان و زەینی ناهۆشیاری مرۆڤ و یاخود بەرجەستەکردنەوەی گرێ جینسیەکان و، ژاک دێریدا لە فەلسەفەی تایبەتی خۆیدا بەمەبەستی جیاکردنەوەی گوتەی قسەکەر لە مەبەستی قسەکەر و هەروەها جێگۆڕکێی دالەکان و لە ئەنجامدا گۆڕینی ڕواڵەتی باوی دوانە لێکدژەکان لەم زاراوەیە کەڵک وەردەگرن.

**threnody** — **پرسەگێڕی**

ترێنۆدی جۆرێک سروودی ماتەمە کە لە شیعری ماتەمین کورتتر و جەماوەریترە و، ئەم جۆرە شیعری ماتەمە پتر لەلایەن چەند کەسەوە هاوکات دەردەبڕدرێ. ئەوڕۆکە ئەم زاراوەیە دەقاودەق وەک (سروودی ماتەمی کورت) بەکار ئەبرێ.

**rhetorical question** — **پرسیاری کەلامی**

پرسیاری کەلامی کە بۆ خۆی هونەرێکە لە هونەرەکانی زانستی کەلام بریتییە لەو پرسیارەی لەکاتی لێدوان و یاخود نووسیندا بەمەبەستی ڕاکێشانی سەرنجی خوێنەران و بەتایبەت بیسەران ئاراستە ئەکرێ تاکو لەم ڕێگەیەوە لێدوان یاخود نووسینەکە زۆرتر لەسەر جەماوەری خوێنەر و بیسەر کاریگەرێتی دابنێ. ئەم پرسیارە کە لە ڕاستیدا لەباری واتاییەوە وەکو ڕستەیەکی پرسیاری نییە و بەڵکو پتر گوزارەیەکی بەهەواڵە هەندێ جار وەکو ئەنجامی بەشێک لە ئاخاوتە و نووسینەکە دەردەبڕدرێ و هەر بۆیەش وەڵامەکەی لەلای خوێنەران و بیسەران ئاشکرایە. خاڵی گرنگ ئەوەیە کە وەڵامی پرسیاری کەلامی خۆی لەخۆیدا و بەشێوەیەکی تاک ئاشکرا نییە، بەڵکو بەچەشنێک ئاراستە ئەکرێ و بەشێوەیەک بەستێنسازی بۆ دەکرێ کە وەڵامەکەی ئاشکرا ئەنوێنێ؛ هەر بۆیەش پرسیاری کەلامی پێویستی بەوەڵامدانەوە نییە. ئەم هونەرە گەرچی لە زۆربەی ڕوانین و قوتابخانە ئەدەبییەکاندا بەکارئەبرێ، بەڵام پتر لەو بەرهەمانەدا دەرئەکەوێ کە پاڵپشتیان زانستی کەلامی کلاسیکە و زۆرتر لە قوتابخانە کلاسیستی و نیئۆکلاسیستیدا کەڵکی لێ وەردەگیردرێ.

**پرەنسیپ ◄—— بنەواشە**

**comic relief** — **پشووی پێکەنین؛ پشووی ئەهوەن بوونەوە**

پشووی پێکەنین بریتییە لە بەکارهێنانی کەسایەتی و گوتە و دیمەنە گاڵتەئامێز و پێکەنیندارەکان لە بەرهەمێکی جیددی و تراژیکی شانۆییدا. بەکارهێنانی توخمگەلێکی وا کورت و پێکەنیندار لە ناوەڕاست یان تەشقی بەرهەمێکی جیددی و تراژیکدا لە شانۆکانی سەردەمی ئەلیزابێتدا، واتە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەم، ڕواڵەتێکی گشتگیری هەبوو. ئەگەرچی هۆی سەرەکی بەکارهێنانی ئەم تەکنیکە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەهوەن کردنەوە و دامرکاندنەوەی ئەو تەنشت و کێشە و کەڵکەڵە دەروونیانەی جەماوەری بیسەر و خوێنەر بەهۆی باری قورس و تراژیکی بەرهەمەکەوە لە چەند جێگایەکی دیاریکراودا و بەتایبەت



لە بەشی نزیکە و ئەنجامی ئەو بەرهەمانەدا، بەڵام هەندێ جار لەلایەن شانۆنامەنووسە گەورەکانەوە لەم تەکنیکە مەبەستی پتەوتر کردنەوەی گەڵاڵەی بەرهەمەکە و باشتر نواندنەوەی بیری شانۆیی یاخود فیکری پاڵپشتی بەرهەمەکە کەڵک وەردەگیردرێ. بەواتایەکی تر، پشووی پێکەنین لە بەرهەمە جیددیە تراژیکەکاندا تەنیا بەمەبەستی ئەهوەن کردنەوەی جەماوەری خوێنەر و یاخود بیسەر بەکار نابرێ و بەڵکو بۆ خۆی بەشێکی جیانەکراوەی گەڵاڵەی بەرهەمەکەیە.

نموونە بەرچاوەکانی ئەم هونەرە بریتین لە دیمەنی یەکەم لە پەردەی پێنجەمی شانۆنامەی هەملێت کە تیایدا وتووێژێکی گاڵتەئامێز لە نێوان هەملێت و گۆڕکەنەکاندا سەرئەگرێ و، یان، ئەو بەشەی دیمەنی سێهەمی پەردەی دووەمی شانۆنامەی مەکبێس کە تیایا باربەرێکی سەرخۆش دوای کوشتنی پاشا دەست ئەکا بەقسەکردنی گاڵتەئامێز. نموونەی تر بریتییە لەو دیمەنانەی تیایاندا فالستاف[1] دەوری سەرەکی ئەگێڕێ، وەک بەشی یەکەمی شانۆنامەی هێنری چوارەم[2] و، دەوری مێرکوشیۆ[3] و پەرستاری پیر لە ڕۆمیئۆ و ژوولیەتدا.

**anarchism** — **پشێویخوازی**

**positive** — **پۆزیتیڤ، ئیجابی، ئەرێیانە**

**positivism** — **پۆزیتیڤیزم**

فەلسەفەی پۆزیتیڤیزم لەسەر ئەم بنەواشەیە دامەزراوە کە لە سەرجەم زانستە سروشتی و مرۆییەکاندا تەنیا سەرچاوەی ڕاستەقینەی بەدەستهێنانی زانیاری بریتییە لە تاقیکاری و ئەزموونە لۆژیکی و بیرکارانەکان و، هەر بۆیەش لە پۆزیتیڤیزمدا ئەو هەوڵانەی بەمەبەستی ناسینی دیاردەکان لەسەر شهوود و ئیلهام و هەست و بڕوای تایبەت دامەزراون بەگشتی وەلا ئەنرێن. تایبەتمەندی سەرەکی پۆزیتیڤیزم زانستێتی و بابەتێتیە و، هەر جۆرە زەینییەتێک و ئیمان بەبوونی هەر چەشنە دیاردەیەکی دەرەوەی واقیع و کەواتە بڕوا بەمیتافیزیک ڕەت دەکاتەوە. لەم ڕوانگەیەوە مرۆڤ لە سەرانسەری مێژوودا بەردەوام پەلی بۆ میتافیزیک هاویشتووە و نەک هەر سیاسەت و ئەخلاق، بەڵکو ئایینیش ئەبێ هەڵگری شێوەیەکی زانستی بێت. پۆزیتیڤیستەکان کە پتر لە نیوەی دووەمی سەدەی

1- Falstaff.

2- Henry IV.

3- Mercution.

نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا سەریان هەڵدا بنچینەی بڕواکەیان ئەگەڕێتەوە بۆ گۆڕانکارییە فیکرییەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری. بەپێی ئەم بڕوایە ئەوەی نەکرێ بەبابەتی ناسین و لێکۆڵینەوەی زانستی دابنرێ ناشکرێ لە ڕێگەیەکی زانستییەوە پەسندیان ڕەت بکرێتەوە.

ئەقڵ لە ڕوانگەی پۆزیتیڤیستەکانەوە ئەو ئامرازە بەرایییەی ناو زەینی مرۆڤ نییە کە هەموو کەسێ هەڵگر و خاوەنی بێت، بەڵکو ئەو بەهرەیەیە کە ئەبێ وەدەست بهێنرێ و بەیارمەتی ئەم ئەقڵە گۆڕانکاری بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیدا بێ. هەر بۆیەش هەوڵیان ئەدا لە ڕێی زانستە سروشتی و کۆمەڵایەتیەکانەوە یاسا و ڕێسا زاڵەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی دەستنیشان بکەن تاکو لەم ڕێگەیەوە گۆڕانکارییەکی باش و پەسندکراو لەم بەستێنەدا بێتە ئاراوە.

سێن سیمۆن و ئاگۆست کۆنت دامەزرێنەرانی پۆزیتیڤیزم بوون لە بواری زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا. گەرچی دەوری سیمۆن لە هی کۆنت بەرچاوتر و کاریگەرتر بووە، بەڵام بەرهەمەکانی کۆنت چوارچێوەی سەرەکیی بیری پۆزیتیڤیستی لە زانستە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی ئەمڕۆدا پێک دەهێنن.

بەبڕوای کۆنت پێویستە بیرۆکە و گەڵاڵە تیۆریکەکان و ڕێڕەوگەلی لێکۆڵینەوەی زانستە سروشتییەکان لە زانستە کۆمەڵایەتییەکانیشدا بەکار ببرێ. بەم پێیە کۆنت باسی (یەکیەتی زانست) ئەکات و پێی وایە لە نێوان بابەتگەلی زانستە کۆمەڵایەتییەکان و بابەتگەلی زانستە سروشتیەکاندا جیاوازییەک لەئارادا نییە و ئەم دوو زانستە هەم لەباری ڕێباز و ڕێڕەوەوە و هەم لە ڕووی چیەتی و سروشتەوە هەر یەکێکن. پۆزیتیڤیزم لە بنەڕەتدا شۆڕشێک بوو دژی فەلسەفە و ئەخلاق و میتافیزیک؛ بەواتایەکی ڕوونتر دژی خوازیارییە میتافیزیکییەکانی فەلسەفە و بەرلەوەی بەمانای ئەرێ و چاک و پەسەندکراو بەکاربرێ، بەمانای بابەتیانە دەرئەکەوێ. ئەمەش واتە پۆزیتیڤ ئەو بابەتە بابەتیانە و دەرەکییەیە کە بوونی هەیە و بەم هۆیەشەوە زانستە کۆمەڵایەتییەکان ئەچنە ناو ئەو دیاردانەوە کە لە هەر چەشنە داوەری و هەڵسەنگاندنێکی ئەخلاقی و فەلسەفی جیاواز و بەدوورن.

پۆزێتیڤیزمی سەدەی نۆزدەهەم لە ڕواڵەتی دوو چەشنی سەرەکیدا، واتە پۆزێتیڤیزمی کۆمەڵایەتی و پۆزێتیڤیزمی کامل بوون، دەرکەوت و هەردوو ڕێبازەکە هەڵگری بیرێکی



هاوبەش بوون کە بیری پێشکەوتن بێ. پۆزێتیڤیزمی کۆمەڵایەتی کە لە ڕوانگەی کۆمەڵگا و مێژووەوە لە بیرۆکەی پێشکەوتنی ئەکۆڵیەوە لە بەرهەمی بیرمەندانێک وەک کۆنت و جان ستوارت میلدا ڕەنگی دایەوە و، پۆزێتیڤیزمی کامل بوون کە لە بواری فیزیا و زیندەوەرناسیدا بەدوای پێشکەوتندا دەگەڕا پتر لە بەرهەمی هێربێرت سپێنسیردا ئاماژەی بۆ کراوە. لە سەدەی بیستەمیشدا، پۆزێتیڤیزم بەشێوەیەکی هاوچەرخ و بەناوی پۆزێتیڤیزمی لۆژیکی هاتە ئاراوە کە فەلسەفەی ئەندامانی ئاڵقەی ڤیەن لە ساڵانی ١٩٢٠دا بوو کە کارل پۆپێر بەرچاوترین ئەندامی ئەو ئەنجوومەنە بوو کە لە جیاتی بنەواشەی (هەڵگری ڕاستی) ڕێسای (هەڵگری پووچەڵی)ی بنیات نا و، لەم ڕێگەیەوە ڕوانین و ڕێڕەوێکی تازەی لە بیردۆزیی زانستدا بەدی هێنا کە بناخەکەی لەسەر پووچەڵکردنەوەی گومانەکان دامەزرابوو.

لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا و لەلایەن بەشیکە لە بیرمەندانی مارکسیستەوە کە خۆیان بەمارکسیستی ناپۆزێتیڤیست ناوبردە ئەکرد، واتە ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرت، ڕەخنەیەکی توند و ڕادیکال ئاراستەی پۆزێتیڤیزم کرا و جگە لەمەش هەندێ فەلسەفەکاری کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمی ئەڵمان و بەتایبەت ئەندێشەکانی ماکس ڤێبێر بیری پۆزێتیڤیستیان خستە بەر ڕەخنە کە لە ئەنجامدا و لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا و لەلایەن زۆربەی خوازیارییە پۆست مۆدێرنیستیەکانەوە بەگشتی هەڵوەشایەوە.

ئەو لقەی ڕەخنەی مارکسیستی سەرەتای سەدەی بیستەم کە ئەمڕۆکە بەڕەخنەی ئەدەبی مارکسیزمی ئۆرتۆدۆکس و وشک ناسراوە بەڕەخنەی ئەدەبی پۆزێتیڤیستی دادەنرێ کە بەردەوام هەندێ حوکمی سەبارەت بەئەدەب ئاراستە ئەکرد و ئەدەبی لە خزمەت حزب و چینی کرێکار و جەماوەری خەڵکدا بەمانا مارکسیستیەکەی پێناسە ئەکرد. هەڵوێستی دژە واقیع خوازانەی ئەدەب لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا و بەتایبەت لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بەجۆرێک هەڵوێستی دژە پۆزێتیڤیستی لە مێژووی ئەدەبدا ناوبردە ئەکرێ. هێماخوازی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و بزووتنەوە دژە واقیع خوازیەکانی دیکەی سەرەتای سەدەی بیستەم بەنموونە سەرەکیەکانی ئەو هەڵوێستە دادەنرێن.

**پۆست فۆرمالیزم ⟵ پاش شێوەخوازی**

**پۆست مۆدێرن** **post - modern**

**پۆست مۆدێرنێتی** **post - modernity**

## پۆست مۆدێرنیزم post - modernism

سێ زاراوەی پۆست مۆدێرن و پۆست مۆدێرنێتی و پۆست مۆدێرنیزم هەڵگری ماناگەلی جیاواز و فرەڕەهەند و فرە واتان و هەر بیرمەندە و شێوەڕوانینی تایبەتی خۆی بۆ ئەم سێ چەمکە هەیە. هەر سێ چەمکەکە لە بوارە جیاجیاکاندا وەک ئەدەب، فەلسەفە، بیناسازی، هونەر، سیاسەت، کۆمەڵناسی، کولتوور و... بەکار ئەبرێن. بەمەبەستی کردنەوەی دەروازەیەک بۆ چوونە ناو باسەکە سەرەتا هەوڵ دەدرێ پێناسەیەکی گشتی و گشتگیر لەم سێ چەمکە بەم چەشنە بدرێت بەدەستەوە، هەڵبەت بەمەرجێک پێناسەکان بابەتیانەبن و هیچ چەشنە خوازیارییەکی تایبەت لەخۆ نەگرن: پۆست مۆدێرن کۆمەڵێک هەڵوێستی ئاڵۆز و فرە ڕەهەندی جیاجیایە لە بەرامبەر فەلسەفەی مۆدێرن و پێش گریمانەکانی ئەو فەلسەفەیەدا و، پۆست مۆدێرنێتی پتر لایەنی ڕەوت و گەریان و، پۆست مۆدێرنیزم پتر لایەنی کارکردی ئەو بابەتەیە، بەشێوەیەک کە ئەوڕۆکە پۆست مۆدێرنیزم لەو دوو زاراوەکەی تر زۆرتر بەکار ئەبرێ و دەلالەت ئەکاتە سەر بزووتنەوە و یاخود بەو شێوەیەی هەندێ نووسەر پێیان وایە قوتابخانەیەکی ئەدەبی و هونەری. ئەگەرچی درکاندنی ئەو خاڵە پێویستە کە ڕوانگەکان لەسەر ئەم زاراوانە چەند لایەنە و جیاوازن و تەنانەت هەندێ کێشەی فیکری و فەلسەفی ئاڵۆز و قووڵی لێ کەوتووەتەوە بەڵام لێرەدا ئێمە ئەمانەوێ تاڕادەیەک ڕوانینێکی یەکدەست بەئاماژەکردن بۆ بیروڕا جیاجیاکان ئاراستە بکەین.

بیر داڕێژان و باس لێکەرانی ئەندێشەی پۆست مۆدێرن بەشێوەیەکی جیددی و ڕادیکال هەوڵ دەدەن ئەم ڕەوتە فیکرییە لە بەرامبەر سەرجەم باوەڕە ڕەها و گومانە دێرینەکانی مرۆڤ (ی ڕۆژئاوایی) دابنێن کە بۆ ماوەی چەندین سەدەیە لە ڕواڵەتی ڕۆنێسانس، ڕفۆرماسیۆن، ڕۆشنگەری، ڕاپەڕینی پیشەسازی و، بەگشتی مۆدێرنێتی ڕۆژئاوایی و مۆدێرنیزمی ئەدەبی سەرەتای سەدەی بیستەم لە ژیانی کۆمەڵایەتی و فیکری ڕۆژئاوادا دەرکەوتووە. هەڵبەت ئەبێ ئەوەش بوترێ پۆست مۆدێرنێتی ڕەوتێکە کە لە ڕاستیدا لە ناخی مۆدێرنێتییەوە هەڵقووڵاوە و هەوڵێکە بۆ دۆزینەوەی ئەو وەڵامانەی لەپێناو چارەسەرکردنی گرفتەکانی مۆدێرنێتی و دەربازبوون لە ئاکامە سەلبییەکانی مۆدێرنێتی. هەر بەم بۆنەشەوە تاقمێک لە بیرمەندان بڕوایان بەدابڕانی پۆست مۆدێرنیزم لە مۆدێرنێتی نییە و بەڵکو پۆست مۆدێرنیزم وەکو درێژە یان تەواوکەری پرۆژەی مۆدێرنێتی لە قەڵەم دەدرێ کەواتە پۆست مۆدێرنیزم لە ناخی ئەو کێشە و قەیرانە جیاجیایانەوە ڕسکاوە کە



مۆدێرنێتی لە ڕەوتی گۆڕانکاری و کامل بوونی خۆیدا ڕووبەڕوویان بووەوە. بەواتایەکی دیکە، پۆست مۆدێرنیزم هەڵوێستێک بوو دژی سەرجەم دەستکەوتەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری و مۆدێرن.

زۆرێک لە ڕەخنەکاران بەر لەوەی باسی پۆست مۆدێرنیزمی نیوەی دووەم و بەتایبەت کۆتایی سەدەی بیستەم بکەن، سەرەتا ئاوڕ لەو فەلسەفەکار و نووسەرانەی بەر لە سەردەمی پۆست مۆدێرن (واتە بەر لە شەڕی دووەمی جیهانی) ئەدەنەوە کە بەچەشنێک لە بەرهەمەکانیاندا هەڵوێستێکی دژ بەمۆدێرنێتی ڕۆژئاوایان گرتووە. ئەوەتا لەم نێوانەدا نیچە، فەلسەفەکاری ئەڵمانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم، بەیەکێک لەو کەسانە دادەنرێ کە گەرچی لە سەردەمی پێش سەرهەڵدان و گەشەکردنی بیر و تیۆرە پۆست مۆدێرنیستیەکاندا دەژیا، ڕوانگەکانی زۆرترین کاریگەرێتیان لەسەر بیری پۆست مۆدێرن دانا و، تاقمێ نووسەر نیچە بەپێغەمبەری پۆست مۆدێرنەکان ناوبردە ئەکەن. لە پاڵ ئەمەشدا، چەند بیرمەندێکی تری سەرەتای سەدەی بیستەم وەک ئێدمۆند هۆسێرڵ و هایدگێر و فەلسەفەی ویتگنشتاین-ی دووەم کاریگەریان لەسەر سەرهەڵدان و مسۆگەربوونی پۆست مۆدێرنیزم داناوە و، جێ پەنجەیان بەسەر بەرهەمی چەند فەلسەفەکارێکی پۆست مۆدێرنی وەک ژاک دێریدا و گادامێر و ژیل دلۆز و...هوە دیارە، بۆ نموونە، نیچە پێی وایە کە شتێک بەناوی بابەتێتی لە ئارادا نییە بەتایبەت بابەتێتی زانستی ئاکامی ڕاڤە جیاجیاکانی مرۆڤە و هەروەهاش هیچ ڕاڤەیەک بەدوا ڕاڤە ناژمێردرێ، حەقیقەتەکان هیچ شتێک نین جگە لە چەند درۆیەکی سوودبەخش. نیچە پێی وایە مرۆڤ لە ڕێگەی چەمکە ئەقلانییەکانی خۆیەوە جۆرێ نەزم و ڕێکوپێکی ئەبەخشێتە جیهان تاکو لەم ڕێگەیەوە درێژە بەجیهانی خۆی بدات، ئەمەش شتێک نییە جگە لە چەوت نواندن و بەلاڕێدا بردنی واقیع. زۆرێک لە وتەکانی نیچە لە ڕوانگە پۆست مۆدێرنیستیەکاندا ڕەنگی داوەتەوە، وەک بڕوا بەزۆرینەیی جیهان و ڕێژەیی بوونی ڕوانگەکان. لەلایەکی دیکەشەوە، پێداگری هایدگێر لەسەر زمان و ئەوەی کە ئێمە لەناو زماندا بووینەتە خاوەنی سنوور و زمان ناتوانێ دەلالەت بکاتە سەر واقیعی دەرەکی، دیسانەوە لە چەند ڕەهەندێکی پۆست مۆدێرنیستیدا سوودی تەواوی لێ بینراوە.

فەلسەفەی پۆست مۆدێرن لە بنەڕەتدا دژی بنەڕەتخوازی، بنیاتخوازی و واقیع خوازی-یە و، بەپێی ئەم بیرە گریمانەکانی بنەڕەتخوازی کە بەشێوەیەکی هاوبەش لەناو بەرهەمی فەلسەفەکارە بەرچاوەکانی سەدەگەلی شانزە و حەڤدە و هەژدەدا ڕەنگی داوەتەوە پێویستە

وەلابنرێن و، تەنانەت فەلسەفەی ڕۆژئاوایی لە بناخەوە هەڵ بوەشێندرێتەوە. بەبڕوای نیچە، هایدگێر، فۆکۆ و دێریدا تەمەنی ئەم گریمانە و پێش گریمانانە بەڕادەی تەمەنی میتافیزیکە و ڕەنگە باشترین دەرکەوتە و وێنای بابەتیانەی ئەم گریمانانە لەناو ڕوانینەکانی ئەفلاتووندا بەباشترین شێوە ببینرێنەوە. سەرەڕای ئەمەش، ژان فرانسوالیۆتار پێی وایە کە فەلسەفەی پۆست مۆدێرن لە چاو فەلسەفەی مۆدێرن لەپێش ترە چونکە پێش گریمانەکانی فەلسەفەی مۆدێرنیزم لە سەرچاوەیەکەوە هەڵقوولاون کە بیرە بەیان نەکراوە بەرایییەکانی ئەم فەلسەفەیە بۆ خۆیان بە(پۆست مۆدێرن) ئەژمێردرێن.

فەلسەفەی پۆست مۆدێرن وەکو چەمکێکی فرە ڕەهەند و ئاڵۆز دادەنرێ کە ئەم توخمانەی خوارەوەی گرتووەتەوە: ڕوانگەیەکی دژ یان پاش مەعریفە ناسانە (ی مۆدێرن)، هەڵوێستێکی دژە بنیاتخوازانە، دژایەتی لەگەڵ واقیعخوازی، دژایەتی لەگەڵ بنەڕەتخوازی، دژایەتی لەگەڵ بەڵگە بەرزاییەکان و هەڵوێستە بەرزاییەکان، ڕەتکردنەوەی وینەی لەئارادابووی مەعریفە و ناسین وەکو نواندنەوەی ورد، ڕەتکردنەوەی هەقیقەت وەک بەرامبەر و هاوسەنگ لە واقیعدا، ڕەتکردنەوەی تیۆری وەسفە گشتییەکان، ڕەتکردنەوەی دواین واژەکان، واتە ڕەتکردنەوەی ئەو یاسا و ڕێسا و بنەواشە و وتەزایانەی کە بۆ سەرجەم زمانەکان و کەسەکان و شوێنەکان بەشتێکی ڕەها دانراون و، لە ئاکامدا جۆرێ بەدگومانی لە هەمبەر گێڕانەوە گەورەکان. جگە لەو تایبەتمەندییانەی سەرەوە ئەندێشەی پۆست مۆدێرن ئەم خالانەی خوارەوەش ئەگرێتەوە: ڕەخنە لە بێ لایەنی و سەربەخۆیی ئەقل و پێداگری لەسەر سروشتی مێژوویی و نەتەوەخوازانە و پۆلێنکاری کراوێتی ئەقڵ، خوازیاری مێژووییخوازی و ڕەخنە لەهەر چەشنە دژایەتییەکی دوایینیانەی نێوان مەعریفە ناسیی و کۆمەڵناسیی مەعریفە، لێک ترازانی سووژەی سەربەخۆ و پێداگری لەسەر پێگەی مێژوویی دابەشبوونی کار لە ڕەوتی وەدەستهێنان و بەرهەمهێنانی مەعریفەدا و جۆرێک دووفاقێتی دەربارەی ڕۆشنگەری و ئایدیۆلۆژیای ڕۆشنگەری.

بەواتایەکی دیکە، ئەگەر بمانەوێ تۆزێک گشتی تر لەسەر بابەتەکانی ئەندێشەی پۆست مۆدێرن بدوێین پێویستە لەم خالانەی خوارەوەدا دەستنیشانیان بکەین (هەڵبەت ئەبێ ئەوەش بوترێ کە ئەندێشەی پۆست مۆدێرن هەڵگری ئاراستە و تایبەتمەندییەکی یەکسان نییە و بەڵکو ئەم ئەندێشەیە بەئاراستەگەلی جیاجیادا تێدەپەڕێ و بابەتەکانیشی زۆربەی کات پێکەوە تەبا نین):

١- شک و گومان لەوەی کە هەر جۆرە هەقیقەتێکی مرۆیی بۆ خۆی نواندنەوەیەکی



بابەتیانە و ساکاری واقیعە.

٢- سەرنجدان و پێداگری لەسەر چەشنی بەکارهێنانی زمان لەلایەن کۆمەڵگاکانەوە بەمەبەستی سازکردنی واقیعە دڵخوازەکانی خۆیان و ئەمەی کە کۆمەڵگا بەچ شێوەیەک لە زمان بۆ بەدیهێنان و چێکردنی واقیع کەڵک وەردەگرن.

٣- بەباشتر دانان یان ئاوڕدانەوەی زۆر لە ناوچە و پەراوێزەکان، گرنگی دان بەشتە بەهەست و تایبەتەکان لە هەمبەر بابەتە جیهانی و دەرهەستەکان.

٤- سازکردنی پەیوەندی دووبارە لەگەڵ گێڕانەوە و چیرۆکبێژی.

٥- پەسندکردنی ئەم خاڵە کە وەسفە جیاجیا و جیاوازەکانی واقیع ناتوانرێ بەردەوام بەشێوەیەکی ڕەها و دواییني لە بەرامبەریان دژی یەکتر بەکار ببرێن.

٦- خوازیاریی پەسندکردنی شتەکان بەو چەشنەی کە لە ڕواڵەت و سەرایی دان نەک (بەشێوازی فرۆید یان مارکس) گەڕان بەدوای دۆزینەوەی واتای قووڵ و بنایی.

لە ئەوروپا بڕێک نزیکایەتی و وێکچوونییەکانی پۆست مۆدێرن ڕاشکاوانە لە چوارچێوەی بیری پاش بنەماخوازانەدا ئاراستە کرا؛ هەرچەند لە ڕەخنەکانی هایدگێر دژی پاشماوەکانی ئەندێشەی دیکارتی لە بەرهەمەکانی هوسێرڵدا هەندێ نیشانە و شوێن پەنجە وەبەرچاو ئەکەوێ بەڵام لەم نموونانەی خوارەوەشدا ئەکرێ ڕووبەڕووی بڕێک لە نزیکایەتیە پۆست مۆدێرنییەکان ببینەوە کە بریتین لە: ڕەتکردنەوەی وەسفە ژێرخانییەکان لە واتا هوسێرڵیەکەیدا، هێرشی سوسوور و بنەماخوازی دژی یەکگرتوویی پێگەی بەرزایی لە هەمبەر سووژەی خۆئاشکرادا، هەڵوەشاندنەوە یان بنەماشکێنی میتافیزیکی ئامادەبوون لەلایەن دێریداوە، وەسفکردنەوەی سەرلەنوێی مەعریفە و زانیاری لەسەر دەستی فۆکۆ، نزیکایەتی نێوان بنەماخوازە کۆمەڵایەتییەکانی فەرەنسا و ئینگلتەرا، هێرش بردنە سەر زمانی بارودۆخی یاریدەرانە و، لە ئاکامدا، دەستێوەردانی جیاجیای لیۆتار لە دژی گێڕانەوە گەورەکان. تاقمێ وزەی ڕەخنەکارانەی پۆست مۆدێرن بەباشترین شێوە لەناو تیۆرە فیمینیستەکاندا و لە بەرهەمی کەسانی وەک هێلێن سیکسوس و جودیت باتلێردا دەرکەوتووە.

زۆربەی ئەندێشە پۆست مۆدێرنیستیەکان لە فەرەنسا سەریان هەڵدا و باسکەران و دامەزرێنەرانی ئەم قوتابخانەیە پتر فەرەنسی بوون وەک فۆکۆ، لیۆتار، دێریدا، بودریار، لاکان، دلۆز و گاتاری و... هتد. ڕەوتی پۆست مۆدێرنیتە بەر لە هەر شتێک زۆرتر

پێشاندەری کەش و هەوای ڕۆشنبیری و دۆخی ئەندێشەیی دووفاقە و تاڕادەیەک دژ بەڕۆمانتیک و ڕادیکال و شۆڕشگێڕانە و پشێوی خوازانەی فەرەنسەی شەستەکانە کە لە ڕاپەڕینی ١٩٦٨دا گەیشتە تەشقی خۆی.

پۆست مۆدێرنیزم لە پێگەی گەڕیانێکی بەهێزی کولتووری و سیاسی و ڕۆشنبیریدا توانیویەتی هەندێ پێناسەی نوێ و ڕەخنە ئاراستەی ڕەوتی پۆلێنکاری و کاملبوونی شوناس و خود و تاکەکەس بکات و چەند بیرێکی مەعریفیش ڕووبەڕووی ئەخلاق و مێژوو و هونەر و سیاسەت بکاتەوە. لەلایەکی دیکەشەوە، تێگەیشتن لە ئالۆزی سیستەمی کولتووری و فیکری کۆمەڵگا پاش پیشەسازیەکان بە بەشێکی تر لە کەڵکەڵەکانی تیۆری کولتووری و توێژینەوەی کولتووری پۆست مۆدێرن دادەنرێن.

هەڵبەت چەند نووسەرێک پێیان وایە کە بیری پۆست مۆدێرنیستی هەر تەنیا تایبەت بەسەردەمی پاش شەڕی دووەمی جیهانی و بەتایبەت پاشساڵی ١٩٧٠ نییە و بەڵکو لەلایەکەوە تاقمێ نووسەر و فەلسەفەکاری پێش ئەم سەردەمە حەزیان لەم شێوە بیرە هەبووە و، لەلایەکی دیکەشەوە پۆست مۆدێرنیزم تەعبیر لە مەعریفە و بیری سەرجەم نووسەران و فەلسەفەکارانی پاش شەڕی دووەمی جیهانی ناکات. ئەگەرچی پۆست مۆدێرنیزم لەباری مێژووییەوە دوای مۆدێرنیزم هاتە ئاراوە، بەڵام لە زۆر لایەنەوە لێکدی جیاوازن بەڵام ئەگەر بمانەوێ وێکچوونی مۆدێرنیزم و پۆست مۆدێرنیزم دەستنیشان بکەین ئەبێ پەنجە بخەینە سەر بێزکردنی هەردوو ڕەوتە فیکری و یاخود قوتابخانە ئەدەبییەکە لە واقیع خوازی و لاسایی کردنەوەی واقیع لە هونەر. خاڵی جیاکەرەوەی نێوانیشیان لەم لایەنەوە بریتییە لەوەی کە مۆدێرنیزم بانگەشە بۆ لاسایی نەکردنەوەی واقیع ئەکات کەچی بۆ خۆی بەجۆرێک خەریکی نواندنەوەی واقیعە. هەرچەندە واقیعی دەرکەوتەی ئەدەب و هونەری مۆدێرنیزم لە واقیعی ئەدەبی سەدەی نۆزدە زۆر جیاوازە، بەڵام ئەوەی مۆدێرنیستەکان پیشانیان دەدا ئەو واقیعە بوو کە تەنیا بەڕوانینێکی وردەکارانە و قووڵەوە ئەبینرا و تا ڕادەیەکی زۆر واقیعی ناخود ئاگای مرۆڤ بوو. پۆست مۆدیرنیستەکان لەلایەکی دیکەوە پێیان وایە واقیع و هەقیقەت لە دەر و دەرووندا لە ئارادا نییە کە بکرێ ئاراستە یان لاسایی بکرێتەوە.

زاراوەی پۆست مۆدێرنیزم لە یەکەم ڕوانیندا دەلالەت ئەکاتە سەر قۆناغبەندیەکی مێژوویی؛ واتە کولتوور و هونەری پۆست مۆدێرن ئەو کولتوور و هونەرەیە کە لە ساڵەکانی دوای شەڕی دووەمی جیهانییەوە خۆی لە تەکنیکەکان و نەریتەکانی مۆدێرنیستی



جیاکردەوە بەبێ ئەوەی کە بەتەواوەتی بگەڕێتەوە بۆ پێگەی پێش مۆدێرن یا ریالیستی. بەڵام پێش ئەم قۆناغە زۆر ڕەخنەگر ئەم زاراوەیەی بۆ دەستنیشانکردنی هەندێ تایبەتمەندی کولتووری و هونەری و کۆمەڵایەتی تایبەت بەکار ئەهێنا. بۆ نموونە، ئیهاب حەسەن ڕەچەڵەکی زاراوەی پۆست مۆدێرنیزم وەک بەکارهێنان ئەگەڕێنێتەوە بۆ کتێبێکی فرێدریکۆدۆئۆنیس بەناوی هەڵبژاردەی شیعری ئیسپانیایی و ئەمریکی کە لە ساڵی ١٩٣٤دا چاپ کراوە. زاراوەی پۆست مۆدێرنیزم لەچاو مۆدێرنیزم بەشێوەیەکی بەربڵاوتر بەکار ئەبرێ. واتە لەوانەیە مۆدێرنیزم بەر لەوەی تەعبیر لە کەش و هەوای کۆمەڵگا بکات ئەو بزووتنەوە ئەدەبی و هونەرییە وەبیر بهێنێتەوە کە بەبزووتنەوەی مۆدێرنیزم ناسراوە. کەچی، پۆست مۆدێرنیزم پتر دەلالەت ئەکاتە سەر بارودۆخی گشتی کۆمەڵگای مرۆیی و پاشان تەعبیر لە ئەدەب و هونەری پۆست مۆدێرنیستی ئەکات (ئەم باسەی دوایی پتر بەهۆی بڵاوبوونەوەی کتێبێکی لیۆتارەوە بەناوی بارودۆخی پۆست مۆدێرن) هاتە گۆڕێ. ئەمڕۆکە پۆست مۆدێرنیزم لەم مانایانەی خوارەوەدا دەرئەکەوێ:

١- ئەو ئەدەب و هونەرە نا واقیع خوازانە و نا نەرێتییەی سەردەمی پاش شەڕی دووەمی جیهانی.

٢- ئەو ئەدەب و هونەرەی تا ڕادەیەکی زۆر بێ سنوور کەڵک لە چەند تایبەتمەندییەکی مۆدێرنیستی دیاریکراو وەردەگرێ.

٣- ئەو لایەنانەی بارودۆخی گشتی مرۆڤ لە (سەرمایەداریی دواین)ی جیهانی پاش ساڵەکانی ١٩٥٠ کە کاریگەرێتییەکی هەمەلایەنە و فرەڕەهەندی لەسەر ژیان و کولتوور و ئایدیۆلۆژیا و هونەر دانا.

لە ئەدەب و هونەری پۆست مۆدێرنیستیدا نەک هەر ئەو بارودۆخەی پاش شەڕی دووەمی جیهانی (بەتایبەت لە چەند وڵاتێکی ڕۆژئاوادا ئەوروپا و ئەمریکای باکور) نوێندراوەتەوە، بەڵکو ئاماژە بۆ گرفت و قەیرانە سەرەکییەکانی ئەم سەردەمە کراوە. وەک هەڕەشەی کۆمەڵکوژی و لەناوچوونی گشتی بەهۆی بۆمبای ئەتۆمەوە، لەناوچوونی پەیتاپەیتای ژینگەی سروشتی و واقیعی هەژێنەری زیادبوونی ژمارەی جەماوەری سەرزەوی. پۆست مۆدێرنیزم لە ئەدەب و هونەردا نەک هەر بەدرێژەی یان بەکارهێنانی بێ سنووری ئەزموون و تەکنیکە دژە نەرێتییەکانی مۆدێرنیزم دادەنری بەڵکو لە ڕوانگەیەکی دیکەوە چەند هەوڵێکی جیاجیای دەربازبوون لە فۆرمە مۆدێرنیستییەکان لەخۆگرێ کە بۆ

خۆیان ڕواڵەتی فۆرمی نەرێتیان لەخۆ گرتووە. یەکێک لە خوازیارییە بەرچاوەکانی نووسینە پۆست مۆدێرنیستیەکان بریتییە لە بەراوەژووکردنەوەی ئەو بنیاتانەی بیر و ئەزموونی ئێمەی لەسەریان دامەزراوە، ئەمەش بەمەبەستی ئەوەیە کە بێ مانایی بوون و هیچێتی ئاشکرا بکاتەوە. هەروەک گوترا، پۆست مۆدێرنیزم لە ئەدەب و هونەردا تا ڕادەیەک لەگەڵ بزووتنەوەیەک بەناو پاش بنەماخوازی لە زمانناسی و تیۆری ئەدەبیدا هاوڕێن. چونکە پاش بنەماخوازەکان ئەیانەوێ بنیاتەکانی زمان بەشێوەیەک بەراوەژوو بکەن کە بێ مانایییە ڕواڵەتیەکەی ون ببێ و لەم ڕێگەیەوە بچنە ناو کایەی (نا چەق بەستوێتیە) لێک دژەکانەوە، هەروەهاش ئەیانەوێ سەرجەم شێوەگەلی گوتارە کولتوورییەکان بەشێوەیەک پێشان بدەن کە سەرلەبەر دەرکەوتەی ئایدیۆلۆژیان و، لەم پێناوەشدا پەیوەندییەکان و بنەماکانی دەسەڵات لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا دەستنیشان ئەکەن.

ئەگەر بمانەوێ لایەنێکی دیکەی پێناسەی پۆست مۆدێرنیزم هەڵ بدەینەوە:

پۆست مۆدێرنیزم جیاکردنەوەی گوتاری سەردەمێکی تایبەتە، هەڵبەت نەک بەواتای دابڕانێکی مێژوویی بەڵکو دەکرێ بڵێین بەمانای چەقبوونەوەی مۆدێرنیزمە. بەکارهێنانی پێشگری (پۆست) وامان لێ دەکا کە هەمیشە ئەوەمان لەبیر بێت کە قسەکردن دەربارەی پۆست مۆدێرنیتە واتە بڕواداریێتی بەکۆتایی نەهاتنی و زیندوێتی مۆدێرنیزم و قەیرانەکانی؛ هەرواش، کە کوستلانتز ئاماژەی پێ دەکا: «پۆست پێشگرێکی جێگەی داخە. هەمیشە بزاڤی گەورە بەتایبەتمەندییەکانی خۆیەوە پێناسە کراوە، نەک بەو پەیوەندییەوە کە لەگەڵ شتی دیکەدا دایمەزراندووە... هیچ هونەرمەندێکی دیکە نایەوێ پاش (پۆست)ی ئەو شتێک لە ئارادا هەبێت». بەم زانیارییەوە چاک وایە پۆست مۆدێرنیزم ناوبنێین مۆدێرنیزمی هۆشیارانە.

ئەگەر بەپێڕەوکردنی فۆرمالیستەکان لە مێژووی ئەدەب وەک مێژووی سەرێتی تەکنیک بەسەر تەکنیکەکانی دیکەدا بکۆڵینەوە ئەوا مێژوو دەبێتە لێکۆڵینەوەی لێ وردبوونەوەی هەر سەردەمێک لە ڕێڕەو و پێناسەکان و پێشاندەری زاڵبوونی تەکنیکێک بەسەر تەکنیکێکی دیکە دایە. کەسانێکی وەک دیویدلاج پێنج تایبەتمەندی بۆ دەقێکی پۆست مۆدێرنیستی ناوبردە دەکاکە دژوازی، یەکانگیر نەبوون، نەبوونی ڕێڕەو (ڕێکەوت)، زێدەڕۆیی و لێکدران (short circuit). بەم پێناسەیە دەبێ هەر دەقێک بەکۆمەڵێ تایبەتمەندی بەراورد بکرێ تاکو بکرێ لە چەشنێکی ئەدەبیدا جێ بکرێتەوە.



ئیهاب حەسەن ڕێگەیەکی دیکە دەستنیشان دەکات و حەوت تایبەتمەندی بۆ چیرۆکی پۆست مۆدێرنیستی وەک بەشێک لە ئەدەبی ئەم قۆناغە ناوبردە دەکات: هۆگرێکی بەژیانی شار، ناچار بوون بەکەڵک وەرگرتن لە تەکنۆلۆژیا، پشتگوێ خستنی و ئافەرۆزکردنی مرۆڤ، ئەویندارێتی و خۆشویستی سەرەتا، ڕووتێنی خوازی، ئەخلاق کوژی و ئەزموونی بوون.

هاوکات لەگەڵ ئاڵوگۆڕبوونی بنەمای هۆشیاری، شوێنگەی مرۆڤ لە جیهاندا گۆڕانی بەسەر داهات و، تەنانەت بەواتەیەک، زاراوەی (مرۆڤ) ئاشبەتاڵی پێ کرا. لە ڕوانگەی کەسایەتی ئەدەبی پۆست مۆدێرنیستیەوە، جیهانی تاقانە و لە ڕادەبەدەر ئەقڵانی، وەک تەنیا جیهانی شیاو، دەبێ بخرێتە لاوە و جیهانی زۆر ئەزموون بکرێن. بۆ ئەزمون کردن و تاقیکردنەوەی ئەم جیهانە زۆر و زەبەندانە پێویستە گێڕانەوە گەورەکان بخرێنە لاوە. لەبەرئەوەی ئەم گێڕانەوە مەزنانە هەردەم بەشوێن یەکسان کردندان تاکو جیهان لە سیستەمێکدا جێگیر بکەن و پێناسەی بکەن و بیناسن؛ بەڵام لە ڕووی ئەزموونەوە، هیچ شتێک شتێکی دیکە نییە؛ کەواتە ئەدەبی پۆست مۆدێرنیستی هەڵوێستێکە لە بەرامبەر گێڕانەوە گەورەکاندا و بۆ داڕووخاندنی حوکمی ڕەشی دامودەزگای تاک سیستەم. ئەم ئەدەبە کۆمەڵێک گێڕانەوەی بچووک و کەسەکییە و بڕوای بەناسینی گشتی نییە؛ کەواتە ئەدەبێک دێتە ئاراوە کە باسی تێکتەندراوێتی جیهانەکان یاخود باسی جیهانی جیاوازە دەکات. ئەو بەشانەی بەناوی (ئەویدی) پشتگوێ خرابوون. فرێ دەدرێنە ناوەڕاستی دەقەوە و ئەشق بەرامبەر بەمەرگ و بزربووەکان و قەراغ نشینەکان لە هەموو شتێک زیاتر دێنە بەرچاو. هەمیشە (ئەویدی)یەکان ئاراستە ئەکرێن. دەق مەعریفەیەکی گشتی بەرامبەر بەجیهان نییە؛ کەواتە بزووتن، ڕاستەهێڵە تاقانەکەی ون ئەکات و بەرەو ناهاوتایی و نابەرامبەربوون ئەچێ و هەموو شتێک نارێکوپێک دێتە بەرچاو، میشێل فۆکۆ ئەم پشێوی و نا ڕێکوپێکیە ئەگەڕێنێتەوە بۆ (شوێنانی دی). (شوێنانی دی دڵەڕاوکێیان بەدواوەیە، ڕەنگە بەم هۆیەی کە بەدزیەوە زمان دەخەنە مەترسیەوە، چونکە ناوە گشتییەکان ئەشکێنن یاخود پیسیان ئەکەن، چۆن لە پێشدا نەحوی زمان وێران ئەکەن، نەک هەر ئەو نەحوەی ئێمە ڕستەی پێ ساز دەکەین بەڵکو ئەو نەحوە شاراوەی کە ئەبێتە هۆی ئەوەی وشەکان و چشتەکان (لە پاڵ یەکتر و لە بەرامبەر یەکدیدا) جێگیربن. چێکردنی (شوێنانی دی) بوتیقای ئەدەبی پۆست مۆدێرنە و هەر چەشنە ئاواتی سازدانی وێچوونی دەق لەگەڵ جیهانی واقیع وەلادەنێ لەم ڕووەوە لەگەڵ چەمکی (داهێنەر)

(author)دا دژایەتی دەکا. لە دەقە کلاسیکەکاندا هەمیشە خولیایەک بۆ سازکردنەوەی جیهان لەناو دەقدا هەبووە تاکو لەم ڕێگەیەوە (داهێنەر) زۆر بەخوا بشوبهێنن. بەڵام ڕەقی پۆست مۆدێرنیستی بوونی خولقێنەری دەق ڕەت دەکاتەوە تاکو بتوانێ بگەڕێتەوە بۆ لای خۆی. واتە ڕۆیشتن لە دالەوە بۆ دال کە تایبەتمەندی دەقی پۆست مۆدێرنە ئەدەب ئەگێڕێتەوە بۆ خۆی و دەقێک بەرهەم دێنێ کە هیچ پەیوەندییەکی بەواقیعەوە نییە و لەم ڕووەوە ئەتوانێ خۆ لە دابەشکردنی جیهانگەلی جۆراوجۆر ببوێرێ. حەزی پۆست مۆدێرنیزم بەکایەکردن ئەمانخاتە ئەو بیرەوە کە ڕەنگە بنەمای چێژ وەرگرتن لە هونەر یارییە. یاری نایەوێت بگەڕێتەوە بۆ هیچ شتێک بەڵکو ئەیەوێ هەر یاری ڕوو بدات و بەئەنجام بگات. هەر ئەمەش بنەمای ڕەقی پۆست مۆدێرنیستی پێکدێنێ.

نووسەرانی پۆست مۆدێرن چەشنە ئەدەبییەکان تێکەڵ بەیەکتر ئەکەن و بابەتە جیددی و گەمە ئاساکان هاوکات پێکەوە لە ئاستە جیاجیا شێوازناسانە و کولتووریەکاندا بەکار ئەبەن و دژی هەر چەشنە پۆلێنکاریەکن بەپێی پێوەرە ئەدەبی و نەریتییەکان. تاقمێ لە نووسەرانی پۆست مۆدێرنیزم بریتین لە: خورخەلویی بۆرخس، تامس پین چۆن، سامویل بەکت، جان بارت، ئالێن ڕۆب گریە، کارلۆس فۆینتس و....

**پۆلێنکاری** **classification**

**پۆلێنکاریی مەعریفە ← ئیپیستیم**

**پەخشان** **prose**

**پەخشانە شیعر** **prose poem**

پەخشانە شیعر نووسینێکە لە ڕواڵەتی پەخشاندا بەڵام هەڵگری توخمە باوەکانی شیعرە، وەک: کێش، هونەرە کەلامییەکان، لەحنی تایبەت، سەرەوای ناوەکی، هاوئاهەنگیی پیتەکان و وێنە دیداری و ژنەفتەنیەکان. ئەگەرچی ئەم شێوازی نووسینە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا سەری هەڵدا، بەڵام بوودلێر بوو کە بەبەرهەمی پەخشانە شیعرە کورتەکان-یەوە کە لە ساڵی ١٨٦٩دا لە چاپ درا پەرەی بەم شێوازە نووسینە دا. جگە لە بودلێر، لەم بەستێنەدا نووسەرێکی دیکە بەناوی بێرتراند (١٨٠٧-١٨٤١) کاریگەرێتی لەسەر شاعیران و نووسەرانی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم کە زۆربەیان هێماخواز یان سوریالیست بوون دانا. ئۆسکاروایلد و ئارتور ڕەمبۆ و ئەمی لۆوێل لەو نووسەرە بەرچاوانەن کە هەندێ جار ئەم شێوازەشیان تاقی کردووەتەوە.



**پەخشانی ئاتینی** **Attic prose**

شێوازێکی تایبەت بەپەخشانە لەلایەن وتاربێژانی یۆنان و ڕۆمی کۆنەوە بەکار ئەهێنرا. تایبەتمەندی سەرەکی وەها شێوازێکی پەخشان بریتییە لە ساکاری و ئاشکرایی کە تیایدا کەڵک لە هونەرە کەلامیەکان بەو شێوەیەی باوبوو وەرناگیرێ.

**پەخشانی پاراوی سینیکایی** **Senecan amble**

سینیکا شانۆنامەنووسی سەدەی یەکەمی زایینییە و بەیەکێک لە گەورەترین شانۆنامەنووسانی سەردەمی ڕۆمی کەونارا دادەنرێ کە پتر بەهۆی چەشنی تایبەتی شانۆکانییەوە، واتە شانۆنامەی خوێندنەوە، ناسراوە. پەخشانی سینیکایی ئەو شێوازە پاراوەی پەخشانە کە تیایدا بەکەڵک وەرگرتن لە هونەری (چاک دەربڕین) زمان تا ئاستێکی زۆر بەمەبەستی کەمکردنەوەی باری تراژیک یان ئامادەکاری بۆ دەربڕینی واتایەکی تراژیک دادەبەزێت. هەڵبەت پێویستە ئەوەش بوترێ کە، سەرەڕای ئەو خاڵەی سەرەوە، لە شانۆنامەکانی سینیکادا بەهۆی ئەوەوە کە زمان پتر لە کردە دەور ئەگێڕێ سەرجەم باری عاتیفی و تا ڕادەیەکیش کردەی شانۆیی ئەپەستریتە ناو زمان. بەکارهێنانی هونەرە گوتەییەکان تا ڕادەیەکی زۆر و کایەی زمانی تا ڕادەیەکی کەم لە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی ئەم پەخشانەیە.

**پەخشانی ڕازاوە؛ پەخشانی دەستکرد** **ornate prose**

**پەخشانی سەروادار** **rhmed prose**

**پەخشانی شاعیرانە** **poetic prose**

ئەو جۆرە تایبەتەی پەخشانە کە بەهۆی بەکارهێنانی کێش و تەنانەت هەندێ جار کێشی عەرووزی یان بڕگەوە لەناو زمانێکی لیوانلێو لە هونەرە گوتەیی و کەلامییەکان بەشێوازێکی بەرزەوە زۆر جار لە شیعر نزیک ئەبێتەوە. پەخشانی شاعیرانە پتر لە بەرهەمگەلی کورت یان لە هەندێ بەشی کورتی بەرهەمە بڵندەکاندا بەکارئەبرێ تاکو چەشنە کاریگەرێتیەکی تایبەت یان (سۆزێکی عاتیفی) لەسەر خوێنەر دابنێ. ئەگەرچی لە ئەدەبی کلاسیکدا پەخشانی شاعیرانە بەکار ئەبرا (وەک بەرهەمەکانی جان لی لی[1] و سێرتامس براون[2])، بەڵام لە ئەدەبی مۆدێرنیستیشدا و بەتایبەت لە کورتە چیرۆک و

1- John Lyly (1554-1606).

2- sir Thomas Brown (1605-1682).

ڕۆمانەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا لە سەردەستی نووسەرانێکی وەک جۆیس و وولّف و فاکنێر بەکارهێنراون. (بڕوانە پەخشانە شیعر).

**پەخشانی کێشدار** **rhythmical prose**

**پەراوێز (١)؛ پاشنووس** **endnote**

**پەراوێز (٢)؛ پەراوێزی لاپەڕە** **margin**

**پەراوێز (٣)؛ ژێرنووس** **footnote**

**پەراوێز نووسین** **annotation**

**پەرتووکناسی ⟵ کتێبناسی**

**پەردە (ی شانۆنامە)** **act**

پەردە بریتییە لە بەشە سەرەکییەکانی شانۆنامە کە تیایدا کردەی شانۆیی دابەش ئەبێت. هەر پەردەیەک لەوانەیە یەک یان چەند دیمەن بگرێتەوە. لە یۆنانی کۆندا شانۆنامەکان پتر گشتێکی یەکگرتوو بوون کە بەخستنە سەری گوتەی گرووپی کۆڕ ئەنوێندران، بەڵام لە ڕۆمی کۆندا هۆراس یەکەم کەس بوو کە پێی لەسەر بنەمای پێنج پەردەیی شانۆنامە دادەگرت. ئەم دابەشکاریەی کردەی شانۆیی بۆ سەر پێنج پەردە لەنێو شانۆنامەنووسانی سەردەمی ئێلیزابێتدا ڕواڵەتی باوی گرتەخۆ کە ئەوانیش بۆ خۆیان لەژێر کاریگەری بەرهەمەکانی سینیکادا بوون. جگە لە شکسپیر، بێن جانسۆن[1] هەر لەم سەردەمەدا (واتە، سەرەتای سەدەی حەڤدەهەم) دەوری بەرچاوی لە پەرەپێدانی شانۆنامەی پێنج پەردەییدا گێڕا. بەشێکی زۆری بەرهەمە شانۆییەکانی نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەمیش هەر لە ڕواڵەتی پێنج پەردەدا بەڕێوە چوون. ئەگەرچی لە سەردەمی گەڕانەوەی پاشایەتیدا پێش دەستپێکی یەکەم پەردە بەمەبەستی دیتنی پێشەکی شانۆکە پەردەکە هەڵدەدرایەوە و تا کۆتایی شانۆکە دایان نەدەدایەوە بەڵام لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەمدا لە کۆتایی هەر پەردەیەکدا پەردەکە دادەدرایەوە...

ئیبسن[2] ژمارەی پەردەکانی بەرهەمەکانی خۆی لە پێنجەوە بۆ چوار دابەزاند و، جگە لەو هەندێ نووسەری دیکەی وەک چیخۆف[3] و بیراندیللۆ[4] شانۆنامەی چوار

1- Ben Jonson (1572-1637).

2- Heriric Ibsen (1828-1906).

3- Anton chekhov (1860-1904).

4- Luigi Pirandello (1867-1936).



پەردەییان ئاراستە دەکرد. لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا هەرچەندە شانۆی دووپەردەیی هاتە ئاراوە بەڵام زۆربەی نووسەران شانۆی سێ پەردەییان بەلاوە باشتر بوو. پێویستە ئەوەش بوترێ کە زۆربەی شانۆنامە مۆدێرنەکان لە ڕواڵەتی زنجیرە دیمەنێکی یەک لەدوایەکدا ئەنووسرێن و بەڕێوە دەبرێن. شاو[1]، برێشت و بێکێت[2] لەو نووسەرانەن کە لە باری بنەماوە هەندێ گۆڕانکاری دیکەیان لە شانۆنامەدا بەدی هێنا.

**پەریی شیعر** **Muse**

لە ئەدەبی ڕۆژئاوادا و بەپێی واتا ئوستوورە ناسانەکان ئەم پەرییانە نۆخواژن بوون کە کچانی زێئووس[3] و منومۆزین[4] بوون و هەر کامیان بۆ خۆی هەڵگری چالاکی یان هونەرێکی تایبەت وەک مۆسیقا و شیعر بوون. بەپێی نەریتێکی کۆن هونەری حەماسە ئەبوایە لە پەریی شیعر بۆ دانانی بەرهەمەکەی کەڵکی وەربگرتایە و پەریەکەش لە ڕەوتی نووسیندا یارمەتی بدایە و بەپێی بڕوایەکی دیکەی ئەفسانەیی، نەک ئوستوورەیی، دێڕی یەکەمی هەموو شیعرێک لە ڕاستیدا بەرهەمی ئیلهام وەرگرتنی شاعیرە لە پەریی شیعر.

**پەند (١)؛ کورتە وتە؛ بژاردەبێژی** **aphorism**

ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا یۆنانییە و بەمانای سنووربەندی کردن بەکارهێنراوە و پێناسەی کورتی بریتییە لە دەربڕینی بیر و بیرۆکەیەک بەشێوەیەکی کورت کە پتر دەلالەت دەکاتە سەر حەقیقەتێکی گشتی یان بڕوایەکی جیددی لەسەر ژیان و جیهان یاخود مرۆڤ و پەراوێز لە شێوەی بژاردەبێژیدا. بەبڕوای هەندێ نووسەر ئەم زاراوەیە پەندی پێشینان و قسەی نەستەقیش دەگرێتەوە. وەک ئەوەی بڵێین: «هونەر نەمرە، ژیان کورتە» یان «ویژدان سەگێکە ئەکرێ لێی ببوری بەڵام بەر بەحەپینەکەی ناگیرێ» کورتەوتە یان بژاردەبێژی لە زووەوە هەیە و ڕواڵەتێکی گشتی و جیهانی هەیە و، بەتایبەت لە سەردەمی کلاسیکدا و لە ڕۆژهەڵاتدا بەزۆری هەبووە و، وەکو پوختە و کورتەی هاوبەشی زانست و زانیاری مرۆڤ لە سەرانسەری جیهاندا لە ڕواڵەتی هەندێ حەقیقەتی بلووریندا لە شارستانێتییە کۆنەکاندا دەرکەوتووە. لەناو ئەو کەسانەی ئەم گەنجینەیان دەوڵەمەند کردووەتەوە ئەکرێ ناوی ئەمانەی خوارەوە بەرین: ئەفلاتوون، سوقرات، ئەرەستوو، سێنت ئاگوستین،

1- George Bernard Shaw (1856-1950).

2- Samuel Beckett (1906-1989).

3- Zeus.

4- Mnemosyne.

عومەری خەیام، فرانسیس بەیکن، شاو، گوتە، نیچە و... هتد. لە کوردەواریشدا هەست بەئامادەبوونی زۆرێک پەند و کورتەوتە ئەکرێ کە یان بەشێوەی پەندی پێشینان یان بەشێوەی قسەی نەستەق دەرکەوتوون کە بۆ نموونە ئەکرێ باس لە پەندە جیاجیا کوردییەکان و یاخود قسەی نەستەق و کورتەوتەی چەند نووسەر و شاعیرێک وەک مەولەوی تاوەگۆزی و پیرەمێرد و... بکەین.

**پەند (٢)؛ پەندی پێشینان** — **proverb**

پەندی پێشینان ئەو ڕستە کورتانەی ناو زمانە جیاجیاکان پێکدێن کە پەردە لەسەر حەقیقەتێکی سەبارەت بەژیان و مرۆڤ و جیهان هەڵدەدەنەوە دانەرەکانیشیان نادیارن. پەندی پێشینان بەگشتی یەکێ لە توخمە سەرەکیەکانی فۆلکلۆری نەتەوەیەک پێک ئەهێنن کە بەشێوەیەکی سەرزارەکی لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە گوازراونەتەوە و، بەسامانی ئەدەبی زارەکی ئەژمێردرێن، کە هەر لە دێرینەوە ئامادەن.

**پەند (٣)؛ قسەی نەستەق** — **maxim**

وشەی مەکزیم لە بنەڕەتدا لاتینیە و پتر بەمانای واتا (ی مەزن) بەکار هێنراوە و ئەو گوتە یان قسەیەیە هەرچەندە زۆر لە بژاردەبێژییەوە نزیکە بەڵام پتر ئاوڕ لە ئاوەز و ئەندێشە ئەداتەوە و بابەتێکی قووڵ و کورت ئاراستە ئەکات کە ئامۆژگاری یان حەقیقەتێکی گشتی سەبارەت بەسروشتی مرۆڤ یان هەڵسوکەوتی وی بدات بەدەستەوە، بڕێکیان دانەرەکەیان ناسراوە و بڕێکی دیکەشیان نادیارن. زۆربەی جار لە ڕستەیەک یان ڕەنگە زیاتر (دوو یان سێ ڕستە) پێکدێت و بەپێچەوانەی پەند (ی پێشینان) پتر بەرهەمی ئەم چەند سەدەی دواییە کە نووسین پەرەی پێ درا.

**پەیامی ئەخلاقی ← ئەخلاقی**

**پەیمان ← بەڵێن**

**پیاوانە ← باوکسالارانە**

**پیاوتەوەر؛ پیاومەڵبەند** — **androcentric**

**پیاهەڵدان ← بەند هەڵگوتن**

**پیتی سەروا** — **consonants of the rhyming words**

**پێداچوونەوە؛ بینینەوە** — **revision**

**پێداچوونەوەی خێرا؛ ڕوانینی تێپەڕ** — **bird’s - eye view**



**پێداچوونەوەی کتێب** — **book review**

**پێش بڕوا ← پێش تێگەیین (٢)**

**پێش بنەما** — **fore - structure**

**پێشبینی** — **prolepsis**

ئەم زاراوە یۆنانیە بەشێوەگەلی جیاجیا بەکار ئەهێنرێ، وەک ئەوەی کە لە گوتە و گوتاردا بەرلەوەی ڕەخنەکان ئاراستە بکرێن وەڵامیان بدرێتەوە، یان ئاماژەکردن بۆ شتێک کە لە داهاتووی کردەی چیرۆکیدا بەڕاستی ڕوودەدات و، یاخود دەرخستنی پێشوەختی هەندێ دیاردە کە دواتر لە هەمان بەرهەمدا دێنە ئاراوە. ئەم تەکنیکە پتر پەیوەندی بەگێڕانەوە ناسیەوە هەیە و لەناو بیرمەندانی هاوچەرخدا ژرار ژێنێت زۆرتر لەوانی دیکە تیشکی خستووەتە سەر ئەم هونەرە و بەدوو جۆری سەرەکی دابەش دەکات کە بریتین لە پێشبینی ناوەکی، واتە ئەو پێشبینیەی ڕووداوەکان کە لەناو چوارچێوەی زەمانی چیرۆکەکەدا ڕوو ئەدەن و، پێشبینی دەرەکی، واتە دەرخستنی ئەو دیاردە و ڕووداو یاخود کەسایەتیانەی کە لە سنووری کاتیی چیرۆکەکە تێ دەپەڕن (بڕوانە بۆ بازدان بۆ داهاتوو).

**پێش تێگەیین (١)** — **pre - understanding**

**پێش تێگەیین (٢)؛ پێش بڕوا** — **fore - conception**

**پێش دەق** — **hypo - text**

**پێش دەقێتی** — **hypo - textuality**

**پێش ڕوانین؛ پێش ڕوانگە** — **fore - sight**

**پێشڕەو؛ پێشەنک** — **avant - garde**

ئەم زاراوەیە بەشێوەیەکی باو و فرەپات لە مێژووی ئەدەب و هونەردا بەکار ئەبرێ و پتر دەلالەت دەکاتە سەر ئەو بزاڤە ئەدەبی و هونەریانەی پێش سەرهەڵدانی ئەدەبی مۆدێرنیستی کە گەرچی سەرەتا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا و بەتایبەت لە فەرەنسا هاتە ئاراوە، بەڵام هاوکات لەگەڵ گەشەکردنی ئەدەبی مۆدێرنیستیشدا، هەست بەئامادەبوونی ئەدەب و هونەری پێشڕەو ئەکرێ کە ئەمجارەیان (سەرەتای سەدەی بیستەم) لە هەندێ وڵاتی دیکەی وەک ئینگلتەرا و ئەڵمان و ڕووسیاش سەری هەڵدا. ئەم چەشنە ئەدەب و هونەرە هەڵگری داهێنانی نوێ و ڕێتێبردنە کە بەجۆرێک تایبەتمەندییەکی شۆڕشگێڕانەشی تێدایە و زۆربەی کات دژی قوتابخانە زاڵەکانی سەردەم،

كە پتر قوتابخانە واقیع خوازەكانی ئەدەب و هونەر بوون بەرهەڵستكاری ئەكات. ڕەنگە سەرەتای بەدیهاتنی ئەم بزووتنەوەیە بگەڕێتەوە بۆ ئەدەب و بەتایبەت هونەری ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمی فەرەنسا. بەو پێیە هونەر بەردەوام پێشەنگ و دەرخەری ڕاستییەكانە و پێشكەوتووترین خوازیاریەكانی كۆمەڵگا بەباشترین شێوە پیشان ئەدات. لەلایەكی دیكەوە، بودلێر لە یاداشتەكانی خۆیدا ئاماژە دەكات بۆ (ئەدەبی پێشڕەو) و لە ساڵی ١٨٧٨دا گۆڤارێک هەر بەهەمان ناوەوە دەرئەچوو كە پتر بایەخی دەدا بەبانگەشەی سیاسی بۆ لایەنە سیاسییە جیاجیاكان. لە كۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا، ئەم زاراوەیە بەشێوەیەكی تایبەت بۆ ئەو بزووتنەوانەی ئاقاری ئەدەب و هونەر بەكارهێنرا و پەیتا پەیتا واتا كۆمەڵایەتی و سیاسییەكەی خۆی لە كیس دا و، پتر تەعبیری لە مانایەكی كولتووری و هونەری دەكرد. ئەوڕۆكە زۆربەی شاعیرانی قوتابخانەی بنەماخوازی و جیلی دوای بودلێر، وەك ڤێرلێن، ڕێمبۆ و مالارمە، بەیەكەمین هونەرمەندانی (پێشڕەو) دادەنرێن. لە سەردەمی هاوچەرخدا لەم زاراوەیە بۆ دەستنیشانكردنی هەندێ بزووتنەوەی پاش شەڕی جیهانی، وەك ڕۆمانی نوێ لە فەرەنسە و شانۆنامەی پووچی، كەڵك وەردەگیرێ.

**پێشڕەوی تەریک؛ پێشەنگی تەریک** **bohemian**

**پێش زمانناسانە** **per - linguistic**

**پێش زەمینە (١)** **forground**

**پێش زەمینە (٢)؛ پێشینە** **background**

**پێش قاڵب بەندی؛ پێش شێوەدانان** **pre - figuration**

**پێشكەوت (١)** **progress**

پێشكەوت چەمكێكی مێژووییە كە دژی بەراییخوازی زەمانەندە و لە سەدەی حەڤدەهەمدا سەری هەڵدا و لە سەدەی نۆزدەهەمدا گەییشتە تەشقی خۆی. بەپێی ئەم بیرۆكەیە ڕەوتی مێژوو ئەتوانێ بەبەرەكەتی پێشكەوتنی بەكاربردن و گەشەپێدانی هونەر و زانست و تەكنۆلۆژیا و زاناییەوە پێشكەوتنێكی باشتر لە ژیان و هەڵسوكەوت و بەختەوەری مرۆڤەكاندا بەخۆیەوە ببینێ، كە ئەم ڕەوتەش هەر لە سەردەمی وەحشییەتیەوە تا قۆناغی هەنووكەیی شارستانیەتی (واتە سەدەی نۆزدەهەم، بەلای لایەنگرانی ئەم بیرەوە) بەردەوام بووە. هەندێ جار هۆگرانی وەها بیرێک وای بۆ ئەچن كە پێشكەوتنی مێژوویی مرۆڤایەتی تا دێت بەرەو باشتر بوون ئەچێ و هەر بەردەوام ئەبێت، تاكو لە



ئاكامدا بگاتە دوا قۆناغی كامڵبوونی ئەخلاقی و ئەقڵانی و كۆمەڵایەتی. لە سەدەی بیستەمدا زۆر ئەدیب و هونەرمەند دژی ئەم گەشبینییەی لایەنگرانی بیرۆكەی پێشكەوت هەڵوێستیان گرت و بەتوندی سەركۆنەیان كرد.

**پێشكەوت (٢)** **development**

**پێش كەونارا** **pre - antique**

**پێش گریمانە** **presupposition**

**پێشگوتن، پێشەكی (٥)** **prologue**

زاراوەی (پرۆلۆگ) كە لە كوردیدا بەشێوەی پێشكەوتن و پێشەكی بەكار ئەبرێ لە پێشگری (پرۆ) بەمانای (پێش) و (لۆگ) بەمانای كەلام یان لۆژیكی زارەكی پێكهاتووە. لە ئەدەبدا (پرۆلۆگ) پتر دەلالەت دەكاتە سەر یەكەمین بەشی بەرهەمی ئەدەبی كە زیاتر شانۆنامەیە و، ئەم نەریتەش هەر لە یۆنانی كۆن بەملاوە تا كۆتایی سەدەی هەژدەهەم ئەبینرێ. پرۆلۆگ بەشێوەیەكی گشتی پتر لەلایەن گرووپی كۆڕەوە دەردەبڕدرێ و، لە بەرهەمگەلی ئەدەبیدا بەستێن بۆ ناساندنی شوێنكاتی كردەی شانۆیی یان چیرۆكی و هەروەها هەندێ جار ناساندنی كەسێتییەكانی ناو بەرهەمەكە خۆش دەكات.

**پێش گەڵاڵە** **sketch**

ئەم زاراوەیە هەڵگری دوو مانای سەرەكییە. مانای یەكەم شێوەیەكی گشتی هەیە و بۆ پێش گەڵاڵەی هەر جۆرە بەرهەمێكی ئەدەبی بەكار ئەبرێ. ئەم مانایەی پێش گەڵاڵە تا ڕادەیەک لە (ڕەشنووس)ی بەرهەمی ئەدەبی نزیكە كە پاش (چەندین جار) پێداچوونەوەی دوانووسخەی وەكو بەرهەمی ئەدەبی دەرئەكەوێ. مانای دووەمی پێش گەڵاڵە، بەڵام، بەشێوەیەكی تایبەتی بۆ جۆرێک دەقی ئەدەبی بەكار ئەبرێ كە لەم كاربردەیەدا باشتر وایە لەجیاتی پێش گەڵاڵە هەر لە خودی زاراوەی سكێچ كەڵک وەربگیردرێ. لێرەدا سكێچ ئەو پارچە كورتەی پەخشانە كە ڕواڵەتێكی وەسفی هەیە و بەلێشاو لە چاپەمەنییەكاندا ئەبیندرێ. هەندێ جار لایەنی وەسفیی سكێچ لەگەڵ ڕەهەندێكی گێڕانەوەییشدا تێكەڵ ئەبێت و لەم كاتەدا تا ڕادەیەک لە كورتە چیرۆک نزیک دەبێتەوە. هەڵبەت لە باری ژمارەی وشەكانەوە سكێچ لە نێوان كورتە چیرۆک و كورتیلە چیرۆكدایە و نموونەی بەرچاوی سكێچ لەم پێناسەی دواییدا بەرهەمێكی چارلز دیكنزە بەناوی سكێچەكانی

باوز[١] (١٨٣٩). سەرەڕای ئەو دوو مانایەی سەرەوە، سکێچ هەندێ جار دەلالەت دەکاتە سەر کورتە پارچەیەکی شانۆیی کە باشترین نموونە لێرەدا بەرهەمێکی هارۆڵد پینتر[٢]-ە بەناوی دوا پاس[٣]. ئەمڕۆکە سکێچ تا ڕادەیەکی زۆر ئاوێتەی جۆرێک نووسینی تازە بووە بەناوی وتوویژنووسی.

| | |
|---|---|
| **پێش مێژوو؛ قۆناغە سەرەتاییەکان** | **prehistory** |
| **پێشەکی (١)** | **introduction** |
| **پێشەکی (٢)** | **proem, proemium** |
| **پێشەکی (٣)** | **preamble** |
| **پێشەکی (٤)** | **preface** |
| **پێشەکی (٥) ⟵ پێش گوتن** | |
| **پێشەنگ ⟵ پێشڕەو** | |
| **پێشینە ⟵ پێش زەمینە (٢)** | |
| **پێشینی** | **apriori** |
| **پێکهاتە ⟵ بنەما** | |
| **پێکەنیندار؛ شۆخ؛ قەشمەر** | **humorous** |
| **پێکەنینی تاڵ ⟵ تەنزی ڕەش** | |
| **پێگەی سووژە؛ شوێنگەی زەین** | **subject position** |
| **پیلان (گێڕان)** | **intrigue** |
| **پێوەرناسی** | **criteriology** |
| **پێوەند؛ پێوەندی** | **relation** |
| **پێوەندارانە** | **relational** |
| **پێوەندی** | **communication** |
| **پێوەندیدارانە** | **communicational** |

1- Shethes by Boz.
2- Harold Pinter (1930- )
3- The Last Bus.



| | |
|---|---|
| **پەیوەندی شکێنی** | **parataxis** |
| **پێوەندی نێوان ناسکار و بەرناس** | **subject - object relation** |
| **پێوەندییەکانی هێز؛ پێوەندییەکانی دەسەڵات** | **power relations** |

## تێ

| | |
|---|---|
| sect | تاقم |
| sectarian | تاقمخواز |

**تاقیکاری ⟵ ئەزموون**

| | |
|---|---|
| formal expriment | تاقیکاریی فۆرمی؛ تاقیکاریی شێوەیی |
| individual | تاک؛ تاکەکەس |
| individuality | تاکایەتی؛ تاکێتی |
| monologue | تاکبێژی |

**dramatic monologue** — **تاکبێژیی شانۆیی**

(تاکبێژی) بریتییە لە ئاخاوتەیەکی دوور و درێژ کە لەلایەن تاکە کەسێکەوە و لە شانۆیەکدا ئاراستە ئەکرێ. بەڵام تاکبێژی شانۆیی نەک هەر پەیوەندی بەشانۆ و شانۆنامەوە نییە، بەڵکو جۆرێ شیعری غینایییە کە لەسەر دەستی ڕابێرت براونینگ[1] بەکامڵی داهێنرا و بەکارهێنرا. تاکبێژیی شانۆیی بەگشتی هەڵگری ئەم تایبەتمەندیانەی خوارەوەیە: یەکەم ئەوەی کە تاکەکەسێک کە خودی شاعیر نییە سەرجەم شیعرەکە لە بارودۆخێکی تایبەت و ساتەوەختێکی ناسکدا دەردەبڕێ؛ دووەم ئەوەی کە ئەم تاکەکەسە کە بێژەری شیعرەکەیە کەس یان کەسانێکی دیکە دەکاتە بەردەنگ و لەگەڵیاندا دەپەیڤێ، ئەوەش کە ئەبێتە هۆی تێگەیشتنی ئێمە لە ئامادەبوون و هەڵسوکەوتی بیسەرانی بێژەری شیعرەکە تەنیا لە ڕێگەی گوتەی بێژەری شیعرەکەوەیە؛ سێیەم سەرەکیترین و گرنگترین بنەواشەی ڕاگری پێکهاتە و هەڵبژاردەکانی شیعرەکە ئەوەیە کە بێژەر هەوڵ دەدا کەسایەتی و باری دەروونی خۆی بۆ خوێنەر دەربخا.

تاکبێژیی شانۆیی لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا هاتە ئاراوە پاشان چەند شاعیرێکی

1- Robert Browning (1812 - 1889).



بەناوبانگی ئینگلیزی و ئەمریکایی وەک تێنیسۆن[1]، ڕابێرت فراست[2] و ئێزراپاوەند ئەم قاڵبە شیعرییەیان بەکارهێنا. ڕەنگە ناسراوترین تاکبێژیی شانۆیی هاوچەرخ و مۆدێرن شیعری سترانی ئەوینی جەی ئاڵفرێد پروفراک بێت کە بەرهەمی تی ئێس ئیلیۆت[3]ـە.

**interior monologue** — **تاکبێژیی ناوەکی**

تاکبێژیی ناوەکی هەندێ جار لەلایەن تاقمێ ڕەخنەگرەوە لە بری زاراوەی (شەپۆلی هۆشیاری) بەکارئەهێنرێ، بەڵام بەبڕوای زۆربەی کارناسان شەپۆلی هۆشیاری پتر زاراوەیەکی گشتگیرە کە کۆی ئەو ڕێگە جیاجیایانە ئەگرێتەوە کە لەلایەن نووسەرانەوە و بەمەبەستی پێشاندان و نواندنەوەی بار و ڕەوتی هۆشیاری لە کەسێتیەکەدا بەکار ئەبرێن. کەواتە، بەپێی ئەو وتانەی سەرەوە، (تاکبێژیی ناوەکی) ئەو چەشنە شەپۆلی هۆشیارییە کە هەوڵ دەدا هەلومەرج و باری هۆشیاری ڕێوڕاست لە ساتەوەختی بەدیهاتنیدا و لە مێشکی کەسایەتیەکەدا بنوێنێتەوە. لە تاکبێژی ناوەکیدا دانەر دەست لە ڕەوتی دەروونی و تاقمی ڕستەکان یان جۆری جیاوازی ڕێزمان وەرنادات و ئەگەریش وانەبێ، ئەوە تا ڕادەیەکی زۆر کەم جی پەنجەی دانەر بەسەر دەقەکەوە دیارە. هەڵبەت تاکبێژی ناوەکی لە شێوە ڕادیکاڵەکەی خۆیدا بڕێ جار وەکو نواندنەوەی تەواو کامڵی ڕەوتی هۆشیاری دەستنیشان ئەکرێت، بەڵام لەبەرئەوەی کە ئاشکرایە وێنا دەروونییەکان و تێگەیینەکان و هەستەکان و چەند لایەنێکی بیر بۆ خۆیان نا زمانین، کەواتە نووسەر ئەو توخمانە تەنیا لە ڕێگەی گۆڕینیانەوە بۆ جۆرێک هاوتای زمانیی ئاراستە ئەکات. (بڕوانە شەپۆلی هۆشیاری)

**individualism** — **تاکخوازی**

تاکخوازی لە بنەڕەتدا تەعبیر لە بیرۆکەی هاوبەشی هەندێ قوتابخانەی فیکری و سیاسی سەردەمی پاش ڕۆنیسانس ئەکات کە پتر بەهۆی کاریگەرێتی فەلسەفەی ئەقڵخوازانەی سەرەتا و کۆتایی سەدەی حەڤدەهەمەوە سەری هەڵدا و، بەپێچەوانەوە، لە ئەدەبی ڕۆمانتیکی سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا و بەتایبەت لە شیعری غینایید بەلێشاو ڕەنگی دایەوە. تاکخوازی لە ڕاستیدا تیۆرێکی سیاسی، فیکری و ئەخلاقییە کە

1- Alfred Lord Tennyson (1809-1892).

2- Robert Frost (1874-1963).

3- T. S. Eliot (1888-1965).

بەختەوەری تاکەکەس وەکو دوائاکامی کردەی کۆمەڵایەتی و ژیان دائەنێ و بنەچەکەشی لەسەر ئەم گریمانەیە دامەزراوە کە گرنگیدان بەقازانج و بەرژەوەندییەکانی تاکەکەس لە ئەنجامدا ئەبێتە هۆی بەرژەوەندی کۆمەڵگا. تاکخوازی لە دوو بزووتنەوەی گەورەی زانستی و ئایینی سەدەگەلی پانزە و شانزەدا، واتە ڕۆنیسانس و ڕیفۆرماسیۆن، بەتەواوەتی بەکارهێنرا و بایەخی پێ درا. بەواتایەکی ڕوونتر دەوری تاک لە ئاییندا و پێوەندیی دوو لایەنەی نێوان خواوەند و تاکەکەس بەبێ ئامادەبوونی پاپ و کلیسای کاتۆلێک دەلالەت دەکاتە سەر گرنگایەتی تاکخوازی لە بزووتنەوەی ڕیفۆرماسیۆندا. لەلایەکی دیکەشەوە دەوری تاکەکەس لە توێژینەوە زانستییەکاندا و پێوەندیی نێوان تاکەکەس و بەرهەمەکانی سەردەمی کلاسیک (واتە، یۆنان و ڕۆمی کۆن) بەبێ ئامادەبوونی ڕاڤە چەوت و بەلارێدابەرەکانی سەردەمی چەرخەکانی ناوەڕاست دەوری تاکخوازی لە بزووتنەوەی زانستی ڕۆنێسانسدا دەخاتە ڕوو. چەمکی تاکخوازی سیستەمی سیاسی و حوکمداریە دیموکراتییەکان پێکدێنێ و لەسەر ئەم بیرە دامەزراوە کە مەبەستی سەرەکی حکوومەت دابینکردنی ئاسایشی تاکەکەس و لایەنگری لە مافەکانیەتی لە هەمبەر هێرش و دەستێوەردانی کەس یان تاقمەکانی دیکە؛ هەر بۆیەش هەندێ چەمک وەکو بەرژەوەندی تاقم و ئایین و قوتابخانەیەکی تایبەت کە سەرلەبەر تەعبیر لە بازنەیەکی کۆیی و ئەندامەوار و چەندکەس ئەکەن لێرەدا بەهیچ شێوەیەک بایەخیان نادرێتێ.

تیۆری تاکخوازی بەندە بەم ئەندێشەوە کە سەرەکیترین هێزی سیاسی هی جەماوەرە و هەموو تاکەکەسێک بۆ خۆی خاوەنی مافە سروشتیی و داگیرنەبووەکانی خۆیەتی. کەواتە، پێویستە هێزی حکوومەت بەرتەسک و سنووردار بکرێتەوە بەجۆرێک کە نەتوانێ هێرش بباتە سەر مافەکانی تاکەکەس. تاکخوازی، جگە لەو تایبەتمەندییانەی سەرەوە، کاری لە ئابووریی وڵاتەکانی ڕۆژئاوا کرد و لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا بەتایبەت لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا بیرۆکەی (لێزیفێر) کە دەلالەت دەکاتە سەر ئابووریی ئازاد و چالاکیی ئازادیی سەرمایەداری لەسەر تاکخوازی بنیاتنراو بەم چەشنە بیرۆکەی ئابووریی (مێرکانتیلیزم) پەیتا پەیتا لەناوچوو و تاکخوازی ئابووریی هاتە ئاراوە و لەگەڵ مسۆگەربوونی ئەو سیستەمە سیاسیانەی لەسەر گرنگایەتی تاکەکەس دامەزراون لیبرالیزمی ئابووریی نوێش پەرەی پێ درا.

تاکخوازی لە بوونناسی و ڕێڕەوناسیی و ئەخلاق و سیاسەدا بەماناگەلی جیاواز بەکار



ئەهێنرێ. لێرەدا تاکخوازی بەگشتی بریتییە لە ڕوانگەی ئەوانەی کە پێیان وایە تاکەکەس بناخەی هەموو هەقیقەتە بوونیەکانە. هەروەها بریتییە لەو ڕوانگەیەی کە پێی وایە دیاردە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکان هۆکردی چالاکی تاکەکەسین و ئامانجی کۆمەڵگا پاریزگاری کردنە لە بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکان. لە بوونناسیدا تاکخوازی بریتییە لەو بیرۆکەیەی کە وای بۆ ئەچێ بوونی ڕاستەقینە و هەقیقی هی تاکەکەس و پاژ و بابەتە تایبەتەکانە نەک هی بابەتە گشتییەکان و یان کۆمەڵگا. لە ڕێڕەوناسیدا تاکخوازی پەنجە دەخاتە سەر ئەو ڕێڕەوەی کە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان و واقیعە مێژووییەکان سەرلەبەر هۆکردی هۆکارە دەروونییە تاکەکەسییەکانن. بۆ نموونە، لێرەدا ئەکرێ ناو لە تیۆری تارد بەرین کە لە هەمبەریدا تیۆرەکەی دورکیم لە گۆڕێدایە و بەپێچەوانەوە لێرەدا ئەمە دیاردە کۆمەڵایەتییەکانن کە ئەبن بەخەسڵەتە جەوهەری و سەرەکییەکان. لە ئەخلاق و سیاسەتدا، تاکخوازی ئەو بیروڕایەیە کە پێی لەسەر بایەخی تاکەکەس لەچاو دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان دادەگرێ چونکە لێرەدا تاکەکەس ئەو دوامەبەست و دوائامانجەیە کە حکوومەت بۆ بەرژەوەندی و پێکهێنراوە. کەواتە لێرەدا ئامانجی هەرە بەرچاو و هەرە بەرزی سیاسەت بریتییە لە ئازادیی تاکەکەس و پێشکەوتنی بەهرە و تایبەتمەندییە جەوهەرییەکانی (وەک هێربێرت سپێنسێر پێی وایە). لە هەمبەر ئەم تیۆرانەدا ڕووبەڕووی ڕوانگە کۆخوازانەکان ئەبینەوە کە پێی لەسەر ڕەسەنایەتی و گرنگێتی کۆ دادەگرن (بەو چەشنەی ئەندێشەی هێگڵ و مارکسیستی بۆی دەچن).

ئەگەر تاکخوازی بەبیرۆکە و ڕوانگە و ڕێباز دابنێین، تاکێتی چەمکێکە لە فەلسەفەی بەر لە ڕۆنیسانسیشدا بەمانایەکی جیاواز لەوەی ئێستا بەکارهێنراوە. تاکێتی لە فەلسەفەی کۆندا تاڕادەیەکی زۆر لە چەمکی کەسایەتی نزیکە و زۆر فەلسەفەکاری کۆن ئەم دووچەمکەیان بەهاوواتا لە قەڵەم داوە. لە چەرخەکانی ناوەڕاستدا و بەکاریگەرێتی وەرگرتن لەو پێناسەیەی ئیبنی سینا بۆ تاکێتی، ئەم چەمکە بریتییە لە تایبەتمەندییە جەستەیی و یان ناوەکیەکانی مرۆڤ وەک سروشت و هەست و سەلیقەکان. کەچی لە فەلسەفەی مۆدیرندا ئەم دوو چەمکە بەتەواوەتی لێکدی جیاکراونەتەوە و لێرەدا تاکایەتی بەو مانایە بەکار ئەهێنرێ کە لە قوتابخانە تاکخوازانە جیاجیاکاندا بانگەشەی بۆ ئەکرێ وەک لە پێشدا ئاماژەی بۆ کرا.

**تاکدەنگ** — **monophone**

**تاکدەنگیی** — **monophony**

**تاکدەنگیانە** — **monophonic**

(بڕوانە پاش شێوەخوازی، میخاییل باختین)

**تاکسەروا** — **monorhyme**

تاکسەروا بەو شیعرە یان بەشێکی شیعرەکە ئەگوترێ لە هەموو دێرەکانیدا سەروای کۆتایی یەکێکە. ئەم چەشنە شیعرە پتر لە فۆلکلۆری گەلاندا ئەبینرێ و هەڵگری کێشی بڕگەییە. تاکسەروا لە ئەدەبی لاتینی و عەرەبی و ئیتالیدا نابینرێ و زۆتر دەلالەت ئەکاتە سەر ئەو شیعرە کۆن و لەمێژینانەی شارستانێتی مرۆڤ کە خاوەنی کێشێکی ڕەوان و سەروایەکی خۆش ئاهەنگن.

**تاکنووسی؛ نامیلکەی تاک** — **monograph (2)**

تاکنووسی لەم مانایەیدا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو وتار و یاخود نامیلکەیە کە لەسەر بابەتێکی تایبەت نووسراو.

**تاک واتا؛ تاک مانا** — **univocal**

**تایبەتبوونی کەسایەتی، ڕەوتی بیچمگیریی تاکایەتی** — **individuation**

تایبەتبوونی کەسایەتی زاراوەیەکە لە بنەڕەتدا لە تیۆرە سەرەکیەکەی کارڵ گوستاف یونگ[1]-ەوە وەرگیراوە و ئەو نەشونوما دەروونناسانەیەیە و ئەو ڕەوتەیە کە تیایدا تاک ئەو لایەنانەی کەسایەتی خۆی ئەدۆزێتەوە کە لە دیتران جیای ئەکاتەوە، واتە ئەو لایەنانەی خودی مرۆڤ کە لە ئەندامەکانی تری ڕەگەز و یاخود کۆمەڵی خۆی جیای ئەکاتەوە، واتە تایبەتبوونی کەسایەتی جۆرێ ڕەوتی ناسینە کە بەپێی ئەم تیۆرە تاک پێویستە بەشێوەیەکی هۆشیارانە ئەو لایەن و تایبەتمەندییە جیاجیایانەی خۆی بدۆزێتەوە کە بڕێکیان دڵخواز و بڕێکیشیان دڵخوازنین و کۆی ئەمانەش خودی گشتیی مرۆڤ پێکدەهێنن. ئەم خودناسینە کە لەم ڕەوتە مرۆڤ بەسەریدا تێدەپەڕێ پێویستی بەڕاستگۆیی و بوێری هەیە و، ئەگەر تاک بیەوێ لە ئەنجامدا ببێتە تاکێکی هاوڕێک و هاوسان لەباری دەروونییەوە پێویستە بەسەر ئەم خودناسینەدا تێپەڕێ. ئەم زاراوەیە و

1- Carl Gustar Jung (1875-1961).



زاراوەیەکی دیکە بەناوی دیهاوێژی دوو زاراوەی سەرەکی هاوکێشە دەروونناسانەکانی تیۆرەکەی یونگ پێکدەهێنن.

**تایبەتمەندیی ئەوپەڕ زمانناسانە** — **paralinguistic features**

(بڕوانە ئەوپەڕ زمانناسیی)

**تایبەتمەندیی کەسەکی؛ بڕوای کەسانی** — **idiosyncrasy**

**(هەڵسوکەوت و شێوازی) تایبەتی** — **idiosyncratic**

**تراژێدی؛ مەرگەسات** — **tragedy**

تراژێدی بەشێوەیەکی گشتی ئەو نواندنەوە ئەدەبی و بەتایبەت شانۆییانەی کردەوەگەلی گرنگ و جیددییە کە لە ئاکامدا دەرئەنجامێکی کارەساتاوی بۆ کەسێتی سەرەکی پێکدەهێنێ. ئەرەستوو یەکەم کەس بوو کە لە کتێبی بووتیقادا باسی تراژێدی کرد و، تیۆرەکەی لەسەر خوێندنەوەی تراژێدیاکانی شانۆنامەنووسانی کۆن و وەک ئیسکیلیۆس[1]، سۆفۆکلێس[2]، یۆریپدێس[3] دامەزراند. بەپێی وتەکانی ئەرەستوو تراژێدی بریتییە لە (لاسایی کردنەوەی کردەوەیەک کە جیددی و مەزن و تەواوە. ئەرەستوو چەند تایبەتمەندییەکی سەرەکی بۆ تراژێدی ناوبردە ئەکات و پێی وایە لە شەش توخمی کەسێتی، گەلاڵە، شوێنکات، ڕازاندنەوەی دیمەن، بیر، شێوازی داڕشتن کە لەناو ئەمانەدا (گەلاڵە) لە هەمووان گرنگترە... چونکە تراژێدی نەک هەر مرۆڤەکان بەڵکو کردەوە و ژیانیش پێشان ئەدات... تراژێدی بێ کردەوە نابێ بەڵام ئەتوانێ خاوەنی کەسایەتی نەبێت. ئەرەستوو هەر لەم کتێبەدا ئەڵێ تراژێدی ئەو بەرهەمە شانۆییەیە کە مرۆڤەکان باشتر لەوەی کە هەن پێشان ئەدات و لە ڕێگەی زمانی شاعیرانەوە و بەشێوازێکی دراماتیک نەک بەهۆی نواندنێکی گیرانەوەییەوە کردەکان لاسایی ئەکاتەوە کە لە کۆتاییدا ئەبێتە هۆی هەڵخڕاندنی بەزەیی و ترس کە لە ئەنجامدا پاکبوونەوەی ئەو هەستانەی بەدواوەیە. ئەرەستوو جگە لەم زاراوانە ئاماژە بۆ پاڵەوانی شانۆیی، هەڵەی دادوەری و لاوازی تراژیک ئەکات. هەروەها، لە پێناسەی تراژێدیدا لەسەر ئەو ڕایەیە کە ئەبێ بەرهەمی شانۆیی هەڵگری یەکیەتیگەلی شوێن و کات و کردە بێت.

1- Aeschylus (525-456 B. C.).

2- Sophocles (496 - 406 B. C.).

3- Euripides (480-400 B. C.).

لەلایەکی دیکەوە، تراژێدی وەکو زاراوەیەکی لە بنەڕەتدا یۆنانی بەمانای گۆرانی بزن بەکارهێنراوە کە ئەم ناولێنانەش ئەگەڕێتەوە بۆ قوربانیکردنی ئەو بزنانە لە فستیڤاڵی دایۆنیزۆسدا کە هەموو ساڵێک لە کۆتایی زستان و سەرەتای بەهاردا بەڕێوە ئەچوو. هەر بۆیەش لەم ڕوانگەیەوە ئەکرێ بەپێی بۆچوونێکی ئوستوورەناسانە باسی تراژێدی بکرێ. کە تیایدا بەردەوام پاڵەوانی تراژیک بەهۆی لاوازی تراژیکەوە قوربانی ئەبێت و، ئەم پاڵەوانە لە شانۆ تراژیکەکانی سەردەمی کلاسیک و ڕۆنێسانسدا ئینسانێکی پایەبەرز لە ڕواڵەتی پاشا، شازادە، جەنگاوەر و لێهاتوودا دەرئەکەوێ، کەچی لە شانۆی تراژیکی سەردەمی هاوچەرخدا پاڵەوانی تراژیک ئەتوانێ ئەندامێکی ئاسایی کۆمەڵگای مرۆیی بیت. تراژێدی بەگشتی لە چوار قۆناغی مێژووی شارستانێتی ڕۆژئاوادا گەشەی کردووە کە بریتین لە یۆنانی کۆن، ڕۆمی کۆن، ڕۆنێسانس و سەردەمی هاوچەرخ. لە سەردەمەکانی تری وەک چەرخەکانی ناوەڕاست و یان سەدەگەلی هەژدەهەم و نۆزدەهەم تراژێدی پەرەیەکی بەرچاوی نەستاند. بەڵام لە سەردەمەکانی دیکەدا هەر بەرهەمە تراژیکە و تایبەتمەندی جیاوازی خۆی هەیە کە لە ئەنجامدا بوو بەهۆی بەدیهاتنی چەندین جۆر تراژێدی.

تراژێدی ئەو شانۆیەیە کە بەختەوەریی و ناکامیی پاڵەوانی تراژیک ئەخاتە ڕوو و، لە کۆتاییدا چارەڕەشی و پاشان لەناوچوونی ئەو پاڵەوانە بەهۆی هەندێ خاڵی لاوازی کەسایەتی ئەوەوە دەرئەخا. ئەم لاوازییە ئەتوانێ بەهۆی شێوەگەلی خۆبەزلزانین، چاوچنۆکی و کەمتەرخەمییەوە لە کەسایەتی پاڵەوانی تراژیکدا دەرکەوێ. تراژێدی ئەو کارەساتەیە کە دێتە سەر ڕێگای ئەو کەسانەی کە کەموکوڕیەکانیان لە پێوانەیەکی گەورەتردا و بەشێوەیەکی هێمایین ئەنوێندرێ. لەلایەکی دیکەوە تراژێدی ئەکرێ بەچەشنێ هەڵوێست لە هەمبەر خوا و سروشت و چارەنووس و ڕۆژگار یان ڕێکەوتەکان دابندرێ. تراژێدی هاوارێکە لە بەرامبەر ئەو بارودۆخە تراژیکەوە کە پاڵەوانی تراژیک وەکو مرۆڤێک تیایدا جێگیر بووە. زاڵیەتی و کاریگەرێتی خواکان و بیری ئوستوورەناسانە لە ژیانی مرۆڤی سەردەمی کلاسیکدا لەلایەکەوە و، ژیانی کارەساتاوی و تراژیکی عیسا پێغەمبەر بەتایبەت بەو چەشنەی قەشەکانی چەرخەکانی ناوەڕاست ئەیانگێڕایەوە بەدوو هۆکاری پەرەسەندن و گەشەکردنی تراژێدی لە ڕۆنێسانسی ئەورووپیدا دادەندرێن.

**tragi - comedy** **تراژی – کۆمێدی**

ئەگەر بمانەوێ پێناسەیەکی کورتی تراژی – کۆمێدی بکەین ئەبێ بڵێین تراژی – کۆمێدی ئەو بەرهەمە شانۆییەیە کە هەڵگری گەلاڵەیەکی تراژیک و کۆتاییەکی کۆمیکە.



ئەگەرچی هەندێ کەس پێیان وایە کە ئەم چەشنە ئەدەبیە هەر لە یۆنانی کۆنەوە لە گۆڕێدا بووە، بەڵام بەشێوەیەکی ڕاستەقینە لە ڕۆنێسانسدا هاتە ئاراوە و لە ئەدەبی ئینگلیزی و فەرەنسی و ئیتاڵیدا ڕەنگی دایەوە. ئەم بەرهەمانە زۆربەی کات خاوەنی گەلاڵەیەکی سەرەکی و چەندین گەلاڵەی لاوەکیی بوون و بەسەر دوو بەشی کلاسیک و جەماوەر پەسنددا دابەش دەبێت. لە کۆتایی سەدەی شانزدەهەمدا بەکارهێنانی پشووی پێکەنین لە تراژێدیدا و گەلاڵەی تراژیک لە کۆمیدیدا ئەم دوو ژێر چەشنە سەرەکییەی شانۆ، واتە تراژێدی و کۆمێدی لێکدی نزیک بوونەوە.

لە ئەدەبی ئینگلیزیدا شکسپیر و لە ئەدەبی ئیتاڵیدا گوارینی و لە ئەدەبی فەرەنسیشدا کارنیە ئەو شانۆنامەنووسانەن کە بەرهەمە تراژی – کۆمیکەکانیان پتر ناسراوە. تراژی – کۆمێدیە بەرچاوەکانی شکسپیر بریتین لە چیرۆکی زستانی[١]، سیمبلین[٢] و تۆفان[٣]. لە ئەدەبی فەرەنسیشدا لە نیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەهەمدا پتر لە دووسەد تراژی – کۆمێدی بەرهەم هێنرا وەک جەماوەر بێز (١٦٦٦) بەرهەمی موولیێر و دۆنسانچێ دووئاراگۆن (١٦٤٩) بەرهەمی کۆرنی[٤].

تراژی – کۆمێدی لەو ڕووەوە کە هەڵگری هەردوو لایەنی خۆشی و ناخۆشی ژیانە و بەپێچەوانەی تراژێدی یان کۆمێدی تەنیا پێ لەسەر یەکێکیان داناگرێ زۆرتر لە واقیع نزیکە و لەچاو بەرهەمە شانۆییەکانی تر جەماوەر پەسندترە.

**domestic tragedy** **تراژێدیی بنەماڵە، تراژێدی چینی ناڤین**

تا کۆتایی سەدەی حەڤدەهەم زۆربەی تراژێدیەکان بەزمانی شیعر ئەنووسران و پاڵەوانی بەرهەمەکەش مرۆڤێکی پایەبەرز بوو کە بەسەرهاتەکەی چارەنووسی گەلێکی دیاری ئەکرد. بەڵام لە سەدەی هەژدەهەمدا چەند شانۆنامەنووسێک تراژێدی بنەماڵە یان بورژوازییان بەرهەم هێنا کە بەزمانی پەخشان ئەنووسرا و کەسێتی سەرەکی ئەم بەرهەمانەش مرۆڤێکی ئاسایی چینی ناڤین یان خوارووی کۆمەڵگا بوون کە بەهۆی کارەساتێکی بنەماڵەیی و ئاشناوە ئازاری ئەکێشا. بەکورتی، تراژێدی بنەماڵە ئەو شانۆیەیە کە تیشک ئەخاتە سەر ژیان و باری کۆمەڵایەتی چینی خواروو و ناڤینی

1- Winter Tase.

2- Cymbeline.

3- The Tempest.

4- Pier Corneille (1606-1684).

کۆمەڵگا و لەوانەشە لە هەندێ توخمی بنەماڵەیی و کەسەکی تراژیدی بکۆڵێتەوە و ئەمەش ڕێوڕاست بەپێچەوانەی تراژیدی لە مانا ڕەسەنەکەیدایە کە تیایدا کەسێتییە سەرەکییەکان لە پاشا و شازادە و مرۆڤە پایەبەرزەکان پێکدێن، باشترین نموونە بەرهەمێکی جۆرج لیلۆ-یە، بەناوی بازرگانی لەندەن: یان مێژووی جۆرج بارنوێل (١٧٣١).

لەوکاتەوە چەندین تراژیدی سەرکەوتوو بەزمانی پەخشان نووسراون و پاڵەوان یان پیاوی ئەو بەرهەمانە لە چینی ناڤین و تەنانەت برێ جار لە چینی کرێکاری کۆمەڵگا هەڵبژێردراون. یەکێ لە تراژیدیە مۆدێرنە سەرنجڕاکێشەکان بەرهەمێکی ئارتور میلێر-ە، بەناوی مەرگی دەستفرۆش (١٩٤٩)، کە کێشە کەسەکییەکان یان کێشەکانی نێوان ئەندامانی بنەماڵەیەک ئەکۆڵێتەوە وەک کێشەی نێوان باوک و کوڕ یان کێشەی نێوان دوو برا. هەڵبەت هەندێ ڕەخنەکار پێیان وایە لە پێناسەکردنی تراژیدیی بنەماڵەدا تەنیا پێویستە چەشنی کێشەکان ڕەچاو بکرێ و ئیدی زمانی بەرهەمەکە دەورێکی بەرچاو لەم پۆلێنبەندییەدا ناگێڕێ. بۆ نموونە، هەندێ نووسەر شانۆنامەی ئۆتێللۆی بەرهەمی شکسپیر بەتراژیدیەکی بنەماڵە لە قەڵەم دەدەن چونکە لە کێشەی نێوان ئۆتێللۆ و هاوسەرەکەی واتە دێزدێمونا ئەکۆڵێتەوە بەزمانێکی شاعیرانە و دەوڵەمەندیش نووسراوە.

**تراژیدیی بورژوازی** **bourgeois tragedy**

(بڕوانەی تراژیدیی بنەماڵە)

**تراژیدیی پاشاکان** **imperial tragedy**

**تراژیدیی تۆڵە** **revenge tragedy**

تراژیدیی تۆڵە، کە هەندێ جار بەشێوە هەستئامێزەکەی ئەم چەشنە تراژیدییە تراژیدیی خوێنی پێ دەڵێن، لە ڕاستیدا بەهۆی کارگەرێتی بەرهەمەکانی سێنیکا[1] و هاتە ئاراوە، کە بەشانۆنامەنووسێکی گەورەی ڕۆمی کۆن ئەژمێردرێ. ماکە دڵخوازەکانی سێنیکا لەسەر سەکۆی شانۆ بریتی بوون لە کوشتن، تۆڵە، ڕۆح و... بەڵام سێنیکا ئەم بابەتانەی بەشێوەکی گێڕدەوەیی و بەرچاو نەدەنواندەوە، بەڵکوو ئەم ڕووداوانەی لە زاری هەواڵهێنێنکەوە و لە دەقێکی دوور و درێژدا ئەگێڕایەوە، بەڵام شانۆنامەنووسانی سەردەمی ئێلیزابت (کۆتایی سەدەی شانزە و سەرەتای سەدەی حەڤدە) ئەم ڕووداوانەیان

1- Seneca (4 B. C. - A. D. 65).



لەسەر سەکۆ ئەنواندنەوە تاکو بەردەنگی هاوچەرخی خۆیان لە توندوتیژی و ترس و دڵەڕاوکێ تێر بکەن. کەواتە شانۆی تۆڵە ئەو شانۆ باوەی سەردەمی ئێلیزابتە کە تیایدا هەندێ توخمی داچڵەکێنەر و تۆقێنەری وەک کوشتن، خوێنڕشتن و کوێرکردن و ئامادەبوونی ڕۆحەکان ئەبیندرێ. لە شانۆی تۆڵەدا، هەروەک بەناوەکەیدا دیارە، گەڵاڵەی بەرهەمەکە لە ڕێگەی پەیجووری و سۆراغکردنی تۆڵەیەکەوە بنیات ئەنرێ و تایبەتمەندییە سەرەکییەکان بریتین لە:

١- کەسێک ئەکوژرێ و ڕۆحەکەی بۆ هاورێ یان خزمێکی خۆی دێتەوە تاکو تۆڵەی بۆ بسێنێتەوە.

٢- تۆڵە لێرەدا وەکو ئەرکێکی پیرۆز دادەندرێ و نەک بەعەدالەتێکی وەحشیانە. تۆڵە ئەستێن بەهۆی هەست پێ کردنی ئەم ئەرکە پیرۆزەوە تۆڵەکە بەئەرکی سەرشانی خۆی دادەنێ.

٣- لەم شانۆیەدا هەست بەگەلێک ترس و دڵەخورپێ و سەرسامیی ئەکرێ کە هەندێکیان هەستاوین. ئەم ترسانە بەهۆی دەرکەوتنی سەرلەنوێی ڕۆحەکەوە پەرە ئەستێنێ.

٤- لە کۆتایی ئەم شانۆیەدا چەند کەسێک ئەکوژرێ و سەکۆی شانۆ پڕ ئەبێ لە تەرمی کوژراوەکان.

٥-لە باری زمانیشەوە ئەو وشە و وێنە دیداریانەی تەعبیر لە توندوتیژی و ترس ئەکەن زۆرن.

٦- بینەران و بەردەنگەکان هەست بەهاوسۆزی لەگەڵ تۆڵە ئەستێن ئەکەن.

یەکەمین تراژیدی تۆڵە لە ئەدەبی ئینگلیزیدا بەرهەمێکە بەناوی تراژیدیی ئیسپانیایی نووسینی تامزکیت، کە لێوانلێوە لە ئامادەبوونی ڕۆح، خۆکوژی، شێتی، دیمەنی هەستاوی و کۆتاییەکی خوێناوی. گەڵاڵەی ئەم بەرهەمە لەسەر کوشتنێک و گەڕان و هەوڵ بۆ تۆڵەسەندنەوە دامەزراوە. جگە لەم بەرهەمە جوولەکەی ماڵتا **١٥٩٢** بەرهەمی کریستۆفێر مارلۆ[1] وتیتوس ئاندرۆنیکوس[2] **١٥٩٠** بەرهەمی شکسپیر بەتراژیدیی تۆڵە دادەنرێن. بەڵام، سەرەڕای ئەم بەرهەمانە ڕەنگە ناسراوترین تراژیدیی تۆڵە ئاسەوارە ناوازەکەی شکسپیر واتە هاملێت بێت.

1- Cristopher Marlowe (1564-1593).

2- Titus Andronicus.

**تراژێدیی چارەنووس** **tragedy of fate**

(بڕوانە تەوسی جیهانی)

**تراژێدیی چینی ناڤین ← تراژێدیی بنەماڵە**

**تراژێدیی خوێن** **tragedy of blood**

(بڕوانە تراژێدیی تۆڵە)

**تراژێدیی یۆنانی** **Greek tragedy**

تراژێدیی یۆنانی لەسەر بناخەیەکی کەم تا زۆر ڕوون و یەکگرتوو دامەزرابوو. پاڵەوانی تراژیک مرۆڤی پلەوپایە بەرز بوو کە بەردەوام یەکێ لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی کەسایەتییەکی لاوازیی تراژیک بوو. ئەم لاوازییە پتر خۆی لە ڕواڵەتی هەڵەی دادوەری یان خۆ بەزلزانیدا ئەبینییەوە کە لە ئەنجامدا ئەبوو بەهۆی لەناوچوونی پاڵەوانی تراژیک. گەلاڵەی تراژێدیی یۆنانی لە چوار بەشی سەرەکی پێکدێ کە بریتین لە:

١- پرۆلۆگ یان پێشگووتن.

٢- پارۆدۆس یان هاتنە ناوی گرووپی کۆر.

٣- ئیپیزۆدیا، واتە بەشە لاوەکیەکانی ڕووداوی سەرەکی شانۆ.

٤- ئێگزۆدۆس و ئەنجام.

لە یۆنانی کۆندا سێ تراژێدیی نووسی گەورە ئامادەبوون. یەکەمیان ئیسکیلیس-ە کە بەلانی کەمەوە حەفتا و دوو شانۆنامەی نووسیوە هەر حەوتیان ماون. لەو حەوتەش مێژووی نووسینی دووانیان نادیارە. بەرهەمەکانی بریتین لە حەوت پاڵەوان دژی تێبت (٤٦٧ پ.ز)، پارسەکان (٤٧٢ پ.ز)، پاڕانەوەکان، پرۆمیتەی دیل و شانۆنامەیەکی سیانە بەناوی ئۆرێستیا (٤٥٥ پ.ز) کە بۆ خۆی لە سێ شانۆنامەی دیکە بەناوی ئاگامێمنۆن، شەراب هێنەرەکان و فیوریەکان پێکهاتووە. ئەم بەرهەمەی دوایی، واتە سیانەی ئۆرێستیا ناسراوترین بەرهەم و شاکاری ئەدەبی ئیسکیلیسە.

دووەمین تراژێدیی نووسی گەورەی یۆنانی کۆن لەباری مێژووییەوە سۆفۆکل-ە کە ئەرەستوو لە بووتیقادا ئاماژەی پێ دەکا و ئەمرۆکەش بەگەورەترین شانۆنامەنووسی ئەو سەردەمە دادەنرێ. ناسراوترین بەرهەمی سۆفۆکل سیانەی ئۆدیپ پاشایە.

دواترین تراژێدیی نووسی گەورەی یۆنانی کۆن یوریپید-ە کە بەرهەمەکانی لەچاو بەرهەمەکانی سۆفۆکلدا لەکاتی خۆیدا پێشوازییەکی باشی لێ نەکرا بەڵام دواتر گرنگیان



پێ درا. بەرهەمەکانی یوریپید خاوەنی هونەر و پتەوێتیەکەی بەرهەمەکانی سۆفۆکل نین و لەبری ئەمانە هەڵگری چەشنێ ڕیالیزمی دەروونناسانە کە پتر بەرەو لای مێلۆدراما دەچێ. یوریپید سەرجەم نەوەد و دوو شانۆنامەی نووسیوە کە بەرهەمە بەناوبانگەکانی بریتین لە ژنانی تراوا (٤١٥ پ.ز) مێدێئا (٤٣٨ پ.ز)، هیپۆلیتۆس (٤٢٨ پ.ز) و ئێلیکترا کە ساڵی نووسینەکەی نادیارە.

**توانای دەرخستنی جیاوازی (نێوان کردە و هێمای دیتەنی)** **historianic sensibility**

**توانایی نەگەتیڤ؛ توانایی نەرێیانە** **nagative capability**

ئەم زاراوەیە لەلایەن شاعیری ڕۆمانتیکی ئینگلیزییەوە، جان کیتس[1] و، لە نامەیەکیدا لە ساڵی ١٨١٧ ئاراستە و پێناسە کرا. بەپێی نووسراوەکەی کیتس توانایی نەگەتیڤ ئەو تایبەتمەندیەیە (کە شکسپیر تا ڕادەیەکی زۆر هەیبوو - واتە توانایی نەگەتیڤ، بەو مانایەی کە کاتێ مرۆڤ توانای ئەوەی هەبێ لە نادیاری و ڕەمز و ڕاز و شک و گوماندا ژیان بەسەر بەرێت بەبێ ئەوەی کە بەتووڕەییەوە بەدوای واقیع و بەڵگە و هۆدا بگەڕێ». کیتس ئەم تایبەتمەندییەی سەرەوەی لە بەرامبەر نووسینەکانی شاعیرێکی دیکەی هاوچەرخی خۆی بەناوی کالێریج دادەنا کە بەبڕوای کیتس، ئەو بەرهەمانە بەزانیاری نیوەچڵەوە توانای تیشک خستنە سەر ناوەڕۆکیان نییە، چونکە کیتس پێی وایە و بەم بنەواشە گشتییە گەیشت کە (لە بەرهەمی شاعیرێکی مەزندا هەستی جوانی بەسەر هەموو سەرنجەکانی تردا زاڵ دەبێت و یان هەر ئەم هەستە هەموو سەرنجەکانی دیکە پشتگوێ ئەخات). ئەم زاراوەیە بۆتە هۆی بەدیهاتنی زۆر بیروڕا و مشتومڕی ڕەخنەگرانە. ئەکرێ کۆی باسە پەیوەندیدارەکان بەم زاراوەیەوە لە دوو خاڵدا کورت بکرێنەوە:

١- توانایی نەگەتیڤ تەعبیر لەو دانەرە بابەتیانە و ناکەسەکیە ئەکات کە مەودای جوانیناسانە بەدی ئەهێنێ؛ ئەمەش بەپێچەوانەی ئەو دانەرە زەینیە کە بەشێوەیەکی کەسەکی چۆتە ناخی بەرهەمێکی ئەدەبیەوە؛ هەروەهاش بەپێچەوانەی ئەو دانەرەوە کە بەمەبەستی سەپاندنی بیروڕا کەسەکیەکانی خۆی ئەنووسێ.

٢- ئەم زاراوەیە ئەوەش ئەگەیەنێ کە بابەت و چەمک و کەسێتییە ئەدەبیەکان ئەگەر لە فۆرمێکی هونەری جواندا بەکاربهێنرێن ئیدی بەند نابن بەپێوانە گشتی و ئاساییەکانی هەقیقەت و ئەخلاقەوە.

1- John Keats (1795 - 1821).

**توانست** — **competence**

توانست زاراوەیەکی زمانناسانەیە و لە ڕێزمانی گۆڕانی - زایشتیدا بەمانای ئەو ڕێزمانە ناوەکیەی مێشکی مرۆڤە. ئەمە بەمانای توانایی مرۆڤە بۆ بەرهەمهێنان و تێگەیشتنی ڕستەکان کە ئەو ڕستانەش ئەگرێتەوە کە پێشتر نەبیستراون. هەروەهاش ئەم زاراوەیە دەلالەت دەکاتە سەر زانیاری مرۆڤ لەسەر ئەوەی کە ڕستەکانی زمانێکی تایبەت کامانەن و کامانە نین. بۆ نموونە کوردزمانێک ئەتوانێ ئەو خاڵە لێک بداتەوە کە ڕستەی «ئەمەوێ بچمە ماڵەوە» ڕستەیەکی کوردییە، کەچی ئەشزانێ ڕستەیەکی وەکو (ویستن ماڵەوە چوون) ڕستەیەکی کوردی نییە با ئەگەر سەرجەم وشەکانیشی کوردی بن. کەواتە توانست ئەو تایبەتمەندی و زانیارییە ناوەکیەی مێشکی مرۆڤە کە لەسەر زمانی زگماکی خۆی هەیەتی. ئەم زاراوەیە بەردەوام لەگەڵ زاراوەیەکی تر بەناوی نواندن (کردەی دەربڕین) بەکارئەهێنرێ.

**توخم** — **element**

**تۆفان و گوشار** — **strum and drang (Gr.)**

ئەم دەستەواژە ئەڵمانیە بۆ ئەو بزووتنەوە ئەدەبیە شۆڕشگێڕانەیەی ئەڵمانی کۆتایی سەدەی هەژدەهەم بەکارئەهێنرێ کە زۆربەی کەسایەتیە بەرچاوە ئەڵمانییەکانی ئەو سەردەمە تیایدا بەشدار بوون. هەڵبەت هەندێ ڕەخنەگر پێیان وایە ئەم کەش و هەوا ئەدەبی و ڕۆشنبیرییە نزیکەی سەد ساڵی خایاند و، هەندێ کەسی تر بەشێوەیەکی وردەکارانە ماوەی نێوان ساڵەکانی ١٧٣٢ تا ١٨٣١ بەسەردەمی تۆفان و گوشار دائەنێن ئەم بزاڤە ڕۆشنبیرییە وەکو بزاڤێکی بەر لە ڕۆمانتیک دادەنرێ و لە تەشقی ئەقڵخوازیی سەدەی هەژدەهەمدا هاتە کایەوە و هەر بۆیەش هەندێ نووسەر پێیان وایە کە ئەدەبی قوتابخانەی ڕۆمانتیک پێش فەرەنسا و ئینگلتەرا لە ئەڵمان و بەهۆی ئەم بزاڤەوە سەری هەڵدا. لایەنگرانی ئەم بزووتنەوەیە لە باری یاسا و ڕێسا و ئەدەبیەکانەوە دژی سیسیزم بوون و تەنانەت بۆچوونی دژە ڕۆشنگەریشیان هەبوو، ئیلهامیان لەچاو ئەقڵ و بەڵگە بەباشتر دەزانی.

**توێژینەوە کولتوورییەکان ◄—— لێکۆڵینەوە کولتووریەکان**

**توێکاری؛ شیکاریی لۆژیکی** — **anatomy**

**توێکاری ڕەخنە** — **anatomy of criticism**



**تەئویل؛ لێکدانەوە** — **interpretation**

**تەوئیلکار؛ لێکدەرەوە** — **interpreter**

**تەبایی پیتەکان؛ تەبایی وشەکان** — **euphony**

ئەم زاراوەیە لە بنەڕەتدا بەمانای شیرینی و نەرمی دەنگ بەکار ئەهێنرێ. لە ئەدەبدا دەلالەت ئەکاتە سەر ئەو زمانەی تیایدا دەنگە خۆش ئاهەنگ و نەرمەکان تایبەتمەندیەکی مۆسیقایی و ڕەوانیان بەخشیوە پێی. وەها تایبەتمەندییەک پتر لە ڕێگەی بەکارهێنانی پیتە دەنگدارە درێژەکانەوە بەرهەم ئەهێنرێ.

**تەریکایەتی بوونیانە (وجوودی)** — **existential isolation**

**تەشق** — **climax**

ئەگەرچی تەشق بەرلەوەی زاراوەیەکی ئەدەبی بێت ڕواڵەتی وشەیەکی ئاسایی هەیە، بەڵام لە ئەدەبدا و بەتایبەت لە چیرۆک و شانۆنامەدا و شێوە گێڕانەوەکانی دیکەدا بەو بەشەی گەلاڵەی بەرهەمەکە دەوترێ کە لە نێوان کردەوەی هەڵکشان و کردەوەی داکشان دایە و لە قەیرانەکەی دوا بەشی گەلاڵەی بەرهەمەکە نزیکە کە بەگرێ کردنەوە کۆتایی پێ دێت.

**تەکنیکی چەند پێوەندیی؛ تەکنیکی چەند هاوپێوەندی** — **polygluttural technique**

ئەم زاراوەیە بریتییە لە تەکنیکێکی مۆدێرنی ئەدەبی کە گەرچی لە هەندێ بەرهەمی ئەدەبی سەدەی نۆزدەهەمدا کەم تا کورت و بەدەگمەن بەکارهێنراوە، بەڵام پتر لە بەرهەمە ئەدەبیە مۆدێرنیستیەکاندا و بەتایبەت لە بەرهەمەکانی جەیمز جۆیسدا کەڵکی لێ وەرگیراوە و، ئەکرێ ئەوەش بوترێ کە خودی جۆیس ئەم تەکنیکەی بەچەشنێ داهێنا و لە بەرهەمە دواییەکانیدا و بەتایبەت لە ڕۆمانی هەستانەوەی فینیگەنەکان[1]-دا بەلێشاو سوودی لێ وەرگرتووە. ئەم تەکنیکە کە لە هونەری تێکەڵکاری وشەشەوە نزیکە واتە پێوەندی سازکردن لە نێوان دوو یان چەند وشەدا کە لە باری واتای مەبەستی نووسەرەوە لێک نزیکن یان نووسەر بەلێکدانی ئەو وشانەوە لە یەکدی نزیکیان ئەکاتەوە و لە ئاکامدا وشەیەکی نوێ و لێکدراو ساز ئەکات. بەم تێبینیەوە کە وشە نوێکە پێشتر لەناو زمانەکەی نووسەردا نەبووە.

تەکنیکی هاوپێوەندی یەکێکە لەو هونەرانەی کە بەرهەمی ئەدەبی دژوار دەکاتەوە.

---

1- Fenniyans wake

**تەکنیکی مەجازی؛ هونەری مەجازی** **trope**

**تەلمیح ⟵ تیلنیشان**

**تەمسیل** **allegory**

تەمسیل ئەو چیرۆکە گێڕانەوەییەیە کە تیایدا کەسایەتی و کردەوە و هەندێ جاریش شوێنکات نەک هەر بەڕواڵەت خاوەنی ئاستێکی ئاسایی و سەرەکی و جەماوەریی دەلالەتن، بەڵکو لە هەمان کاتیشدا تەعبیر لە کەسایەتی و چەمک و ڕووداوگەلێکی دووەمین و ژێرەکیش دەکەن. تەمسیل واتە ئەو بەرهەمەی کە پتر لە ڕواڵەتی گێڕانەوەدا دەرئەکەوێ و هەڵگری دوو ئاستی ڕواڵەتی و ناوەکیە و بەگشتی ڕووبەڕووی دوو جۆر تەمسیل ئەبینەوە:

١- تەمسیلی مێژوویی و سیاسی کە تیایدا ئەو کەسایەتی و کردەوانەی بەشێوەیەکی ئاسایی و جەماوەریی نوێندراون تەعبیر لە هەندێ کەسایەتی و ڕووداوی مێژوویی ئەکەن.

٢- تەمسیلی ئایدیاکان کە تیایدا کەسایەتییە ئاساییەکان چەمکە دەرهەستەکان ئەنوێننەوە و گەلاڵەی بەرهەمەکەش تیشک ئەخاتە سەر بیرۆکە و واتا و تێزێکی تایبەت. لە جۆری دووەمدا هونەری سەرەکی بەرهەمەکە بریتییە لە گیان بەخشین بەتاقمی وتەزا و چەمکی دەرهەستی وەک چاکە، خراپە، باری زەین، چەشنی ژیان و چەشنی کەسایەتی. لە تەمسیلە ئاشکرا و ڕاستەوخۆکاندا وەها کارێک لە ڕێگەی هەندێ ناوی تایبەتەوە بۆ کەسایەتی و شوێنەکان ئەنجام ئەدرێ. بۆ نموونە لە بەرهەمی گەشتی زیارەتکەر[1]دا، نووسینی جان بانیەن[2]، کە هاوکات بەیەکێ لە بەرچاوترین تەمسیلە (ئایینە)کانی ئەدەبی ئینگلیزی دادەنرێ، ناوی زۆر کەسایەتی و شوێن بەشێوەیەکی تەمسیلی و بەپێی ئامۆژگاریی ئایینی مەسیح و وتەکانی کتێبی ئینجیلی پیرۆز هەڵبژێردراوە.

تەمسیل ستراتیژییەکی گێڕانەوەییە کە ئەکرێ لەهەر شێوە چەشنێکی ئەدەبیدا بەکار ببرێ. بۆ نموونە گەشتی زیارەتکەر تەمسیلێکی ئایینی و ئەخلاقی و گێڕانەوەیە کە بەزمانی پەخشان؛ شاژنی پەرییەکان نووسینی ئێدمۆند سپێنسێر بەشێوەیەکی پسپۆڕانە و لە ڕۆمانسێکی شیعریدا تەمسیلگەلی ئەخلاقی، ئایینی، مێژوویی و سیاسی تێکەڵ کردووە؛ یان بەشی سێیەمی کتێبی سەفەرەکانی گالیڤێر نووسینی جاناتان سویفت، بۆ

1- Pilgrim's Progress.

2- John Bnnyan (1628-1688).



خۆی تەنزێکی تەمسیلییە کە دژی ڕێڕەوە وشک و ڕەق و تەقە زانستی و فەلسەفیەکان نووسراوە. لە چەرخەکانی ناوەڕاستدا تەمسیل شێوەیەکی دڵخوازی ئەدیبان بوو و بەتایبەت لە ئوسلوبێکدا بەناوی (خەون بینین) کەڵکی تەواو لە تەمسیل وەردەگیردرا؛ واتە ئەو ئوسلوبەی کە تیایدا گێڕەوە خەوی لێ ئەکەوتوو خەونێکی تەمسیلی ئەزموون ئەکرد. چەند نموونەیەکی سەرەکی بەکارهێنانی تەمسیل لە بەرهەمە بەرچاوەکانی چەرخەکانی ناوەڕاستدا بریتین لە کۆمێدی خواوەندی نووسینی دانتێ و پییێری جووتیار نووسینی ویلیام لەنگ لەند و بەرهەمێکی یەکەم شاعیری گەورەی ئینگلیزی چاسێر بەناونیشانی خانووی ناوبانگ. هەڵبەت هەر ئەم شێوە بەکارهێنانەی تەمسیل لە بەرهەمە ئەدەبییەکاندا لە سەدەی نۆزدە و بیستەمیشدا بەکارهێنراوە، وەک لە شاکارەکەی گۆتە بەناوی دکتۆر فۆست بەشی دووەم یان بەدیکردنی نموونەگەلێکی تەمسیل لە چیرۆک و ڕۆمانەکانی فرانتس کافکادا. تەمسیل بەچەندین چەشن دابەش ئەبێت وەک فابل، نموونەی ئەخلاقی و پەندەکان.

**تەمسیلی ئەشکەوت** **allegory of the cave**

تەمسیلی ئەشکەوت کە لە فەلسەفەی ئەفلاتووندا زۆر بەناوبانگە بابەتی سەرەتای بەشی حەوتەمی کتێبی کۆمارە. (سوقراتی) ئەفلاتوون پێی وایە کە هەموو خەڵک لە ماوەی ژیانیاندا وەک پێوەندیان لەپێدا بێت و لە ئەشکەوتێکی ژێر زەویدا بژین، جگە لە سێبەر و تارمایی شتەکان و تارمایی هەقیقەتی ئەو شتانە هیچی تر نابینن و نابیسن. تەنیا هەر فەیلەسووفەکان ئەتوانن خۆیان لەم تاریکییە دەرباز بکەن و بگەنە ڕووناکایی خۆری هەقیقەت و لە هەقیقەتی هەر شتێک بگەن. بەبڕوای ئەفلاتوون شتەکانی ناو دنیای واقیع تارماییەکن لە شتەکانی جیهانی ئیدە کە سەرچاوە و ڕەسەنن. شتەکانی دنیای واقیع هێز و توانای دەرکەوتنی خۆیان لە سەرچاوەکەی خۆیان واتە، لە ئیدەکەی خۆیان وەرئەگرن. بەتەعبیرێکی دیکە هەموو شتێکی دنیای واقیع بەتارماییەکانی ئەشکەوت و بەکۆپی ئیدەکانی خۆیان کە سەرچاوە و هەقیقەتی ڕاستەقینەی خۆیانن بەئەژمار دێن.

**تەمسیلی خەون؛ خەوننامە** **dream allegory**

**تەمسیلی نموونەگەل؛ تەمسیلی ئیدەکان** **allegory of Ideas**

**(بڕوانە تەمسیل و تەمسیلی ئەشکەوت)**

**تەنراوە** **texture**

**تەنراوەیی؛ دەقی** **textual**

**تەنز** ← **تیز**

**تەنزی ڕەش؛ پێکەنینی تاڵ** **black humor**

(بڕوانە کۆمیدی ڕەش)

**تەنشت** **tension**

لە ڕەخنەی ئەدەبیدا و بەتایبەت لە ڕەخنەی نوێی سیەکاندا و لە ئەمریکا وشەی تەنشت گرنگایەتی زۆری پێدرا و وەکو وشەیەکی هەڵسەنگێنەرانە و وەسفی چاوی لێ دەکرا. ئەم پێداگرییەش ئەگەڕێتەوە بۆ وتارێکی ڕەخنەگرێکی نوێ بەناوی ئالێن تەیت[١] بەناونیشانی (تەنشت لە شیعردا)[٢] لە کتێبی دەربارەی سنوورەکانی شیعر. بەڕوانین لە لۆژیکی هونەری و تەکنیکی و بەخستنەسەری دوو پێشگری (ناو) و (دەر) دوو زاراوەی ناو تەنشت و دەرتەنشت دێتە ئاراوە. ناو تەنشتی وشەیەک بریتییە لە کۆی ئەو تایبەتمەندییە دەرهەستانەی کە پێویستە

هەموو ئەو چشتانەی وشەکە بۆیان بەکار ئەبرێ هەیانبێ. لەلایەکی دیکەوە، دەرتەنشت وشەیەکە کۆی ئەو چشتە بەرهەستانە ئەگرێتەوە کە وشەکە بۆیان بەکارئەبرێ. بەبڕوای تەیت، مانای شیعری چاک «بریتییە لە تەنشتی شیعرەکە، واتە کۆی ئەو جەستە ڕێکخراوەی دەرتەنشت و ناو تەنشتەکان کە ئەتوانین لەو شیعرەدا بیان دۆزینەوە» لەو ڕستەی تەیت-دا وا تێدەگەین کە بەبڕوای ئەو شیعری چاک پێویست هەردوو بابەتی دەرهەست و بەرهەست و، بڕوای گشتی و وێنەسازی تایبەت لە هاماوێکی یەکگرتوودا بگرێتەوە.

تاقمێ ڕەخنەگری دیکە زاراوەی تەنشت بۆ دەستنیشانکردنی ئەو شیعرە بەکار ئەبەن کە تیایدا هەردوو بابەتی شێلگیرانە و تەوساوی پێکەوە و لە پەنای یەکدا بەکارهێنراون. هەندێ نووسەری تر تەنشت بەشێوەی پێکهاتەی گوشارە بەردراوەکان پێناسە ئەکەن. چەند نووسەرێکی دیکە تەنشت بەهارمۆنی خوازیارییە لێکدژەکان دادەنێن. تەنشت بەهەموو ئەو مانایانەی سەرەوە هەر ئەو هونەرە دڵخوازەی ڕەخنەگرانی نوێ بوو کە تاقمێکیان لە

1- Allen Tate.

2- Tension.



لێکدانی بیردۆزانەی ئەم وشەیە لەلایەن تەیتەوە دڵنیانەبوون و هەربۆیەش واژەی تەنشتیان بۆ تایبەتمەندیی ئەو شیعرە دادەنا کە تیایدا توخمەکان بەشێوەیەکی سفت و سۆڵ نەک شل پێکەوە پەیوەندییان هەیە.

**تەوس** **irony**

تەوس یان ئایرۆنی لە بنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانییە لە واژەی eironeia وەرگیراوە کە بەمانای (چاوپۆشی کردنی بەدرۆ) و (وانواندن) و (شاردنەوە) بەکارهێنراوە. لە کۆمیدی یۆنانی کۆندا یەکێ لە کەسایەتییەکان ناوی (eiron) بوو، بەمانای (ئەو کەسەی کەمتر لەوەی بیربکاتەوە قسە ئەکا). ئەم وشەیە لە کۆماری ئەفلاتووندا ناوی برا و، تا ڕادەیەک بەمانای (فریودانی خەڵک بەتەڕە زمانی و شاراوەییەوە) بەکارهاتووە. لە وتووێژەکانی ئەفلاتووندا سوقرات بۆ خۆی دەوری eiron یان فێڵباز ئەگێڕێ و خۆی لە نەزانی ئەدات و هەندێ پرسیاری ساکار و بەڕواڵەت بێ زیان ئاراستە ئەکات. لەلای ئەدیبە ڕۆمییەکان بەتایبەت سیسێرۆ[١] و کوینتیلیەن[٢]) تەوس وەکو هونەرێکی ئەدەبی و نوێکاری پێناسە ئەکرا و تیایدا مانا لەگەڵ خودی واژەکەدا تاڕادەیەکی زۆر لێکدژ بوون. لە سەرەتای ڕۆنێسانس و لە ئەدەبی ئینگلیزیدا تەوس بەم شێوەیە پێناسە دەکرا کە: تەوس لە ڕێزماندا ئەوەیە کە شتێک بێژین و پێچەوانەکەیمان بەلاوە مەبەست بێت. لە سەدەی هەژدەهەمدا ئەم هونەرە لەسەر دەستی شاعیر و نووسەرە گەورەکانی ئەدەبی ئینگلیزی و ئەورووپایی

بەکارهێنرا و لە کۆتایی هەمان سەدەدا فەلسەفەی ئەڵمانی و بەتایبەت شلێگل ئاوڕیان لەم هونەرە دایەوە. لە سەدەی نۆزدەهەمدا زۆربەی چەشنە سەرەکی و بەرچاوەکانی تەوس پۆلێنکاری کران بەڵام هەموو پێناسەکان بەشێوەیەک ناتەواو بوون. لە کاربردە ڕەخنەییە مۆدێرنەکانی ئەم زاراوەیەدا تەوس پتر واتە شاردنەوە و پشتگوێ خستنی ئەو شتەی لە ڕاستیدا مەبەستە، هەڵبەت نەک بەمەبەستی فریودانی خوێنەر، بەڵکو بۆ بەدیهێنانی ئاکام و کارێگەرێتییە هونەری و گوتەییەکان. بەواتایەکی دیکە، تەوس ئەو هونەرە گوتەییەیە کە پێچەوانە و دژ یان لایەنێکی تری مەبەستەکەی نووسەر بۆ خوێنەر دەرئەخا و، ئەمەش لە گوتەی کەسایەتیەکاندا یان لە دەنگی خودی نووسەرەکەدا یان لە بارودۆخ و

1- Cicero (106-43 B. C.).

2- Quintillian (35 - 100).

شوێنکاتێکی تایبەتدا دەرئەکەوێ و، دیارە لەهەر کام لەم ڕەهەندانەدا ناوی تایبەت و پێناسەی تایبەتی خۆی هەیە.

(بڕوانە جۆرەکانی تەوس)

**تەوساوی** **ironical**

**تەوسن، تەوساوی** **ironic**

**تەوسی بارودۆخ** **irony of situation**

تەوسی بارودۆخ واتە پێچەوانەی ئەوەی خوێنەر چاوەڕێی ئەکات لە (کۆتایی) بەرهەمەکەدا دەرئەکەوێ. بەواتایەکی ڕوونتر، خوێنەر چاوەڕوانی شتێکە و لە ئاکامدا ڕووبەڕووی شتێکی دیکە ئەبێتەوە. لە تەوسی بارودۆخدا خوێنەر وەک کەسێتییەکان لە ئاکامدا تووشی هەمان بێ بەختی و نادیاری ئەبن. نموونەی بەرچاوی تەوسی بارودۆخ لە زۆربەی بەرهەمەکانی چارلز دیکنزدا دەرئەکەوێ کە پێچەوانەی ئەوەی خوێنەر چاوەڕێی ئەکا لە ڕۆمانەکەدا دەرئەکەوێ. بۆ نموونە خوێنەر چاوەڕوانی ئەوە ئەکات کە منداڵان خەریکی یاریکردن بن و گەورەکان خەریکی کارکردن، کەچی لەم بەرهەمانەدا منداڵان کار ئەکەن و گەورەکان خەریکی یاری ئاغاواتین.

**تەوسی بنەمایی** **structural irony**

تەوسی بنەمایی: بەبڕوای ئیم ئێچ. ئابرامز[١] هەندێ بەرهەمی ئەدەبی تەوسی بنەمایی ئاراستە ئەکەن؛ واتە، دانەر لەجیاتی بەکارهێنانی تاکوتەرای تەوسی وشەیی، تایبەتمەندییەکی بنەمایی ئاراستە ئەکات کە دووفاقێتی مانا و هەڵسەنگاندن لە سەرانسەری بەرهەمەکەدا ڕائەگرێ. ئامرازێکی ئەدەبی ناسراوی ئەم جۆرە تەوسە بریتییە لە ئافراندنی پاڵەوانێکی گێلۆکە یان بێژەر و گێڕەوەیەکی گێلۆکە کە ساکاری و گەوجێتییەکەی وای لێ ئەکات کە سەبارەت بەهەندێ بابەتی ناو بەرهەمەکە بیروڕا و لێکدانەوەی خۆی دەرببڕێ کە خوێنەری شارەزا واتە ئەو خوێنەرەی بەشداری گۆشەنیگای نائاشکرای ئامادەبوونی دانەرانەیە لە پشت کەسایەتییە گێلۆکەکەوە – پێویستە بەردەوام ئەو بیروڕا و لێکدانەوانەی پاڵەوان یان گێڕەوە گێلۆکەکە بەردەوام بگۆڕێ یان ڕاست بکاتەوە. پێویستە ئەم جیاوازیەی نێوان تەوسی وشەیی و تەوسی بنەماخوازیی بدرکێندرێ کە تەوسی وشەیی بەندە بەزانیاری و ئاگاداربوونی مەبەستی تەوساوی بێژەرەوە کە بێژەر و خوێنەر هەردووک تیایدا بەشدارن؛ کەچی تەوسی بنەمایی بەندە



بەزانیاری و ئاگاداری مەبەستی تەوساوی دانەرەوەکە خوێنەر تیایدا بەشدارە بەڵام بێژەر وەها قەستێکی نییە.

**تەوسی تراژیک** **tragic irony**

تەوسی تراژیک کاتێ ڕوودەدا کە کەسایەتییەکی نەجیب بەهۆی دادپرسیەکی هەڵەوە هەڵسەنگاندنێکی ناڕاستەوە لەناو ئەچێ. نموونەی بەرچاوی ئەم تەوسە بۆ پاڵەوانی بەرهەمە ناوازەکەی سۆفۆکل، واتە ئۆدیپ پاشا، دێتە پێش کە تەوسی تراژیک بەرۆکی ئودیپ ئەگرێ و بەم هۆیەشەوە لەناو ئەچێ، لێرەدا ئودیپ هەوڵ دەدا بەمەبەستی پاراستن و پێشاندانی کەسایەتییە نەجیبەکەی خۆی بکوژێ، باوکی بدۆزێتەوە کەچی لە ئاکامدا تێ دەگات بۆخۆی تاوانبارە. لەوانەشە ئەم تەوسە کاتێ ڕووبدات کە کەسایەتییەکی پاک و بێ گوناه فریوی کەسایەتییەکی بەدکار و خراپ بخوات، کە لێرەدا کەسایەتییە خراپەکە ئاگاداری تەوسێکی بارودۆخە وەک ئەوەی لە شانۆنامەی مەکبێسی بەرهەمی شکسپیردا بەرچاو ئەکەوێ.

**تەوسی جیهانی** **cosmic irony**

لە تەوسی جیهانیدا چارەنووس بەشێوەیەک دەرئەکەوێ کە گاڵتەیەکی دڵڕەقانە لەگەڵ هیوا و خەونەکانی مرۆڤدا ئەکات. بەواتایەکی تر، تەوسی جیهانی (یان، تەوسی چارەنووس) بۆ ئەو بەرهەمە ئەدەبیانە بەکارئەبرێ کە تیایاندا چارەنووس یان ڕەوتی جیهان بەشێوەیەک ئەنوێندرێتەوە کە ئەڵێی بەئەنقەست هەندێ ڕووداوی کێشەسازکەر ئەخولقێنێ و پاڵەوانی سەرەکی بەرهەمەکە بەرەو لای هەندێ هیوا و خەونی درۆیین ئەبات. وەها هونەرێک بەئامرازێکی بنەمایی و دڵخوازی بەرهەمەکانی تامس هاردی[١] دائەنرێ. نموونەی بەرچاوی بەکارهێنانی ئەم هونەرە لەلایەن هاردییەوە لە ڕۆمانی تێسی دوور بێرڤیل[٢]دا ئەبیندرێ.

**تەوسی چارەنووس؛ گەمەی قەدەر** **irony of fate**

(بڕوانە تەوسی جیهانی)

**تەوسی دراماتیک ← تەوسی شانۆیی**

**تەوسی ڕۆمانتیک** **romantic irony**

1- Thomas Hardy (1840-1928).

2- Tess of Durberrilles.

تەوسی ڕۆمانتیک زاراوەیەکە کە لەلایەن فریدریک شلێگل[1] و چەند نووسەرێکی ئەڵمانی کۆتایی سەدەی هەژدە و سەرەتای سەدەی نۆزدەوە بەکارهێنراوە، مەبەست ئەو جۆرە نووسینە گێڕانەوەیی و شانۆییەیە کە تیایدا دانەر یا نووسەر وەهمی نواندنەوەی واقیع ساز ئەکات، بەڵام هەر ئەم وەهمە لە ڕێگەی ئاشکراکردنی ئەم خاڵەوە هەڵئەوەشێنێتەوە کە نووسەر وەکو هونەرمەندێکی سازکەر و بەڕێوەبەری دەست والای کەسایەتییەکان و کردەوەکانیانە. ئەو نووسەرەی تەوسی ڕۆمانتیک بەکاردەهێنێ ئامادەبوونی زەینی ڕاستەقینەی بەپێشاندانی ئەم زانیاریەوە دەرئەخا کە نایەوێ بەرهەمەکەی بەتەواوی جیددی سەیری بکرێ. ئەم نووسەرە وەها لەحن و ڕوانینێک بەزانیاری تەواوە و سەبارەت بەوەی ئەنجامی ئەدا و لەبەرچی ئەنجامی ئەدا ئەگرێتەبەر، ئەم جۆرە تەوسە پتر کاتێ ئەگاتە تەشقی خۆی کە دانەر لە ڕەوتی ئەنجامدانی کارەکەی خۆیدا ئەو خاڵە بدا کە خەریکە چێ ئەکا، وەک ئەوەی دانەرێک ڕەوتی ئاسایی چیرۆکەکەی ببرێ و لەپڕێکا ڕوانگەی خۆی ئاراستە بکا یان ئەوەی کە بەردەوام لەحنی جیددی ناو بەرهەمەکە پچڕ پچڕ ببێت. باشترین نموونەی بەکارهێنانی ئەم تەوسە لە بەرهەمە بەناوبانگەکەی لاورێنس ستێرن[2] دەبینرێ بەناوی تریسترام شەندی کە گێڕەوەیەکی هۆشیار و بەئەنقەستی هەیە، یان شیعری گێڕانەوەیی ناسراوی دۆن ژوەن بەرهەمی شاعیری ڕۆمانتیکی ئینگلیزی لۆرد بایرۆن. لەم شیعرەی بایرۆندا لە تەوسی ڕۆمانتیک وەکو ئامرازێک بەمەبەستی بەدیهێنانی کاریگەری کۆمیک و تەوساوی کەڵک وەرگیراوە و ئەو دەرفەتەش بۆ خوێنەر ئەڕەخسێنێ کە بچێتە ناو بڕوا و دڵنیایی گێڕەوەوە و تەنانەت ئەو خاڵەش سەبارەت بەگێڕەوە بۆ خوێنەر ڕوون بکاتەوە کە گێڕەوە تەنیا بەڕێوەبەر و سازکەری چیرۆکەکەیە و تەنانەت زۆربەی کاتیش بەهۆی نەبوونی بابەتێکەوە بۆ درێژەپێدانی چیرۆکەکە و دڵنیانەبوون لە چۆنیەتی درێژەپێدانی چیرۆکەکە دۆش دادەمێنێ.

**تەوسی سوقراتی** **socratic irony**

ئەم جۆرە تەوسە هەروەک بەناوەکەیدا دیارە تەعبیر لەو شێوە هەڵسوکەوتە تایبەتەی سوقرات لە وتووێژە فەلسەفیەکانیدا دەکات بەو چەشنەی ئەفلاتوون تۆماری کردوون. سوقرات بەردەوام خۆی لە گێلی و نەزانین ئەدا و وائەنوێنێ کە گوایە حەز بەشت فێربوون

1- August Schlegel (1767-1845).

2- Lawrence Sterne (1713-1768).



دەکات و بەردەوام خەریکی پرسینە. بەڵام سەرجەم ئەم کارانە و بەتایبەت پرسیارەکانی بەشێوەکن کە لە ئەنجامدا لایەنی بەرامبەری باسەکە بەهەڵەدا ئەکەوێ و تەنانەت هەندێ جاریش بەئاکامگەلێکی پووچ و بێ مایە ئەگەیێنێ. لەم ڕێگەیەوە (واتە لە ڕێگەی تەوسی سوقراتیەوە) سوقرات ڕوانگە فەلسەفیەکانی خۆی بەسەر لایەنی بەرامبەردا ئەسەپێنێ.

**تەوسی شانۆیی؛ تەوسی دراماتیک** **dramatic irony**

تەوسی دراماتیک ئەو بەشانەی شانۆنامە یان گێڕانەوەیەک ئەگرێتەوە کە تیایاندا خوێنەر و بەردەنگ لەگەڵ نووسەر و دانەردا پێکەوە ئاگاداری هەلومەرجی ئێستا و داهاتوو هەن کەچی کەسایەتی ناو بەرهەمەکە لێی بێ خەبەرە. بەکورتی تەوسی دراماتیک واتە ئەوکاتەی کە خوێنەر هەندێ زانیاری سەبارەت بەکەسایەتی و چارەنووسەکەی یان بارودۆخەکە دەزانێ کە کەسایەتیەکە بۆ خۆی نایان زانێ. نموونەی زەقی بەکارهێنانی تەوسی دراماتیک لەلایەن نووسەرانی تراژێدیی یۆنانیەوە هەست پێ ئەکرێ کە گەڵاڵەی شانۆکانیان لەسەر ئەو ئەفسانانە بنیات ئەنا کە ئاکامەکەی پێشوەخت بۆ بینەران و خوێنەران دیار بووە هەر بۆیە خوێنەران بەتەواوەتی کەسایەتی و چارەنووسەکەیان ئەزانی و ئەوجا بەرهەمەکەیان ئەدی کە تیایدا کەسایەتی سەرەکی لەو زانیاریانە بێ بەری بوو.

**تەوسی شەڕاشۆ** **militant irony**

**تەوسی کۆمیک** **comic irony**

تەوسی کۆمیک واتە ئەو ساتەوەختەی گەڵاڵەی بەرهەم کە کەسایەتیەکی سووک هەوڵ دەدا کارێکی باش بکات سزا ئەدرێ. ئەمەش واتە لێک تێنەگەیشتنی دوو کەسایەتی ناو بەرهەمەکە کە ئاکامەکەی ئەبێتە تەوسی کۆمیک.

**تەوسی نەوێستاو** **unstable irony**

(بڕوانە تەوسی وێستاو)

**تەوسی وشەیی** **verbal irony**

تەوسی وشەیی کە پێشتر وەکو هونەرێکی مەجازی پۆلێنبەندی ئەکرا، ئەو گوزارەیەیە کە تیایدا ئەو مانایەی بێژەر ئاماژەی پێ ئەکا زۆر لەو مانایەی بەڕواڵەت دەربڕدراوە جیاوازە. تەوسی وشەیی ئەکرێ بەم شێوەیەش پێناسە بکرێ کە مانای مەبەستی بێژەر زۆر لەو مانایەی یەکێک یان چەند کەسێتییەکی دیکە لێی تێدەگەن جیاوازە.

**تەوسی وێستاو** **stable irony**

هەردوو زاراوەی تەوسی وێستاو و تەوسی نەوێستاو لەلایەن نووسەرێک بەناوی وەین بووت-ەوە و لە کتێبی کەلامی تەوسدا بەم شێوەیە پێناسە کراوە: تەوسی وێستاو ئەوەیە کە بێژەر یان دانەر شوێنگە و دۆخێک بۆ خوێنەر ئەرەخسێنێ کە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەوری بەستێنێکی قورس و قایم بۆ بەلارێبردن و بەراوەژووکردنی مانای ڕووکەشی بەرهەمەکە ئەگێڕێ - لەلایەکی دیکەوە، تەوسی نەوێستاو هیچ چەشنە ڕوانگەیەکی وێستاو کە بۆ خۆی بەهۆی هەندێ تەوسی دیکەوە لاواز نەبووە نادات بەدەستەوە. نموونەی بەرچاوی ئەم تەوسانە لە ئەدەبی پووچیدا دەرئەکەوی کە تیایاندا بەرەوپاش چوونێکی بێ کۆتایی لە کەم بەهاییە تەوساوییەکان ئامادەیە.

**تەوشیح** **acrostic**

جگە لە جەدوەلی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان باوترین شێوەی تەوشیح ئەو شیعرەیە کە ئەگەر پیتی یەکەمی هەموو دێڕەکان بەشێوەیەکی ئەستوونی و بەرەوخوار بخوێنینەوە لە ئاکامدا وشەیەکی لێ سازبێ کە ڕەنگە ئەو وشەیەش بۆ خۆی لەناو شیعرەکەدا و بەتایبەت لە دێڕی یەکەمدا هاتبێ - هەڵبەت لە هەندێ جۆری تەوشیحدا لەوانەیە پیتگەلی کۆتایی هەر دێڕێک یان پیتە ناوەڕاستەکان بۆ خۆیان هەڵگری هەمان تایبەتمەندی بن واتە وشەیەکی تریان لێ ساز بکرێ (ئەم جارەیان ڕەنگە پیتەکان بەرەوژوور بخوێندرێنەوە). لە پەخشانیشدا تەوشیح کاتێک دێتە دی کە پیتی یەکەمی ڕستە یان پاراگرافەکان وشەیەکی دیکە پێک بهێنن. لە سەردەمی کۆندا تەوشیح بۆ مەبەستی گەشەپێدانی بیرگە بەکار ئەهات. هەروەهاش بەمەبەستی گواستنەوەی خێرای وشەکان کەڵکی لێ وەرئەگیرا. هەروەها زۆربەی تەوشیحەکانی زوو لە چەشنی ئەلف و بێ و ئەبجەدی بوون. نموونەی بەرچاوی بەکارهێنانی ئەم چەشنە شیعرە لە شیعرێکی بیست و چوار بەندی جێفری چاسێردا ئەبینرێ کە یەکەمین پیتی وشەی یەکەمی هەر بەندێک بەپێی پیتەکانی ئەلف و بێ لە Aەوە تا Z دانراوە.

**تەوەری ئاسۆیی** **horizontal axis**

(بڕوانە تەوەری هاونشینی)

**تەوەری ئەستوونی** **vertical axis**

(بڕوانە تەوەری جێنشینی)



**تەوەری جێنشینی** **paradigmatic axis**

بەبڕوای یاکوبسن کارکردی ئەدەبی زمان بەندە بەدوو نموونەی دەربڕینی خوازە و مەجازەوە کە هەرکامیان لە تەوەرەیەکی تایبەتدا جێگیر دەبن. بەواتایەکی دیکە، زمان بەگشتی لەم دوو تەوەرەدا دێتە خولقاندن کە بریتین لە تەوەرەی جێنشینی و هاونشین. جیاوازی نێوان ئەم تەوەرەیە لە ڕاستیدا بەجیاوازییە لە نێوان ئەو ڕێسایانەی پێوەندییە جێنشینی و هاونشینیەکان بەڕێوە ئەبەن. پێوەندیە جێنشینیەکان ئەو پێوەندییە ئەستوونیانەی نێوان وشە جیاجیاکانی ڕستەیەکن کە ئەکرێ بۆ پێوەندی نێوان ئەو وشانەش بەکار ببرێ کە لە باری دەنگناسانە و ڕێزمانی و مانابییەوە لەبری یەکدی ئەشێن بەکار ببرێن. لەم تەوەرەیەدا لەجیاتی (ئاوێتەکردن) ئەوە (هەڵبژاردن)-ە کە دەوری سەرەکی ئەگێڕێ و، لە ئاکامدا زمانێکی خوازەیی پێکدێت، کە ئەم زمانە، دیسانەوە بەبڕوای یاکوبسن لە شیعری لیریکدا بەکارئەهێنرێ. پێویستە بوترێ بێ توانایی بێژەر لەم تەوەرە و یان تەوەرەکەی تری زمان لە ئەنجامدا ئەبێتە هۆی نەخۆشییەکی زمانناسانە کە بەزمان پەرێش یان زمان ئاڵۆزی ناوبردە ئەکرێ.

**تەوەرەی هاونشینی** **syntagmatic axis**

لە تیۆرەکەی یاکوبسندا تەوەرەی هاونشینی لەو پەیوەندییە ئاسۆییانە پێکدێ کە ئەگەری لەپاڵ یەکدابوونی وشەکان بەمەبەستی پێکهاتنی یەکەییەکی لەباری ڕێزمانی دیاری ئەکەن. هەر بۆیە لێرەدا لەجیاتی (هەڵبژاردن) ئەوە (ئاوێتەکردن)ی وشەکانە کە دەوری سەرەکی ئەگێڕێ و ئەم پێوەندییانە ئەکرێ لە نێوان پیت و وشە و دەستەواژە و ڕستەدا پێک بێت.

**تیاتری بەڵگەمەند، شانۆی بەڵگەمەند** **documentary theater**

تیاتری بەڵگەمەند جۆرێ شانۆی بانگەشەیی و فێرکارانەیە کە پێوەندیشی بەشانۆی حەماسییەوە هەیە و تیایدا هەندێ مێژوو و ڕێکەوتی نزیک و بەڵگەگەلی وەرگیراو لە ڕۆژنامە و ئەرشیڤ و مێژووی ڕەسمی و یاداشت و بیرەوەری بەکار ئەهێنرێ. باشترین نموونەی ئەم چەشنە تیاترە بریتین لە شانۆی نوێنەر (١٩٦٦) بەرهەمی هاچ هاس کە تیایدا باسی دەوری پاپ و سیستەمی پاپایەتی لە شەڕی دووەمی جیهانیدا کراوە، یان بەرهەمێکی دیکەی ئەم نووسەرە سەربازەکان (١٩٦٧) کە تیایدا لە دەوری چێرچیلی سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا لە گەرمەی شەڕدا ئەکۆڵێتەوە، یان بەرهەمی U.S. (١٩٦٩) بەرهەمی پیتێر برووک.

**تیاتری پووچ** **theatre of the absurd**

ئەم زاراوەیە بۆ بەرهەمی کۆمەڵێ نووسەر و شانۆنامەنووسی ئەمریکی و ئەورووپی پەنجاکان و شەستەکانی سەدەی بیستەم بەکارئەبرێ. هەروەک بەناوەکەیشیدا دیارە، کارکردی تیاتری پووچ بریتییە لە دەربڕینی شانۆیی چەمکی فەلسەفی (پووچ) کە دوابەدوای بڵاوبوونەوەی نووسینێکی کامۆ بەناوی ئوستوورەی سیزیێف (١٩٤٢)، مشتومڕ و باسوخواسێکی زۆری خولقاند. ئەو بەرهەمانەی سەر بەم قوتابخانەیەن لەسەر ئەم بیرە فەلسەفیە تەبان کە بارودۆخی مرۆڤ لە بنەڕەتدا و بەشێوەیەکی تیانەچوو پووچە و ئەم تایبەتمەندییە تەنیا لەو بەرهەمانەی ئەدەبدا ئەکرێ بنوێندرێتەوە کە بۆ خۆشیان پووچ بن. پێناسەکردنی جیهان وەکو بابەتیکی پووچ واتە ناسینی سروشتە لە بنەڕەت درک پێ نەکراوەکەی ئەم ناسینەش لەگەڵ خۆیدا بەردەوام هەستی نەمان و بێ مەیلی و بێ مەبەستی و وەیلانی دێنێت. تیاتری پووچ وەها تایبەتمەندیگەلێک دەردەبڕێ و زۆربەی کات بینەر ڕووبەڕووی هەڵسوکەوتێکی درک پێ نەکراو و وتووێژێکی دووبارەبووی بێ مانا و گەلاڵەیەکی وا دەکاتەوە کە لەسەر هیچ چەشنە لۆژیکێک دانەمەزراوە، هەر بۆیەش ئەم ناسینەی سروشتی پووچ بوونی مرۆڤ بووەتە هۆی دابینکردنی کەرەسە و سەرچاوەیەکی زۆر بۆ بەرهەمهێنانی کۆمێدی لەلایەن ئەم شانۆنامەنووسانەوە.

بەبڕوای هەندێ ڕەخنەگر بنج و بناوانی ئەم چەشنە ئەدەبەی پاش شەڕی دووەمی جیهانی ئەگەڕێتەوە بۆ بزووتنەوەگەلی ئەکسپرێسیۆنیزم و سوریالیزم لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا و هەروەها ئەکرێ ڕەگوڕیشەی ئەدەبی پووچ لە چەند بەرهەمێکی فرانتس کافکادا بەتایبەت بەرهەمەکانی بیستەکان بدۆزرێتەوە، وەکو دادگایی[1] و مەسخ[2]. ئەدەبی پووچ، کە هەندێ کەس بەئەدەبی قۆڕ یان ئەدەبی لاڵ یان ئەدەبی شاراوە ناوبردەی ئەکەن، پاش شەڕی دووەمی جیهانی بەهۆی ترس و تۆقینی شەڕەوە لە فەرەنسا سەری هەڵدا کە پەرچەکردار و هەڵوێست و شۆڕشێک بوو دژی ئەو بەها و بیروڕا بنچینەییانەی کولتوور و ئەدەبی نەریتی. ئەو نەریتە پێشووە لە خۆگری ئەو ڕوانگە و گریمانەیە بوو کە مرۆڤ بوونەوەرێکی ئەقڵانیە و لە جیهانێکی لانی کەم تا ڕادەیەک شیاوی تێگەییندا ژیان دەباتە سەر و مرۆڤەکان بەشێکن لە پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی لە بار و تەنانەت لە

---

1- The Trial.

2- Metamorphosits.



شکستیشدا ئەتوانن بیر لە پاڵەوانپەروەری و حورمەتی مرۆڤایەتی بکەنەوە. بەڵام پاش شەڕخوازیارییەکی بەربڵاو بەتایبەت لە فەلسەفەی بوونیانەی هەندێ نووسەری وەک سارتر و کامۆدا هاتە ئاراوە کە مرۆڤی وەکو بوونێکی تەنیا و تەریک دادەنا کە فڕێ دراوەتە ناو جیهانێکی بێگانە و نامۆوە. ئەم بیرە تەعبیری لەو خاڵەش ئەکرد کە جیهان هەڵگری هیچ جۆرە مانا و بایەخ و هەقیقەتێک نییە و ژیانی مرۆڤی بەشێوەیەک ئەنواندەوە کە لە هیچەوە دەست پێ دەکات و هەر بەهیچیشەوە کۆتایی پێ دێ و ئەم ژیانە بۆخۆی بوونێکی پووچ و نیگەراناوییە. وەک کامۆ لە ئوستوورەی سیزیێفدا ئەڵێ: «لە جیهانێکدا کە لەناوکاو لە وەهم و لە ڕووناکی جیا و بەتاڵ بووەتەوە مرۆڤ هەست ئەکا نامۆیە. مرۆڤ لە تاراوگەیەکی بێ دەرەتاندا ژیان دەباتەسەر... ئەم دابڕانەی نێوان مرۆڤ و ژیانەکەی یان یاریکەر و شوێنکاتەکەی بەڕاستی هەستی پووچێتی پێک ئەهێنن» چەند شانۆنامەنووسێکی ناسراو لەم بوارەدا بریتین لە یوجین یۆنسکۆ، ساموئێل بەکێت و بەتایبەت بەرهەمە ناوازەکەی بەناوی لە چاوەڕوانی گۆدۆدا، ئارتورئادامۆڤ، ژان ژنێ، ئێدوارد ئالبی و هارۆڵد پینتێر.

**تێپەڕین** **transition**

**تێرامانی ئەقڵانی** **rational contemplation**

**تیزاوی** **satirical**

**تیزەون** **satiric**

**تیز، هەجوو؛ تەنز** **satire**

هەجوو پتر ئەو زاراوە ئەدەبیە ڕەسمیەیە کە تەنانەت تەعبیر لە چەشنێکی ئەدەبی دەکات کەچی تیزواژەیەکی جەماوەرییە و هەڵگری ئەو بارە جیددییە نییە کە هەجوو هەیەتی. هەروەهاش ئەکرێ لە زاراوەی تەنز بۆ دەستنیشانکردنی هەردوو ئەو زاراوانەی سەرەوە واتە هەجوو و تیز سوود وەرگیرێ. هەجوو بریتییە لەو هونەرە ئەدەبیەی کە ئاست و بایەخی بابەتێک لە ڕێگەی گاڵتەپێکردنەوە دادەبەزێنێ. ئەمەش ئەبێتە هۆی ئەوەی کە هەندێ ڕوانگەی گاڵتەئامێز و پێکەنیندار و تەنانەت ڕەخنەگرانە و یاخود شکایەت بۆ هەمان بابەت بێتە ئاراوە. جیاوازی نێوان هەجوو و بابەتی پێکەنیندار و کۆمیک لەوەدایە کە کۆمێدی وەکو ئامانج و مەبەستێک لە خۆیدا پێکەنین بەرهەم ئەهێنێ. کەچی هەجوو پێکەنین وەکو چەکێک بەکار ئەهێنێ و لە دژی ئەو ئامانجە بەکاری دێنێ کە لە دەرەوەی

خودی بەرهەمەکە دایە. ئەگەر ئامانجەکە تاکەکەس بێت پێی ئەوترێ هەجووی کەسەکی کە لێرەدا ئامانجەکە ئەتوانێ کەس، چین، دامەزراوە، نەتەوە و یاخود تەنانەت سەرجەم ڕەگەزی مرۆڤ بێت. (نموونەی ئەم چەشنەی دوایی ئەکرێ لە سەفەرەکانی گالیوێر بەرهەمی جاناتان سویفت ببینرێ بەتایبەت لە بەشی چوارەمدا).

پێویستە ئەوەش بوترێ کە هەجوو لەلایەن ئەو کەسانەوە کە بەکاری ئەهێنن وەکو ڕاستکەرەوە و ساغکەرەوەی گەمژەیی و تەنانەت گوناهی مرۆڤەکان پێناسە کراوە. وەک لە ئەلکساندر پۆپ (بەرچاوترین هەجوونووسی ئەدەبی ئینگلیزی لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەمدا) ئەڵێ: «ئەوانەی لە هیچ شتێک شەرمەزارنین لەوەی کە گاڵتەیان پێ بکرێ شەرمەزارن».

لەوانەشە هەجوو لەو بەشە ڕێکەوتیانەی بەرهەمە ئەدەبییەکاندا ڕووبدات کە ئوسلووبی سەرەکی و گشتی ئەو بەرهەمە بابەتێکی هەجووی نییە، واتە دەشێت هەجوو لە کەسایەتی و بارودۆخێکی تایبەتی و دیاریکراودا یاخود لە هەندێ بەشی تری بەرهەمەکەدا بەرجەستە بکرێتەوە کە هەڵگری ڕوانینێکی تەوساوی بێت بۆ هەندێ لایەنی بارودۆخی مرۆڤ و یان کۆمەڵگای هاوچەرخ. هەڵبەت لە زۆر بەرهەمی تردا (شیعر و پەخشان) ئەو هەوڵەش ئەدرێ کە نرخی بابەتێک لە ڕێگەی گاڵتەپێکردنەوە کەم بکرێتەوە و ئەمەش وەکو بنەواشەی ڕێکخەری ئەو بەرهەمەیە؛ ئەوەتا ئەم بەرهەمانە بۆ خۆیان ژانر یان چەشنێکی ئەدەبی پێک ئەهێنن بەناوی (هەجوو).

درکاندنی ئەم خاڵەش پێویستە کە زاراوەی (satire) بۆ خۆی لە بنەڕەتدا لاتینییە و بەمانای (ئاوێتە و تێکەڵاو) بەکارهاتووە و لەوانەشە زاراوەیەک بووبێت تایبەت بەچێشت لێنان و لە سەرەتای دامەزراندنی ئیمپراتووری ڕۆمی کۆندا بەمانایەک وەک (چێشتی مجێور) بەکارهێنراوە. هەر بۆیەش کەلامزان و ڕەخنەگری ئەو سەردەمە (کوینتیلیەن) لەم زاراوەیە بۆ دەستنیشانکردنی جۆرێک شیعر کەڵکی وەرگرتووە کە زۆر بابەتی جۆراوجۆری لەخۆگرتووە. ئەم تایبەتمەندییە ئەو بەرهەمانەی دوو شاعیری گەورەی ڕۆمی واتە، لووسیلیووس و هۆراس، ئەگرێتەوە کە شیعرەکانیان بەهەوایەکی تایبەتەوە باسی چەند بابەتێکی جیاجیای ئەکرد. هەڵبەت نابێ ئەوەش لەبیر بچێ کە هەندێ تایبەتمەندی (هەجوو) لە شیعرەکانی هۆراسدا هەیە و هەر ئەمەش کاریگەرێتی لەسەر هەجووی ئەورووپی بەتایبەت لە کۆتایی سەدەی حەڤدە و سەرەتای سەدەی هەژدە دانا (بۆ نموونە لێرەدا ئەکرێ باسی کاریگەرێتی هۆراس لەسەر شاعیری گەورەی فەرەنسی کۆتایی



سەدەی حەڤدە واتە بووالۆ و شاعیری گەورەی ئینگلیزی سەرەتای سەدەی هەژدە واتە پۆپ بکرێ).

ئەگەرچی سەرەتای مێژووی دانانی هەجوو ئەگەڕێتەوە بۆ شاعیرە پێشووەکانی یۆنانی کۆن (سەدەگەلی حەوت و شەشی پ. ز.) بەڵام هەجوونووسی گەورەی یۆنانی کۆن ئاریستۆفانۆس[1]-ە کە چەندین شانۆنامەی تیزاوی و گاڵتەئامێز و تەنانەت دەمهەراشی بەرهەم هێنا. لە ڕۆمی کۆنیشدا، هەروەک گوترا، دانانی هەجوو ئەگەڕێتەوە بۆ لووسیلیووس، کە دواتر لەسەر دەستی هۆراس و تێترۆنیۆس و سینێکا و بەتایبەت ژووڤێناڵ[2] گەشەی کرد. ئەمەش تا ئەو ڕادەیەیە کە ئەمڕۆکە دوو جۆر هەجووی هۆراسی و هەجووی ژووڤێناڵی وەکو سەرەتای دوو جۆر هەجووی سەرەکی دادەنرێ. لە چەرخەکانی ناوەڕاستدا هەجوو وەک شێوە و چەشنە ئەدەبییەکانی دیکە پەرەی نەستاند و تەنیا لە کۆتایی ئەم سەردەمە بەمەلاوەبوو کە ئەم شێوە ڕوانینە لە بەرهەمی هەندێ شاعیری بەناوبانگدا ڕەنگی دایەوە (وەک بەرهەمەکانی چاسێر و لانگلەند). لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا هەجووە شیعر گەشەی کرد و لە کۆتایی هەمان سەدەدا و بەتایبەت لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەمدا هەجوو نووسین بوو بەچەشنی ئەدەبی زاڵی سەردەم. جگە لە پۆپ، شاعیرێکی دیکەی ئینگلیزی بەناوی جان درایدێن، کۆمەڵێ هەجووی ناسراوی بەرهەم هێناوە کە تیایدا ئامانجی هەجوو پتر کەسایەتییە سیاسییەکانی ئەو سەردەمەی بەریتانیان. هەر لەم سەردەمەشدا جۆرێ هەجووی ئاینی هاتە ئاراوە کە شاعیری بەرچاوی ئەم جۆرە هەجووە ساموئێل باتلێر بوو بەتایبەت لە شیعری پاڵەوانی هۆدیبراس-دا.

ئەکرێ بوترێ کە هەجوو ئەو شێوە یاخود چەشنە ئەدەبییەیە کە شان بەشانی پێشکەوتنی شارستانێتی و کولتوور پەرە ئەستێنێ. دوو نموونەی سەرەکی بۆ ئەو باسە بریتین لە گەشەکردنی هەجوو لە سەردەمی ڕۆمی کۆندا و ئەورووپای ڕۆژئاوای سەدەی هەژدە. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمیشدا هاوکات لەگەڵ پەرەسەندنی ئەدەبی ڕۆمانتیکدا کۆمەڵێ شاعیری هەجوونووس ئەبینرێن کە لە نێویاندا بێ گومان لۆرد بایرۆن بەگەورەترین هەجوونووس لە قەڵەم دەدرێ کە بەرهەمی ناسراوی دۆن ژوەن-ی نووسی. لە ناوەڕاست و کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا شاعیران و نووسەران پتر هەجووی بۆنەییان ئەنووسی و

1- Aristophanes (448 - 380 B.C.).

2- Jureal (C.60 - C. 136).

ئەکرێ لێرەدا ناوی تەکێری[١]، فلۆبێر و ئاناتۆل فرانس بەرین. ئەمڕۆکە ئەدیبان هەجوو بەسەر چەندین لق و پۆپی جیاوازدا دابەش ئەکەن و دیارە هەریەکەیان تایبەتمەندی و پێناسەی خۆی هەیە.

**تێکگووشین؛ تێکترنجان؛ پەستاوتن** **condensation**

ئەم زاراوەیە لە ڕەخنەی فرۆیدی و هەڵسەنگاندنی خەوندا بەکارئەبرێ و بەمانای ئەو وێنە تێکەڵاو و چەند فاقەیە کە مانایەکی زۆری تێ پەستراوە و ئەندازەیەکی تا ڕادەیەک بچووکی هەیە و لەوێدا وێنە و نیشانە تاکەکان زۆرتر دەلالەت دەکەنە سەر چەند شت. بەپێی قسەکانی فرۆید بەراوردکردنی ناوەڕۆکی خەون لەگەڵ بیری خەوندا ئەو خاڵەمان بۆ دەرئەخا کە لە خەوندا ڕووبەڕووی بەرهەمێکی تێکگووشراو و تێکپەستراو ئەبینەوە. خەونەکان کەم و کورتن کەچی لە بیری خەوندا دۆخەکە بەم شێوەیە نییە. هەر بۆیە لە تەئویلی فرۆیدیدا لە دیمەن یان کەسێکی تاکی ناو خەونەکەوە ژمارەیەکی زۆر مانای جیاواز ئەقۆزێتەوە. هەر بەهۆی خەسڵەتی تێکگووشرانی وێنەکانی ناو خەوندا، فرۆید پێی وایە لێکدانەوەی خەون چەندین جار پتر لە گێڕانەوەی خودی خەونەکە درێژخایەنترە – خەونەکان تا ڕادەیەکی زۆر لە کۆی ماناکان پێکهاتووە و فرۆید لێرەدا پێشنیاری هەندێ ڕێگەی والاکردنی ڕەوتی تێکگووشین ئەدات کە کەسە کۆییەکان و بنەما تێکەڵاوەکان و تەنانەت هونەرە زمانییەکانی وەک جیناس ئەگرێتەوە. ڕەخنەگرانی ئەدەبی ئاوڕێکی زۆریان لەم باسانەی فرۆید داوەتەوە بەتایبەت لە ڕەخنەکاری شیعردا کەڵکیان لێ وەرگرتووە، چونکە شیعر وەکو خاوەنی سروشتێکی داپەستراوە کە لە هێما و وێنەی شاعیرانە پێکهاتووە. لە زۆر باریشەوە هەندێ لایەنی شیکاریی خەونی فرۆیدی لە هەندێ لایەنی شیکاری شیعری لیریک لەلایەن ڕەخنەگرانی نوێوە نزیکە. هەڵبەت پێویستە ئەوەش بوترێ کە ئەم زاراوەیە واتە پەستاوتن لە ڕەخنەی فرۆیدی و شیکاریی خەوندا بەردەوام لەگەڵ زاراوەیەکی تردا بەناوی جێگۆڕکێ بەکارئەبرێ.

**تێکەڵبوونی ئاسۆکان** **fusion of horizons**

ئەم زاراوەیە لەلایەن گادامێر–ەوە ئاراستە کراوە و لە زانستی تەئویل و هێرمێنۆتیکدا بەکار ئەهێنرێ. هانس گێئۆرگ گادامێر وەکو قوتابیەکی هایدگێر، فەلسەفەی مامۆستاکەی بۆ داڕشتنی تیۆرێکی کاریگەری تەئویلی دەق بەکارهێنا و لە کتێبی

1- Wiliam Machpeale Thakeray (1811 - 1863).



هەقیقەت و ڕێباز[١]دا لە تەئویل و لێکدانەوەی دەقەکانی کۆڵیەوە. گادامێر پێی وایە ڕەوتی تێگەیین لە شتێک پێوەندی ڕاستەوخۆی بەکردەی تەئویلەوە هەیە و هەر تەنیا بەند نییە و بەخوێندنەوەی دەقەکانی بەڵکو پێوەندی

بەکۆی لایەنەکانی ئەزموونی مرۆییەوە هەیە و لێرەدا زمان سەرجەم لایەنەکانی ئەم ئەزموونەی گرتووەتەوە. لە دابەزاندنی ئەم گریمانە فەلسەفیانە بۆ تێگەیشتن لە دەقێکی ئەدەبی گادامێر بازنەی هێرمێنوتیکی نەرێتی وەکو خوازەگەلی (وتووێژ) و (تێکەڵبوون) ئاراستە ئەکات؛ واتە، خوێنەر لە خوێندنەوەی دەقدا بەردەوام ئەگەڕێتەوە بۆ پێش تێگەیین–ەکانی خۆی کە بەهۆی ئاسۆ کەسەکییەکانی خۆیەوە پێکهاتوونە. لێرەدا خوێنەر نابێ وەکو (ناسکار)ێک دەقەکە وەکو (بەرناس)ێکی خودموختار شی بکاتەوە، بەڵکو خوێنەر لێرەدا ئەو (من)ەیە کە هەندێ پرسیار ڕووبەڕووی دەق وەکو (تۆ)یەک ئەکاتەوە، هەڵبەت وەرگرتنێکی ئاوەڵا، کە ئەبێتە هۆی ئەوەی کە دەقەکە لە ڕێگەی میراتی هاوبەشی زمانەوە دەست بکاتە وتووێژێکی هەڵوێست ئەنگێز لەگەڵ خوێنەردا و ئەمیش پرسیارەکانی خۆی ئاراستەی خوێنەر بکات. مانای فام کراوی دەق ڕووداوێکە کە بەردەوام بەرهەمی (تێکەڵبوونی ئاسۆکان)ە، ئەو ئاسۆیەی خوێنەر بۆ دەقەکە و دەقەکەش بۆ خوێنەری دەهێنێ.

ئەم وتووێژەی نێوان ئاسۆی مانایی دەق و ئاسۆی مانایی خوێنەر یان تەئویلکار بەواتای تێکەڵبوونی ئەم دوو ئاسۆیە و یان تێکەڵبوونی (زەمەنی نووسینی دەق و زەمەنی ئێستا)یە، کە لە ساتەوەختی خوێندن و تەئویلدا دەربازبوون لەم تێکەڵبوونە لە ئاردا نییە. ئاسۆی ئێستا نەگۆڕ و وێستاو نییە، بەڵکو، هەروەک گادامێر ئەڵێ، ئاسۆیەکی کراوە و بەئاڵوگۆڕە کە لەگەڵ ئێمەدا لە هاتوچۆ دایە، هەر بەهەمان شێوە کە ئێمەش لەگەڵیدا ئەگۆڕدرێین». چوونە ناو ئاسۆی ڕابردووەوە لە خوێندنەوەی دەقەکانەوە نەبێ سەرناگرێ. گرفتەکە لێرەدایە کە ئاسۆی ڕابردوو نووسراوە و ئاسۆی ئەمڕۆکە نەنووسراوە. هەر بۆیە گادامێر پێی وایە هونەری نووسین گرنگترین هونەر و لەبارترین شێوەیە بۆ تەئویل و، کەواتە، تەئویلی دەقە ئەدەبیەکان لە ڕاستیدا ڕێخۆشکەری تەئویلی دەقە نائەدەبییەکانە (وەک دەقە مێژوویی و زانستییەکان).

1- The Truth the Method.

**تێکەڵاو ← ئاوێتە**

**تێکەڵکاری؛ ئاوێتەکردن** combination

**تێکەڵکاریی وشە؛ وشەی تێکەڵ** pormanteau

(بڕوانە تەکنیکی چەند پێوەندی)

**تێکەڵکاریی هەست** synaesthesia, synesthesia

لە دەروونناسیدا تێکەڵکاریی هەست ئەو زاراوەیەیە کە بۆ تاقیکردنەوە و ئەزموونکردنی دوو یان چەند جۆر هەست بەکارئەبرێ. کاتێ تەنیا یەکێک لە هەستەکان گرینگ بێت لە ئەدەبدا، ئەم زاراوەیە بۆ دەستنیشانکردنی دەربڕینی جۆرێک هەست بەپێی هەستێکی دیکە بەکارئەبرێ. (لێرەدا مەبەست لە هەستە پێنجینەکانە، وەک ئەوەی ڕەنگ و بۆ دەنگ و، بۆن بۆ ڕەنگ و دەنگ بۆ بۆن بەکاربهێنرێن). باشترین نموونەی بەکارهێنانی ئەم هونەرە شیعرییە لەناو بەرهەمی شاعیرانی ڕۆمانتیکدا و بەتایبەت شیعرەکانی جان کیتس و شێلیدا ئەبینرێتەوە. پاشان هەر ئەم هونەرە لەسەر دەستی شاعیرە هێما خوازە فەرەنسییەکانی وەک بوودلێر و ڕیمبۆ گەشەی کرد.

**تێگەیینی ڕاست** good sense

**تێگەیینی گشتی؛ ئەقڵی هاوبەش** common

**تیلنیشان؛ تەلمیح** allusion

تیلنیشان لە دەقێکی ئەدەبیدا بریتییە لە گەڕانەوە و ئاماژە بۆ کەس، شوین، ڕووداو یان بەرهەم و بەشێکی ئەدەبی دیکە بەبێ ناوهێنانێکی زۆر ئاشکرا و ڕاستەوخۆ. تیلنیشان بەگشتی هەڵگری ئەو زانیارییەیە کە لە نێوان نووسەر و بەردەنگدا هاوبەشە هەڵبەت هەندێ لە تیلنیشانە ئەدەبییەکان تەنیا لەلایەن خوێنەرە خوێندەوارە گشتییەکانەوە لێک ئەدرێنەوە و هەندێکی دیکەش بۆ بەردەنگێکی تایبەت نووسراوە. لە ئەدەبی مۆدێرندا چەند نووسەر و شاعیرێکە وەک جۆیس و پاوند و ئیلیۆت زۆربەی کات ئەو تیلنیشانانە بەکارئەهێنن کە زۆر پسپۆڕانەن و لەوانەشە لە خوێندنەوە و ئەزموونەکانی خودی دانەرەوە هەڵقوڵابێتن. ئەگەرچی ئەم زاراوەیە لە بووتیقای کۆندا ئاماژە و پێناسە کراوە و لەسەر دەستی شاعیرانی کلاسیکی نەتەوە جیاجیاکان بەکارهێنراوە بەڵام ئەمڕۆکە و لە چەند بوارێکی تیۆری ئەدەبیدا لەم هونەرە شیعرییە بۆ شیکاری پتری زاراوەی (نێوان دەقێتی) کەڵک وەرئەگیدرێ. ئیلنیشان ئەتوانێ ببێتە هۆی قووڵبوونەوە و پڕبوونی دەق.



لە ئەدەبی مۆدێرندا و بەتایبەت لە شیعری سەرەتای سەدەی بیستەمدا سوودی تەواو لە تیلنیشان وەرگیرا و، ئەم هونەرە لە پاڵ هەندێ هونەری شیعری دیکەدا بوونە هۆی قووڵ و دژواربوونەوەی دەق. هەڵبەت ئەم تیلنیشانەی ئامادەی ئەدەبی مۆدێرن پتر بەلایەنێکی تەوساویەوە بەکارئەبرێ کە لێرەدا پێی ئەوترێ تیلنیشانی تەوساوی؛ واتە ئەو تیلنیشانەی بەڕوانگەیەکی تەوساویەوە ئاوڕ لە هەندێ بەرهەم و کەس یان شوێنی ڕابردوو ئەداتەوە و زۆربەی کات لەم ڕێگەیەوە بەراوردکارییەکی بەمەبەست و بەئەنقەست بەڵام ناڕاستەوخۆ و نائاشکرا لە نێوان ڕابردوو و هەنووکەدا دادەمەزرێنێ.

**تیلنیشانی تەوساوی** ironical allusion

(بڕوانە تیلنیشان)

**تێم؛ واتای سەرەکی** theme

ئەگەرچی تێم هەندێ جار لەبری زاراوەی مۆتیف یان بنەمایە و بن واتا بەکارئەهێنرێ، بەڵام تێم ئەتوانێ کۆی مۆتیفەکانی یەک بەرهەم بێت. واتای سەرەکی بەرهەمێک ئەتوانێ کۆی بن واتاکانی ئەو بەرهەمە بێت یان گەورەکراوەی بن واتایەکی بەرهەمەکە بێت. تێم ئەو چەمک و بیرۆکە یان فیکرە سەرەکی و ناوەندییەی بەرهەمەکە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان نائاشکرا ئاراستەی خوێنەر ئەکات و بەیەکێک لە تایبەتمەندی و ئەرک یان تەنانەت مەبەستی بەدیهاتنی بەرهەمێکی ئەدەبی خەیاڵکرد دادەنرێ. بەواتایەکی ساکار تێم ئەو شتەیە کە بەرهەمی ئەدەبی بەخوێنەری ئەدا.

**تیۆر؛ بیرداڕێژی** theory

**تیۆرگەلی پاش بنەماخواز** post - structuralist theories

(بڕوانە پاش بنەماخوازی)

**تیۆرگەلی خوێنەر تەوەر؛ تیۆرگەلی ڕووەو خوێنەر** reader - oriented theoris

(بڕوانە تیۆری هەڵوێستی خوێنەر)

**تیۆری ئەدەبی** literary theory

ئەگەرچی لە سەدەی بیستەمدا تیۆری ئەدەبی وەکو لقێکی جیا و سەربەخۆی ئەدەبناسی یان وەکو ژانرێکی سەربەخۆی زانستە ئەدەبییەکان هاتووەتە ئاراوە، بەڵام ئەکرێ بوترێ هەر لە سەدەی چواری بەر لە زایینەوە کە ئەرەستوو کتێبە بەناوبانگەکەی بەناوی بوتیقا بڵاوکردەوە تیۆری ئەدەبییش هاتۆتە گۆڕێ. هەڵبەت هەندێ نووسەر لە نێوان تیۆری ئەدەبی

و ڕەخنەی تیۆریکدا جیاوازی دادەنێن و پێیان وایە کە هەندێ بەرهەم وەک بووتیقای ئەرەستوو، بنەواشەکانی ڕەخنەی ئەدەبی[1] ئای ئەی ریچاردز[2]، فەلسەفەی شێوەی ئەدەبی کێنێس بێرک، ڕەخنەگران و ڕەخنەنووسی کرەین و تۆێکاریی ڕەخنەنووسینی نۆرترۆپ فرای، نموونەی بەرچاوی ڕەخنەی تیۆریکن کە تیایاندا کۆمەڵێ چەمک و تایبەتمەندی و وتەزا بەمەبەستی ناسینی و شیکاریی و بەرهەمە ئەدەبییەکان بەکارهێنراون. هەروەهاش تیایاندا باسی ئەو پێوەرانە کراوە کە بەرهەمە ئەدەبییەکان و تەنانەت نووسەرەکانیش لەو ڕێگەیەوە هەڵ ئەسنگێنرێن. تیۆری ئەدەبی، لەلایەکی ترەوە، کە لە ئەنجامی گەشەکردنی توێژینەوە کولتوورییەکانی ناوەڕاست و کۆتایی سەدەی بیستەم سەری هەڵداوە و بەتەواوەتی لەژێر کاریگەریێتی بیر و ڕوانگەی هەندێ نووسەر و ڕەخنەگری سەرەتای سەدەی بیستەم دایە بریتی نییە لە تەنیا ڕوونکردنەوەی سروشتی ئەدەب و لیکۆڵینەوە لە ئەدەب. تیۆری ئەدەبی کۆمەڵێ فیکر و نووسین ئەگرێتەوە کە دیاریکردنی سنوورەکانی لەگەڵ تیۆریکی دیکەی ئەدەبیدا گەلێک دژوارە. وەکو ریچارد رورتی فیلسۆف ئەڵێ: «لە سەردەمی گۆتە و ماکیاڤیلی و کارلایل و ئێمیرسۆن بەملاوە جۆرێکی تازەی نووسین هاتووەتە ئاراوە کە نە هەڵسەنگاندنی لایەنە باشە ڕێژەییەکانی بەرهەمگەلی ئەدەبییە و نە مێژووی هزر و ئەندێشەیە. نە فەلسەفەی ئەخلاقییە و نە پێشبینی کۆمەڵایەتی، بەڵکو هەموو ئەمانەیە و لە ژانرێکی نوێدا تێکەڵاو بوونە. تیۆری ئەدەبی بەشێوەیەکی گشتی لە ١٩٦٠ بەم لاوە سەری هەڵداوە و لە هەندێ بواری سەرەکی وەک زمان، ڕەخنە، مێژوو، کولتوور، فەلسەفە، هونەر، مرۆڤناسی، دەروونناسی، کۆمەڵناسی، زەینیەتی مرۆیی و هتد ئەکۆڵێتەوە. نەک هەر لە ئەدەبدا بەڵکو لە لقەکانی دیکەی زانستە مرۆییەکاندا تیۆر وەکو بەشێک لە چوارچێوەی ئەو زانستە دادەنرێ. تایبەتمەندییە سەرەکی و گشتییەکانی تیۆریکی ئەدەبی بریتییە لە:

١- پێویستە شیکارانە بێت و هەولێک بێت بۆ تێگەیین لەوە کە زمان یان نقسیای یان سووژە هەڵگری چین.

٢- تیۆری ئەدەبی لە ڕاستیدا جۆرێ ڕەخنەکاریی ئەقڵی مرۆییە و دەست دەکا بەرەخنەگرتن لەو چەمکانەی کە بەشێوەیەکی سروشتی دانراون.

1- The Princeiples of Literary Criticism.
2- I. A. Richards (1893-1979).



٣- تیۆری ئەدەبی پتر نێوان بواریە و لە ڕاستیدا گوتارێکە لەسەر دەرەوەی ئاقاری سەرەکی خۆی شوێن دادەنێ.

٤- تیۆری ئەدەبی بەجۆرێک بیرکردنەوە لە بیرکردنەوەیەکی دیکەیە سەبارەت بەبناخەکانی و سروشتی تەکنیک و بەرهەمە ئەدەبییەکان.

تیۆری ئەدەبی گریمانەکان و باوەڕەکان و ڕوانگەکان و تەنانەت هەستی خوێنەر ڕووبەڕووی پرسیار دەکاتەوە و ئەم بابەتە دێنێتە گۆڕێ کە هۆی چییە هەندێ خوێنەر بەشێوەیەکی دیاریکراو لە هەمبەر دەقە جیاجیاکاندا هەڵوێست وەرئەگرن. زۆربەی ئەو پرسیارە گشتی و سەرەکیانەی لە تیۆری ئەدەبیدا ئاراستە ئەکرێن. ئەمانەن: بنەڕەتی ئەخلاق چییە؟ مانای مێژووی مرۆڤ چییە؟ ئاخۆ جوانی و حەقیقەت و پاکی بەپێی دەقەکان کامانەن؟ ئاخۆ دوا واقیعێک لە ئارادایە؟ کام هونەری ئەدەبی لە دەقەکەدا زاڵە و بۆچی؟ پێوەندی ئەم بەرهەمە ئەدەبییە بەئایدیۆلۆژیاوە چییە؟ بەرهەمەکە بەشێوەیەک لەگەڵ هەندێ دیاردەی وەک جینس و تەنانەت دیموکراسی و مێژوودا مامەڵە دەکات. تیۆری ئەدەبی لەسەر وەها چوارچێوەگەلێک دامەزراوە و بەوردی ڕەوتی خوێندنەوە ئەخاتە بەر لێکۆڵینەوە، هەڵبەت با ئەوەش بگوترێ کە ژمارەی تیۆرییە ئەدەبییەکان زۆرن و بۆیەشە هیچ کامەیان ناتوانن کۆی ئەو هۆکارە جیاجیایانە لەخۆ بگرێ و وەڵامی بۆ هەموویان هەبێت.

**تیۆری بابەتیانە** **objective theory**

(بڕوانە ڕەخنەی بابەتیانە)

**تیۆری جینسی** **gender theory**

لە کاربردە فێمینیستیە باوەکانی ئەم زاراوەیەدا جێندێر بەم شێوەیە پێناسە ئەکرێ: ئەو تایبەتمەندییە بەبنەڕەت کولتووری و کۆمەڵایەتیانەی کە بۆ سێکسە زیندەوەرناسانە جیاوازەکان بەکارئەبرێن و ئەخرێتە پاڵیان. ئەم زاراوەیە لە زمانناسیشدا بەکارئەهێنرێ بەڵام لە (جینسی زمانناسانە) جیاوازە و ئەمڕۆکە کاریگەریێتی فێمینیستی ئەم زاراوەیە لە بوارەکانی دیکەدا زیاترە و لێرەدا جێندێر کۆمەڵگا ئەگرێتەوە کەچی کولتوور و سێکس سەر بەزیندەوەرناسین. تیۆری جینس بۆ خۆی یەکێکە لە بڕوا بنەڕەتییەکانی فێمینیزم، لێرەدا جێندێر ئەو خەسڵەتانەیە کە بەپیاوبوون و بەژن بوون لە کۆمەڵگادا دیاری ئەکەن و تا ڕادەیەکی زۆر بەهۆی ئەو بنەما کولتووریانەوە هاتوونەتە ئاراوە کە بنەڕەتی

پیاوسالارانەی ئامادە لە شارستانێتی ئێمەدا بەرهەمی هێناوە. وەک سیمۆن دووبوڤوار ئەڵێ: «کەس وەکو ژن لەدایک نابێ بەڵکو ئەبێ بەژن... ئەمە شارستانێتییەکە وەکو گشتێک ئەو بوونەوەرە بەرهەم ئەهێنێ... کە وەکو مێ دەستنیشان و وەسف ئەکرێ». لەم ڕێگەیەوە لە کولتووری ڕۆژئاوادا پیاو و نێر بەردەوام وەکو ئەقڵانی و داهێنەر و چالاک و زاڵ پێناسە کراوە، لەلایەکی دیکەوە، ژن و مێ ڕێوڕاست بەپێچەوانەی وەها تایبەتمەندیگەلێک بەهەست و سۆز، ئاسایی و دانەهێنەر، دەستەوەستان و ژێر چەپۆکە پێناسە کراوە.

تیۆری جینس کە بۆ خۆی جۆرێکە لە ڕەخنەی فێمینیستی بۆتە هۆی پێداچوونەوەیەکی تەواو لەو دەورانەی جینس لە کۆمەڵگادا ئەیگێڕێ. بەواتایەکی دیکە، جینس پێوەندی بەوەوە نییە کە مێ (و نێر) لە ڕاستیدا چین، بەڵکو لەو ئاستە ئەکۆڵێتەوە کە نێر و مێ چۆن لە باری کولتوورییەوە ڕێک ئەخرێن و دادەنرێن. لێرەدا باسکردن لەسەر ئافرەت و جەستەی ئافرەت ئیتر باسێکی زیندەوەرناسانە نییە بەڵکو لە خۆیدا ڕێگەیەکە بۆ تێگەیشتن لەو تایبەتمەندیانەی کە کولتوور بۆ ئافرەت و جەستەی ئافرەت دەستەبەری ئەکات و بەگشتی ئەو شێوەیەی کولتوور لەگەڵ جینسدا هەڵسوکەوت ئەکات. لێرەدا مێینەیی و نێرینەیی دوو پێکهاتە و دامەزراوەی کولتوورین و هەر کام بەتایبەتمەندیگەلێکی دیاریکراوەوە.

فێمینیزم هەر لە سەرەتاوە پێی لەسەر چەمکی جینس داگرتووە، چونکە پێداچوونەوەیەکی گشتی و پوختەی ڕۆڵەکانی جینس بەباشترین و کاریگەرترین ڕێگەی گۆڕینی پێوەندییەکانی دەسەڵاتی نێوان ژنان و پیاوان دادەنەرێ. هەوڵدان بۆ داماڵینی کولتوور لەو کلێشانەی جینس بەدیهێناون بی گومان کار و پرۆژەیەکی زۆر گرنگ و چارەنووسساز و قەیراناوییە و فێمینیستەکانیش بۆ خۆیان ئاگاداری ئەم بابەتەن، بەتایبەت ئەگەر ئەو تایبەتمەندییە بەرچاوانەی جینسی نێر و می بێنینەوە یاد کە بەتەواوەتی لە کۆمەڵگادا جێگیربوونە. فێمینیزم دەیەوێ و ڕەهەندێکی سیاسی ببەخشێتە چەمکی جینس و بەپێشاندانی چیەتی و سروشتی بنیاتنراویەوە دەیەوێ بیکاتە دەستووری سەرەکی کاری خۆی لە کۆتایی سەدەی بیستەم و سەرەتای سەدەی بیست و یەکەمدا. لە پاڵ ئەمەشدا ئەگەرچی لە سەرەتاوە تیشکی ئەخستە سەر نواندنەوەی جینسی ژیان لە کولتووری ڕۆژئاواییدا، بەڵام بەشێوەیەکی زۆر کاریگەر خۆی بەربڵاو کردوەتەوە و، ئەو وەسف و پێناسە و نموونە بەڕواڵەت بارگاویانە پیشان ئەدات کە لە کۆمەڵگای



جیاجیادا بەرهەم هاتوون. نێر بەردەوام وەکو خاوەنی خەسڵەتی ئیجابی و باش دانراوە و مێ وەکو بەرهەمهێنی تایبەتمەندی خراپ لە قەڵەم دراوە؛ فێمینیستەکان لە ڕێگەی ڕەچاوکردنی دوانە لێکدژەکان لە بیری بنەماخوازانەدا و هەڵوەشاندنەوەی ئەم جووتە لە بیری پاش بنەماخوازانەدا ئەیانەوێ ئەم ڕوانگە زاڵەی کۆمەڵگای ئێستا بۆ چەمکی جێندێر هەڵبوەشێننەوە.

**تیۆری دەربڕینانە** **expressive theory**

(بڕوانە ڕەخنەی دەربڕینانە)

**تیۆری ڕەخنەگرانە** **critical theory**

(بڕوانە قوتابخانەی فرانکفۆرت)

**تیۆری زانیاری، تیۆری مەعریفی** **theory of knowledge**

**تیۆریست؛ بیردارێژ** **theorist**

**تیۆری کاربردی؛ تیۆری شوێندانەر** **pragmatic theory**

(بڕوانە ڕەخنەی کاربردی)

**تیۆری لاساییکارانە** **mimetic theory**

(بڕوانە ڕەخنەی لاساییکارانە)

**تیۆری وەرگرتن** **reception theory**

تیۆری وەرگرتن بەکارهێنانێکی مێژوویی شێوەیە کە لە تیۆری هەڵوێستی خوێنەر کە لەلایەن هانس ڕۆبیرت یاس[1]-ەوە و لە وتاری (مێژووی ئەدەبی وەکو بەرپەرچێک بۆ تیۆری ئەدەبی) پێشنیار کرا. وەکو بەشەکانی دیکەی ڕەخنەی هەڵوێستی خوێنەر ئەم تیۆرە سەرنج لەسەر وەرگرتنی خوێنەر ڕائەگرێ. بەڵام خوازیاری سەرەکی ئەم تیۆرە لەسەر هەڵوێستی تاقە خوێنەرێک نییە لە کاتێکی دیاریکراودا و، پتر پەنجە ئەخاتە سەر هەڵوێستە جیاوازەکان و بابەتە تەئویلی و هەڵسەنگێنەرەکانی جەماوەری گشتی خوێنەر لە ڕەوتێکی کاتیدا. یاس ئەو خاڵەش دەردەبڕێ کە ئەگەرچی دەق هیچ چەشنە (مانایەکی بابەتیانە)ی نییە، بەڵام کۆیەکی جۆراوجۆر لەو تایبەتمەندییانەی بەشێوەیەکی بابەتیانە وەسف ئەکرێن ئەگرێتەوە. هەڵوێستی خوێنەرێکی تایبەت کە بۆ ئەو خوێنەرە مانا و

1- Hans Robert Jass.

چۆنایەتیە جوانیناسانەکانی پێک ئەهێنێ وەکو بەرهەمی پاڵەکی (ئاسۆی چاوەڕوانی) خودی خوێنەر دائەنرێ و هەروەهاش بەئاکامی ئەو پەسندکردن و ڕەتکردن یان سەرلەنوێ فۆرمۆڵەکردنەوەی ئەم چاوەڕوانیانەش دێتە ئەژمار کاتێ لەلایەن تایبەتمەندییەکانی خودی دەقەکەوە بەرپەرچیان ئەدریتەوە. لەبەرئەوەش کە چاوەڕوانیە جوانینانا سانە و زماننا سانەکانی خوێنەر لە درێژایی زەماندا ئەگۆڕدرێن و، دیسانەوە لەبەرئەوەش کە ڕەخنەگر و خوێنەرانی دوایی ئەتوانن ڕێگە بەرنە ناو نەک هەر دەقەکەوە بەڵکو ئەو هەڵوێستە بڵاوکراوانەی خوێنەرەکانیشەوە، کەواتە جۆرێک (نەریت)ی مێژوویی تەکامولی تەئویل و هەڵسەنگاندنە ڕەخنەگرانەکانی بەرهەمێکی ئەدەبی دیاریکراو پەرەئەسێنێ. یاس کە درێژەپێدەری ئەو ڕوانگانەیە کە پێشتر لەلایەن هانس گێئۆرگ گادامێر[1]ەوە پێشنیار کرابوون، ئەم نەریتە وەکو (وتوویژ) یان (دیالکتیک)ێکی بەردەوام لە نێوان دەقێک و ئاسۆکانی خوێنەرە یەک لەدوای یەکەکان دادەنێ. لەم ڕوانگەیەوە دەقێکی ئەدەبی خۆی لە خۆیدا خاوەنی هیچ چەشنە بەها یان ماناگەلێکی کۆتایی و دیاریکراو و نەگۆڕ نییە.

ئەم ئوسلووبەی لێکۆڵینەوە لە وەرگرتنی ئەدەبی وەکو وتوویژ یان (تێکەڵبوون)ی ئاسۆکان لایەنێکی دوو فاقەی هەیە. واتە، ئەم ئوسلووبە وەکو وەرگرتن – جوانیناسی کۆی مانا و چۆنایەتیە جوانیناسانەکانی هەموو دەقێکی تاک وەکو کۆمەڵێک (پوتانسێل)ی جوانیناسانە و مانایی پێناسە دەکات کە هەر تەنیا کاتێک دەرئەکەون کە لەلایەن هەڵوێستە ڕوو لە زیادەکانی خوێنەرانەوە و لە ڕەوتێکی زەمانیدا بناسرێتەوە. لەلایەکی دیکەوە، ئەم ئوسلووبەی لێکۆڵینەوە وەکو وەرگرتن – مێژوو هەروەهاش مێژووی ئەدەب لە ڕێگەی کردنی بەمێژوویەک کە بەردەوام پێویستی بە(وتنەوە پێویستەکان) هەیە ئەگۆڕێ – ئەو مێژووەی بەشێوەیەکی نەرێتی وەکو گوزارشتی بەرهەمهێنانە یەک لەدوای یەکەکانی کۆیەکی جۆراوجۆری بەرهەمەکان بەبەها و مانای نەگۆڕ و دیاریکراوەوە لە قەڵەم دراوە. ئەمەش هۆکەی ئەوەیە کە ئەم مێژووە ئەو ڕێگا بگۆڕ و ڕوو لە زیادە ئەگرێتەوە کە دەقە هەڵبژاردەکان تەئویل ئەکات و هەڵیان ئەسەنگێنێ، هەر بەهەمان شێوە کە ئاسۆکانی بەرە یەک لەدوای یەکەکانی خوێنەران بەتێپەڕبوونی کات ئەگۆڕدرێن.

---

1- Hns Georg Gadamer.



**تیۆری هەڵوێستی خوێنەر** — **reader - response theory**

(بڕوانە ڕەخنەی هەڵوێستی خوێنەر)

**تیۆلۆژی؛ ئاییناسی؛ خوداناسی** — **theology**

## جێ

**جڤات؛ کۆمەڵ** — **community**

**جوانکاری؛ ڕازاندنەوە (١)** — **embellishment**

**جوانیناسی** — **Aesthetics**

لە ئەنسکلۆپیدیای بریتانیکادا، (جوانیناسی) بەواتای (لێکۆڵینەوەی تیۆریکی هونەر و جۆرەکانی هەڵسوکەوت و ئەزموونی پێوەندیدار بەهونەرەوە) پێناسە کراوە. بنج و ڕەگەزی ئەم وشەیە ئەگەڕێتەوە بۆ وشەی یۆنانی (Aesthetics) بەمانای (تێگەیشتن و هەست پێکردن). بۆ دیاریکردنی مێژووی سەرهەڵدانی چەمک یان دیاردەی (جوانی) پێویستە بگوترێ مێژوویەکی دیاریکراو لە بەردەستدا نییە، چونکە لە سەرەتای داهێنانی هونەرەوە مێشک و هەستی مرۆڤ بەرەولای جوانی هەنگاوی ناوە. سەرەتای باسە تیۆریکەکان لەسەر هونەر ئەگەڕێتەوە بۆ ئەفلاتوون و چەند فەیلەسووفێکی دیکەی سەردەمی کۆنی یۆنان وەک ئەرەستوو و هۆراس و لانجاینووس.

وشەی جوانیناسی بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٧٥٠ی زایینیدا وەکو وتەزایەکی فەلسەفی لە کتێبێکی بەم ناوەوە لەسەر دەستی ئەلسکاندر بوم گارتن بەکارهێنرا: لەم کتێبەدا، بوم گارتن هەوڵی داوە پێوەندیی نێوان هەڵسەنگاندنی جوانی لەلایەکەوە و تیۆری هونەر لەلایەکی دیکەوە دەستنیشان بکات. مەبەستی بوم گارتن لەم کتێبەدا ئەوەیە کە ڕاڤەیەک لە هونەر بکات کە تیایدا هونەر وەک جۆرێک لە داهێنانی مرۆیی نوێندراوە کە مەبەست و دوائاکامی هەمان ئاراستەکردنی جوانیە. بەڵام گۆڕانکاریی هەرە مەزن لەم بوارەدا ئیمانوویل کانت، فەیلەسووفی ئەڵمانی سەردەمی ڕۆشنگەری، وەدی هێنا. لە کتێبی ڕەخنەی ئەقڵی پەتی دا بەمیتۆدی میتافیزیکی شیکاری و وردبوونەوەی فەلسەفی ویستوویەتی بابەتی جوانیناسانە لێک بداتەوە. کانت (جوانی) وەکو پردێک لە نێوان دوو جیهانی دەرهەست و بەرهەست دادەنێ و تام و چێژی وەدیهاتوو لە بەرهەمێکی هونەری، لە هەستەکانی تری مرۆڤ جیادەکاتەوە و ناویان دەنێتە (تام و چێژە بێ لایەنەکان).



لەم ڕوانگەیەوە، جوانی وەک دیاردەیەکی سەراسەر پێوەندیدار بەهەستەوە ڕەچاو دەکرێ کە خاوەن بایەخێکی ڕۆحی و دەروونییە. لە سەدەی نۆزدەهەمدا، هێگڵ (جوانی)ی بەوێنەی (ڕەنگدانەوەی هەستئامێزی هزر) لە قەڵەم دەدا و گرنگی زۆری دەدایە باسە تیۆریکەکانی کانت.

لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم بەم لاوە، جوانیناسی بەشێوەیەکی بەربڵاو هاتە ناو جیهانی ئەدەبەوە. تیۆفیل گوتیە لە پێشەکیی دوو کتێبی خۆیدا بەناوگەلی ئالبیرتووس و مادموازێل دوموپن دروشمی (هونەر بۆ هونەر)ی ڕاگەیاند. هەر لەم سەردەمەدا بوودلێر و فلۆبێریش پەنجەیان خستە سەر هەوڵ بۆ (ڕزگارکردنی هونەر). لە ئەمریکاشدا، ئیدگار ئالێن پۆ لە وتارێکدا بەناونیشانی (بنەواشەی شاعیرێتی) داکۆکی لە ڕوانگەی هونەر بۆ هونەر دەکات. پۆ لەسەر ئەو بڕوایەیە کە لە شیعردا نابێ و ناکرێ باسی پەروەردە و ڕاهێنان بکرێ. پۆ پێی وابوو کە کۆکردنەوەی شیعر و هەقیقەت لە یەک شوێندا سەرناگرێ. لە ئینگلیزیدا، واڵتێر پەیتر یەکەم کەس بوو کە بەکاریگەرێتی وەرگرتن لە جان راسکین و هەندێ هونەرمەندی نیگارکێشی سەر بەقوتابخانەی بەر لە رافائیلییەکان باسی جوانیناسیی بەشێوەیەکی بەربڵاو هێنایە ئاراوە و کتێبی لێکۆڵینەوەیەک لەسەر مێژووی رۆنێسانس باشترین بەڵگەیە بۆ ئەم قسەیە. ئەوەش بڵێین کە بابەتی (ڕێژەیی بوونی ئەدەبی) یەکەم جار لەم کتێبەدا باسی لێ کرا. پەیتر کە لەژێر کاریگەرێتی بوودلێر و فلوبێردا بوو، گەڕان بۆ دۆزینەوە و دەستنیشانکردنی هەقیقەتی بەتراویلکەیەکی سەیر دادەنا و لەسەر ڕزگاریی هونەر لە ئەلقەکانی زنجیرەی کۆمەڵگا پێداگریی دەکرد. ئۆسکار وایڵد، شانۆنامەنووسی ئینگلیزی، بەبەرچاوترین لایەنگری پیتر ئەژمێردرێ و ڕۆمانی وێنەی درۆیەن گرەی وەکو مانیفێستی ئەو گرووپە دادەنرێ. لە ڕۆژهەڵاتیشدا، فارابی و ئیبنی سینا و خواجە نەسیری تووسی و ئیبنی ڕوشد و ئیخوانی سەفا بەو فەیلەسووفانە ئەژمێردرێن کە لەسەر جوانیناسی، هەر کام لە ڕوانگەی خۆیانەوە چەند باسێکیان وروووژاندووە.

**جوانیناسی بەرزایی** — **transcendental Aesthetics**

(بڕوانە بەرزایی)

**جووت سەروای حەماسی** — **rhymed heroic verse**

جووت سەروای حەماسی قالبێکی ئەدەبیە کە لە دوو دێڕ پێکدێ و هەر دێڕەش پێنج بڕگەی ئایامبیک-ی لەخۆ گرتووە و پێکیشەوە هاوسەروان. جووت سەروای حەماسی

یەکەیەکی مانایی لەخۆ ئەگرێ و هەر بۆیەش لە ڕووی خاڵبەندییەوە کۆتایی دێڕی دووەم بەخاڵ یان خاڵ – ویرگول کۆتایی پێ دێ. ئەم قاڵبە ئەدەبییە لە ئەدەبی کلاسیستی فەرەنسیدا (سەدەی حەڤدەهەم) و ئەدەبی نیئۆ کلاسیستی ئینگلیزیدا (کۆتایی سەدەی حەڤدە و سەدەی هەژدەهەم) بەکار ئەهێنرا و پڕاوپڕ لەگەڵ یاسا و ڕێسا ڕەخنەیی و تیۆریکەکانی ئەو قۆناغانەدا یەکی دەگرتەوە. لە ئەدەبی فەرەنسیدا بوالۆ ئەو ڕەخنەگرە بوو کە لە بەرهەمە هەرە کاریگەرەکەیدا بەناوی هونەری شیعر ئەم قاڵبە ئەدەبییەی بەکارهێنا و، لە ئەدەبی ئینگلیزیشدا سەرەتا شاعیری گەورەی کۆتایی سەدەی حەڤدەهەم، واتە جان درایدن[1]، و پاشان شاعیر و ڕەخنەگری سەرەتای سەدەی هەژدەهەم، واتە ئەلکزاندرپوپ[2]، لە بەرهەمەکانیاندا ئەم قاڵبە ئەدەبییەیان بەکار ئەهێنا و بەگشتی جووت سەروای حەماسی قاڵبی ئەدەبیی ڕۆژئاوای ئەوروپا لەم قۆناغەدایە کە تیایدا کۆی ئەو بنەواشە و ڕێسا ڕەخنەییانەی قوتابخانەی ئەدەبی نیئۆکلاسیزم وەبەرچاو ئەکەوێ. لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەم بەم لاوە بەهۆی کاریگەرێتی قوتابخانەی ڕۆمانتیسیزم ئەم قاڵبە ئەدەبییە کتوپڕ لەناو چوو، هەرچەند پێشتر لەلایەن هەندێ ئەندامی قوتابخانەی شیعریی گۆڕستان-ەوە لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەهەمدا و هەروەهاش لەلایەن چەند شاعیرێکی پێش ڕۆمانتیکەوە ئەم قاڵبە ئەدەبیە بەکارنەئەهات.

**جووت سەروای دە بڕگەیی** — **doublet**

**جووتە لێکدژەکان** — **conuter points**

**جووڵەیی** — **kinetic**

**جووڵەی بازنەیی؛ سووڕانەوە** — **cyclical movement**

**جەزمە؛ خەلسە** — **ecstasy**

**جەغز ⟵ بازنە**
**جەغزی ⟵ بازنەیی**
**جەوهەر ⟵ بنیات**

**جیا؛ جیاواز** — **disparate**

**جیاکاری** — **asyndeton**

---

1- John Dryden (1631-1700).

2- Alexander pope (1688-1744).



## جیاوازی — difference

ئەم زاراوەیە یەکەم جار بەشێوەیەکی پسپۆڕانە لە کتێبە کاریگەرەکەی فێردینان دو سووسووردا بەناوی چەند وانەیک لەسەر زمانناسیی گشتی بەکارهێنرا. بۆچوونی بنەڕەتیی سووسوور بریتییە لەم ڕوانگەیە کە زمان وەکو سیستەمی جیاوازیەکان کار ئەکات. واتە بەو شێوەیەی ئاماژەی پێ دەکات (لە حکوومەتی زماندا هەموو شتێک لەسەر پێوەندی دامەزراوە). بۆ وێنە ئەگەر بمانەوێ یەکێک لە نموونەکانی سووسوور بهێنینەوە ئەبی ئاماژە بۆ وشەی فەرەنسی mouton و وشەی ئینگلیزی sheep بکەین کە هەردووکیان یەک مانا و دەلالەتیان هەیە، بەڵام بەهاکانیان لێک جیاوازن، چونکە واژە فەرەنسیەکە هاوکات هاوواتای دوو واژەی (sheep و moutton)ی ئینگلیزییە. کەواتە بەهاوبایەخی sheep تا ڕادەیەک بەندە بەوەی کە mutton نییە، یان ئەوەی کە واژەی sheep لە واژەی mutton (جیاوازە).

لەلایەکی دیکەشەوە، هەر ئەم جیاوازییە لە دەنگناسیدا دەبینرێت و لە نێوان دەنگی پیتەکاندا جیاوازی هەیە. سوسوور پەرەی بەم ڕوانگەیە داوە کە زمان لە هەردوو ئاستی دال و مەدلوولدا لە تۆڕێکی پڕ جیاوازی پێکهاتووە. ئەمەش جگە لەوەی کە تەنانەت زمان لە ئاستی ڕێزمان و گرامێریشەوە دیسانەوە لە جیاوازی پێکهاتووە کە بەڵگەش لێرەدا گرنگایەتی هەردوو تەوەرەی جێنشینی و هاونشینیە، کە دوو تەوەرەی سەرەکیی جیاوازی لە بەرهەمهێنانی مانادا پێک ئەهێنن. لە دەنگناسیشدا بۆ نموونە هەردوو پیتی (ب) و (پ) شوێنی دەربڕینیان لە زاردا یەکێکە (لە نێوان هەردوو لێودا)، هەردووکیشیان بەپیتگەلی تەقینەوەیی ناسراون (واتە کە دەردەبڕدرێن با لە پڕێکدا لە دەمەوە دەرباز ئەبێت). بەڵام جیاوازیی نێوان ئەم دوو پیتە لەوەدایە کە (ب) لە باری پێناسەوە گڕە کەچی (پ) کپە. هەر ئەم جیاوازییەش بۆتە هۆی جیاوازیی نێوان ئەو وشانەی تیایاندا (ب) و (پ) بەکارهێنراوە (وەک "بار" و "پار" یان دوو وشەی "بیر" و "پیر"). هەر ئەم ڕوانگەیەی سوسوور بۆ زمان بۆتە هۆی پەرەسەندنی چەند بزاڤێکی تیۆریکی گرنگ وەک بنەماخوازی و ئەم بیرۆکەیە کە لە ڕاستیدا ئەمە جیاوازییەک نەک ئەمئەوێتی یان ئامادەبوون کە لە ناو سیستەمی زماندا جێگیرە. کاریگەرێتی ئەم ڕوانگانەی سووسوور زیاتر لە دوو بزاڤی تیۆریکی توێژینەوە کولتوورییەکانی کۆمەڵناسیی بنەماخواز و ڕوانگەکانی دێریدا هەر بۆ ئەم زاراوەیە دەبینرێ.

## جیاوازی differance

دێریدا ئەم زاراوەیەی لە سووسوورەوە وەرگرتووە و گۆڕیویەتی کە شێوەی دەربڕینی هەردوو زاراوەکە یەکێکە، بەڵام جۆری نووسینیان لە یەکدی ناچێ. ("difference" و "differance"). هەڵبەت ئەمە بەو مانایە نییە کە ڕوانگەکانی دێریدا بۆ زمان ڕێوڕاست وەک ئەوانەی سووسوورە. دێریدا لەم زاراوەیە بۆ دەستنیشانکردنی دابڕان و دووریی نێوان هەرچەشنە دەلالەتێک لە نێوان مانا و بابەتدا کەلک وەردەگرێ. دێریدا ئەو خاڵەشی خستۆتە ڕوو کە لە ناخی هەموو شتێکی بەرواڵەت سەربەخۆ و ئامادەدا ئەم جیاوازییە لە ئارادایە و نەک هەر لە زماندا بەڵکو لە هۆشیاریی مرۆڤیشدا ئامادەیە. ئەو جیاوازییەش کە دێریدا بەردەوام جەختی لەسەر ئەکاتەوە بریتییە لە جیاوازیی نێوان (ئامادەبوون) و (بزربوون). پێش دێریداش هایدگر ئەو خاڵەی دەستنیشان کردبوو کە جیاوازیی نێوان (ئاشکرایی) و (پۆشتەیی) لە ڕاستیدا دیار نییە، هەرچەند لە گۆڕێدایە. بەواتایەکی دیکە لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە لە دەلالەتدا چیەتی هەر شتێک بەندە بەوەی کە ئەو شتە ئەو نییە، یان مانا لانی کەم تا ڕادەیەک لە ڕێگەی جیاوازیەکەیەوە لەگەڵ ئەوەی کە ئەو مانایە نادات و بەرهەم دێت. جیاوازییەکی دیکە لە نێوان (difference)ی سوسوور و (differance)ی دێریدا ئەوەیە کە لە زاراوەکەی سووسووردا تەنها کرداری جیاوازبوون بەرجەستە ئەبێتەوە کەچی لە زاراوەکەی دێریدادا دوو کرداری جیاوازبوون (differ) و بەدواخستنەوە (deffer) لا مەبەستە. ئەمەش واتە دەرخستنی ئەو لایەنەی فەلسەفەی دێریدا کە تیایدا مانا بەردەوام بەدوا ئەخرێت و کەواتە هیچ دەقێک یەک مانای نەگۆڕی نییە و سەرجەم دەقەکان هەڵگری مانای بگۆڕن. ئەم ڕوانگانە دواتر لە پاش بنەماخوازی و تیۆری فێمینیستیدا کەلکی لێ بینرا و لە باسە دژە مارکسیستیەکانیشدا بەکارهێنرا.

## جێگۆڕکێ displacement

ئەم زاراوەیە لە ڕەخنەی دەروونناسانەی فرۆیدی و کۆمەڵی باسی ئەدەبیدا کە جەخت لەسەر سەربەخۆیی زمانی مرۆڤ ئەکەنەوە بەکار ئەبرێت. لە ڕەخنەی فرۆیدیدا جێگۆڕکێ ئەو زاراوەیەیە کە لەگەڵ زاراوەی تێکگوشیندا بەکارئەبرێ. بەپێی ڕوانگەکانی فرۆید جێگۆڕکێی خەون و پەستاوتەیی خەون دوو هۆکاری سەرەکی و بەڕێوەبەرن کە بەپێی چالاکییەکانیان ئەکرێ ئەو شێوانە دەستنیشان بکەین کە لە ڕێگەی خەونەوە بیریان لێ ئەکرێتەوە. فرۆید جێگۆڕکێ وەکو ئامرازێک دادەنێ کە لەو ڕێگەیەوە سانسۆر بەرجەستە ئەکرێتەوە و لە خەوندا پێشان ئەدرێن. بۆ نموونە، ئەگەر کەسێک نەتوانێ لە هۆشیاریدا



ڕق و کینەی خۆی لە کەسێکی تر بەهۆی کارکردی سانسۆرەوە پێشان بدات، هەر ئەم ڕق و بێزاریە لە خەونیدا بۆ شتێکی دیکە سەبارەت بەو کەسە دەگۆڕدرێ. واتە لێرەدا جێگۆڕکەیەک ڕوودەدات لە نێوان ئەو بابەتەی سانسۆر کۆنترۆڵی دەکات و ئەو بابەتەی سانسۆر ناتوانێ کاری تێ بکات (واتە لە خەوندا). ڕەخنەگرانی ئەدەبی لە دوو زاراوەی جێگۆڕکێ و تێکگووشین بەمەبەستی تێگەیشتن لە شێوەی کارکردی هێماخوازی لە بەرهەمە ئەدەبییەکاندا کەلک وەرئەگرن. لەلایەکی دیکەشەوە، زمانناسان زاراوەی جێگۆڕکێ بەشێوەیەکی جیاواز بەکارئەبەن و لێرەوە یەکێ لە خەسڵەتە سەرەکییەکانی زمانی مرۆیی کە هەمان جێگۆڕکێیە دەستنیشان ئەکەن.

(بڕوانە تەوەرەی هاونشینی، تەوەرەی جێنیشنی خوازە، مەجاز)

## جیناس pun

جیناس ئەو هونەرە شیعرییەیە کە پێناسەکەی لە ئەدەبە جیاجیاکاندا ئەگۆڕدرێ. بۆ نموونە، لە ئەدەبی فارسی و کوردیدا جیناس لە نێوان دوو یان چەندین وشەی زیاتردا پێکدێ و بۆ خۆی بەسەر چەندین بەشی جیاجیادا دابەش دەکرێ، کەچی لە ئەدەبی ئینگلیزیدا جیناس بریتییە لە جۆری کایەکردن بەوشە کە لەدەربڕیندا وەک یەکن یان زۆر لە یەکدی نزیکن، بەڵام ماناکانیان جیاوازە. ئەم هونەرە لە کۆنەوە بەکارهێنراوە و بۆ نموونە لە کتێبی ئینجیلی پیرۆزدا و بەتایبەت لە بەرهەمەکانی شکسپیردا بۆ مەبەستگەلی جیاوازی کۆمیک و تراژیک بەکارهێنراوە. لە ئەدەبی مۆدێرندا باشترین نموونە بۆ بەکارهێنانی جیناس و کایەکردن بەوشە ڕۆمانی هەستانەوەی فینیگان-ی جۆیس-ە کە تیایدا جیناس بەمەبەستی بەدیهێنانی کاریگەرێتییەکی ئاڵۆز و هاوکات جیددی و پێکەنیندار لە ئاستە جیاجیاکانی مانادا بەکارهێنراوە.

جیناس هەندێ جار بەمەبەستی نستەق بێژی و هەندێ جاریش بەمەبەستی ئاگادارکردنەوەی خوێنەر لە کۆمەڵێ هەقیقەتی جیددی یاخود تەوساوی بەکارئەبرێ. لە ئەدەبی ئینگلیزدا و پاش بەکارهێنانی ئەم هونەرە لەلایەن شاعیرە هەرە بەرزەکانی سەردەمی ئێلیزابێتەوە، جیناس لە سەدەی هەژدە و نۆزدەدا بەشێوەیەکی بەرچاو لە بەرهەمە ئەدەبییەکاندا بەکارنەدەهێنرا و بەڵام لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا و هەروەهاش پاش بڵاوبوونەوەی کتێبە بەناوودەنگەکەی ئێمپسون[1] ئەم هونەرە سەرلەنوێ دەرکەوت.

1- Willam Empson (1906-1948).

لە ئەدەبی کوردی و فارسیشدا جیناس بەم شێوەیە پێناسە کراوە کە بریتییە لە یەکسانی دوو وشە لە دەربڕیندا و جیاوازییان لە مانادا. دوو وشەی هاوچەشن لەوانەیە هیچ چەشنە جیاوازیەکیان جگە لە مانا پێکەوە نەبێ و هەندێ جار جگە لە مانا بەهۆی پیتێکی دەنگدار یا بێ دەنگەوە لێکدی جیا ئەکرێنەوە. بایەخی جیناس بەهۆی ئەو مۆسیقا و دەنگەوەیە کە لە گوتەدا بەرهەمی دەهێنێ و جوانیەکەشی بەهۆی پێوەندی لەگەڵ مانای گوتەدایە و لە شیعر و پەخشاندا بەکاردەهێنرێ.

**جیناسی بەراوەژوو؛ جیناسی پێچەوانە** **anagram**

وشەی ئاناگرام لە بنەڕەتدا یۆنانیە و لێرەدا بەجیناسی بەراوەژوو دادەنرێ کە بریتییە لە هەڵگێڕانەوەی پیتەکانی وشەیەک یان دەستەواژەیەک بەمەبەستی سازکردنی وشەیەکی نوێ. بۆ نموونە Erewhon ناونیشانی کتێبێکی ساموێیل باتلێر کە پێچەوانەی وشەی (nowhere) بەمانای هیچ شوێنێک.

**جیناسی تەواو (١)** **conexio**

**جیناسی تەواو (٢)** **contention**

**جیناسی تەواو (٣)** **diaphora**

**جیناسی تەواو (٤)** **ploce**

**جیناسی گشتی** **antistasis**

**جیناسی ناتەواو** **paranomasia**

**جیناسی وشەیی (١)** **adnominatic**

**جیناسی وشەیی (٢)** **antanaclasis**

**جیناسی وشەیی (٣)** **agnomination**

**جیناسی وشەیی (٤)** **homonymicpun**

**جێنشینی** **paradigmatic**

(بڕوانە بۆ تەوەری جێنشینی)

**جێگۆڕکێی خوازەیی** **metaphoric substitution**

**جیهانبینی** **world- view**

**جیهان؛ گەردوون (١)** **cosmos**



**جیهان؛ گەردوون (٢)** **universe**

**جیهانی ئەدەبیی سەربەخۆ** **self - containd literary universe**

**جیهانی بچووکی ئەدەبی** **literary microcosim**

**جیهانی ژیان؛ ژینجیهان** **lifeworld**

**جیهانی مەزن** **macrocosom**

# سەرچاوەکان


١- سەرچاوە ئینگلیزییەکان:

Abrams, M. H. A Glossary of Literary Terms. 3rd. ed (NewYork: Rinehart, 1971).

Abrams, M. H, et. al The Norton Anthology of English Literature. 6th ed. (NewYork: W. W. Norton & Company, 1993).

Barton, Edwin J. and Glenda A. Hudson. A Contemporary Guide to Literary Terms (NewYork: Houghton Mifflin Company, 1997).

Bortens, Hans. Literary Theory: The Basics (London: Routledye, 2003).

Bressler, Charles E. Literary Criticism: An Introduction to Theory and Practice (Princeton Hall, 1994).

Cuddon, J. A. A Dictionary of Literary Terms (London: Penguin Books Ltd., 1979).

Daiches, David. Critical Approaches to Literature. 2nd. ed. (London: Longman, 1981).

Drabble, Margaret and Jenny Stringer. The Oxford Companion ro English Literature (Oxford: Oxford University Press, 1993).

Fowler, Roger. A Dictionary of Modern Critical Terms (London: Routledge, 1973).

Green, Keith and Jill Lebihan. Critical Theory and Practice: A Coursebook (London: Routledge, 1997).

Guerin, wilfed et al. A Hand book of criticalapproaches to literature (newyork: Harper and Row 1979).

Hawthorn, Jeremy. Contemporary Literary Theory (London: Edward Arnold, 1992).

Howatson M. C. and Ian Chilvers. The Oxford Companion to Classical Literature. (Oxford, Oxford University Press, 1996).

Klages, Mary. Modern Critical Thought (Colorado: Colorado University Press, 1997).

Lodge, David. Modern Critical Thought (London: Longman, 1993).

Newton, K. M. Twentieth - Century Literary Theory (London: Macmillan





Press Ltd., 1997).

Peck, John and Martin Coyle. Literary Terms and Criticism. 2nd. ed. (London: Macmillan Prees Ltd., 1993).

Raj, Gagan. Lierary Terms (New Delhi: Anmol Publications, 1992).

Rice, Philip and Patricia Waugh. Modern Literary Theory. (London: Edward Arnold, 1989).

Shokhanvar, Jala. The Practice of Literary Terminology (Tehran: samt, 1996).

Tallack, Douglas. Critical Theory: A Reader (NewYork: Harvester Wheatsheat, 1995).

Webster, Roger. Studying Literary Theory (London: Edward Arnold, 1993).

Wolfreys, Jullian and William Baker. Literary Theories (London: Macmillan Press Ltd., 1996).

٢- سەرچاوە فارسییەکان:

احمدی، بابک. ساختار و تأویل متن. ٢ جلد (تهران: نشر مرکز، ١٣٧٢).

آشوری، داریوش. فرهنگ علوم انسانی (تهران: نشر مرکز، ١٣٧٤).

بابایی، پرویز: فرهنگ اصطلاحات فلسفه (تهران: انتشارات نگاه، ١٣٧٤).

براهنی، رضا. قصه نویسی (تهران: انتشارات اشرفی، ١٣٤٨).

پوینده، محمد جعفر (گزیده و ترجمه). درآمدی برجامعەشناسی ادبیات (تهران: انتشارات نقش جهان، ١٣٧٧).

پین، مایکل. بارت، فوکو، آلتوسر. ترجمهء پیام یزدانجو (تهران: نشر مرکز، ١٣٧٩).

پین، مایکل. لکان، دریدا، کریستو. ترجمهء پیام یزدانجو (تهران: نشر مرکز، ١٣٨٠).

پین، مایکل. فرهنگ اندیشه انتقادی. ترجمهء پیام یزدانجو (تهران: انتشارات مرکز، ١٣٨٢).

توسلی، غلام عباس، نظریەهای جامعەشناسی (تهران: سمت، ١٣٧٣).

حسینی، صالح. واژەنامه ادبی. چاپ دوم (تهران: انتشارات نیلوفر، ١٣٧٥).

حسینی، صالح. فرهنگ برابرهای ادبی (تهران: انتشارات نیلوفر، ١٣٨٠).

